# مێژووی ئەدەبی کوردی
# لە هەولێر و دەوروبەری

پرۆفیسۆر دکتۆر مارف خەزنەدار



**پەیڤێک..**

لەنێوان سالانی ٢٠٠١ و ٢٠٠٦ مامۆستای ئەدەبی کوردی، (پرۆفیسۆر دکتۆر مارف خەزنەدار)، کەوتە چاپکردنی ئەو پرۆژەیەی کە وەک مامۆستا خۆی لە بەرگی یەکەمدا دەنووسێ: (بیرکردنەوەم لە "مێژووی ئەدەبی کوردی" دەگەڕێتەوە سەردەمی منداڵی)، لەو ساوەو بەم تەمەنە درێژەو بەم هەموو گەشت و گەڕانەی وڵاتان، کەرەستەی ئەم پرۆژەیە بەردەوام لە مێشک و دڵ و جانتای مامۆستا جێگای خۆی کردۆتەوە، هەر بۆیە چەندین قۆناغی بەخۆیەوە دیوە. مامۆستا دەنووسێ: (ماوەی ١٩٦٨-١٩٨١ لە کۆلێجی ئەدەبیاتی زانستگای بەغدا، سەردەمی کۆکردنەوەی کەرەستە بوو بۆ ئەم کارە، نەک نووسینەوەی. بەڵام ماوەی ١٩٨٣-١٩٨٨ لە ئامۆژگای زمان و ئەدەبی عەرەبی لە زانستگای عەننابەی جەزائیر سەردەمی بیرکردنەوەو نووسینەوە بوو). دواجار بەرهەمی ئەم هەموو ئەرک و ماندوو بوونە لە (حەوت بەرگ) کە دەکاتە (٣٨١٦) لاپەڕەو لە ساڵی ٢٠٠٦ بەتەواوی لە دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس بە چاپکراوی کەوتە نێو کتێبخانەی کوردی و بەر دڵ و دیدەی خوێندەوارو پسپۆڕان و جێگای شیاوی خۆی گرتەوە.

ئەم کارە لەشێوەی خۆی و لەدەوڵەمەندیدا لەنێوەندی ئەدەبی کوردی بێ وێنەیە، جگە لەوەی زەمەنێکی زۆری (لەسەرەتاوە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم)ی گرتووتەوە، جوگرافیایەکی پان و بەرین گەڕاوەو هەموو زارو بن زارە کوردییەکانیشی بەسەر کردووەتەوە، جگە لەباسی شاعیرو نووسەرەکان، مامۆستا دکتۆر مارف خەزنەدار، بەباسی مێژووی کوردو جوگرافیاو ئایین و زمان و باری سیاسی و کۆمەڵایەتی کوردستان و سەرچاوەو دەستنووس و باسکردنی ڕۆژهەڵاتناسەکان زانیاری و ئاگادارییەکی زۆری خستووەتە بەردەست خوێندەوارو پسپۆڕان، بەتایبەت ئەوانەی بیانەوێ شتێک لەبارەی ئەدەبی کوردییەوە بزانن، خۆمانی و بیانی. لەدوو توێی لاپەڕەکانی ئەم (مێژووی ئەدەبی کوردی)یەدا، هەروەک ئەنجامێکی بەدەست هاتوو، شارەکانی کوردستان تیشکی تەواویان خراوەتە سەر، لەنێو شارەکانیشدا شاری (هەولێر) جگە لەوەی وەک هەر شارێکی تری کوردستان مێژوو و جوگرافیای بەرچاوی خۆی هەیە، ئەوا بەشانازییەوەش شاری ژیان و نیشتەجێ بوونی مامۆستا دکتۆر خەزنەدار خۆشیەتی، ئەوەش بووەتە هۆی ئەوەی جگە لەو شاعیرانەی مامۆستا لەنێو مێژوودا بەدوایاندا گەڕاوە، ئەوا بەختی ئەوەشی هەبووە، زۆربەی شاعیرانی سەرەتاو ناوەڕاستی سەدەی بیستەم، بەتایبەت ئەوانەی نیشتەجێی ناو شاری هەولێر بوون، مامۆستا لەنزیکەوە بیانناسێ و ئاگاداری ژیان و بەرهەمیان بێ، ئەمەش بۆ کەسێک وەکو مامۆستا خەریکی نووسینی مێژووی ئەدەب بێ، یەکجار پێویستە، هەر ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی، کە مامۆستا زۆر شتی گرنگی بەرهەم و ژیانی ئەو شاعیرانەی لابێ و بزانێ، کە خەڵکی تر لێی بێ ئاگابن.

ساڵی پار کە پرۆژەی (ئینسیکلۆپیدیای هەولێر) سەری هەڵداو برایانی (بەدرخان) بەتایبەت دکتۆر عەبدوڵلا عەلیاوەیی و کاک حەمید ئەبو بەکر (بەدرخان) رووبان لەمامۆستا دکتۆر مارف خەزنەدار نا بۆ هاوبەشی کردن بە (مێژووی ئەدەبی کوردی لە هەولێر و دەوروبەری) کارەکە ئامادەو چاپکراو بوو، هەر هێندەی دەویست کەمێک وای لێ بکرێ لەگەڵ ئەم پرۆژەی ئینسیکلۆپیدیایە بگونجێ، ئەویش تەنیا کورتکردنەوە بوو، کورتکردنەوەی ئەوەی لەبارەی هەولێرو دەوروبەری لەباسی شاعیران و نووسەران لەپرۆژەی (مێژووی ئەدەبی کوردی)دا هاتووە ئامادە بکرێ و بگوێزرێنەوە نێو ئینسکلۆپیدیاکە، لە کورتکردنەوە کراوەکەدا ئەوەی، زۆرتر نموونەی شیعرییەکان لابراون و کورت کراونەتەوەو رای مامۆستا لەبارەی شاعیرەکان وەک خۆی ماوەتەوە، ئەمەش بۆ ناسینی شاعیرەکەو شاعیرانی هەولێرو دەوروبەر بەپێویست و گرنگ زانرا. ئەوەی ئێستا لەبەردەستە هەر راو بۆچوونی جەنابی مامۆستا خۆیەتی. وەک لە تەواوی کارەکەیدا هاتووە.

**د. مەولود ئیبراهیم حەسەن**

## بەشی یەکەم
## رینیسانسی شیعری کوردی لە کۆیە

### شاری کۆیە

کۆیە شارێکە بەم ناوەوە ناسراوەو هەندێ جاریش بەشێوەی "کۆ" و بەرەسمی بە "کۆیسنجەق" ناو دەبرێ. لەدێرزەمانەوە مەڵبەندی ژیان و ئێستگەی بازرگانی و رێی کاروانان بووە، بەشداری لە جموجۆڵی کۆمەڵایەتی و ئابووری سەردەمی نەتەوە کۆنەکانی ئەرکیۆلۆجی کردووە. لەقۆناغی دوای بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام شاری کۆیە سەر بەمیرنشینەکانی باشووری کوردستان بووە.

لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم کۆیەو دەوروبەری مەیدانی جەنگ بووە لەنێوان میرنشینە کوردییەکانی ئەردەلان و بابان و سۆران. لەناوەراستی سەدەی نۆزدەم (١٨٤٣)دا کۆیە لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە داگیر کراوە، فەرمانرەوایی عوسمانی تا کۆتایی جەنگی یەکەمی گیتی خایاندووە (١٩١٨)، لەم ماوەیەدا کۆیە سەر بەویلایەتە جیاوازیەکانی عوسمانی عێراقی کۆن بووە، لەساڵی ١٨٧٩ ویلایەتی مووسڵی عوسمانی دوو سنجاقی هەبووە، کەرکووک و سلێمانی، لەو سەردەمەدا کۆیە قەزا بوودو سەر بەکەرکووک بووە.

مەڵبەندی خوێندەواری لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم لەکۆیە حوجرەی مزگەوت و قوتابخانەی تازەی دەوڵەتی عوسمانی بوو. لەساڵی ١٨٨٥ یەکەمین قوتابخانەی میری لەکۆیە کرایەوە، زمانی فێرکردنی تورکی بوو. هەرچەندە ئەم قوتابخانەیە دەوری گرنگی هەبوو لەپێگەیاندنی خەڵکی ئەو سەردەمە لەرووی خوێندەواری و رۆشنبیری گشتییەوە، بەڵام لەرووی شیعرو ئەدەبەوە کاری حوجرەی مزگەوت گرنگتر بوو بۆ پێگەیاندنی ئەو خوێندەوارانەی بایەخیان بەشیعرو ئەدەب دەدا. بێ گومان شاری کۆیە وەکو شارەکانی دیکەی هەموو کوردستان خەڵکی خوێندەوار لەحوجرەی مزگەوتدا پێ دەگەیەنرا. زۆربەی ئەو خوێندەوارانە مەلا بوون. لەکۆیە مەلای چاک و بەناوبانگ هەڵکەوتبوون. هەندێکیان سیفەتی مەلاو میرزایان هەبوو، جگە لەزمانی کوردی شارەزای زمانەکانی عەرەبی و فارسی و تورکی عوسمانی بوون.

دەسەڵاتی عوسمانی لەکۆیە تا دوا رۆژانی جەنگی یەکەمی گیتی خایاند، لەدوا مانگی ساڵی ١٩١٨ فەرمانرەوای سیاسی ئینگلیز دەبلیو. ئار. های وەک داگیرکەرێک هاتە ناو شاری کۆیە.

### شاعیرانی کۆیە

رینیسانسی شیعری کوردی لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم لە سلێمانی لەسەر دەستی نالی لەدایک بوو. لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم لەناوچەکانی دیکەی باشووری کوردستان بڵاو بووەوە. لێرەدا بەراستی دەتوانرێ شاری کۆیە بکرێ بەنوێنەری ئەم بزووتنەوەیە لەناوچەی سۆران ئەگەر بە درێژایی، مێژوو هەولێر و رواندز و هەریر و نێوەندو پایتەختی ناوچەی سۆران بووبن لەرووی سیاسی و بەرێوەبردنەوە، کۆیە نێوەندو پایتەختی بزووتنەوەی ئەدەبی کوردی بووە. لەماوەی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم، کۆیە کۆمەڵێک شاعیری گەورەی پێ گەیاند. ئەمانە دەورێکی باڵایان

هەبوو لە پێشخستن و دەوڵەمەندکردنی ئەدەبی کوردی. سەردەستەی شاعیرانی کۆیە حاجی قادری کۆیی بوو.

**کەیفی**

**١٨٨٣-١٨١٤**



**ژیانی شاعیر**

کەیفی ناوی فەتحوڵلایە، بەکەیفی جوانڕۆیی ناوبانگی دەرکردووە. زانیاری لەبابەت ژیانییەوە زۆر کەمە. لەبارەی جێگەی لەدایکبوون و ژیانی بەرایی شاعیرەوە حاجی قادری کۆیی دەڵێ:

**لەکوێرە دێین کە کەیفی تیا بی فیردەوسە**
**جەهەننەمە کە ئەما (کەیفی) شاری قوستەنتین**

ناوی "کوێرەدێ" لێرەدا دوو مانا هەڵدەگرێ، یەکەمیان ئەو گوندەی کەیفی تێیدا لەدایک بووەو ژیاوە ناوی "کوێرەدێ" بووە، دووەمیان گوندێکی بچووک و کاول و بێ بایەخ.

کەیفی لەساڵی ١٨١٤ لەو گوندەی ناوچەی جوانڕۆ لەدایک بووە. لەبەر هەر هۆیێک بێ یا وەک فەقێیێک مەڵبەندی خێزانی خۆی و باب و باپیرانی بەجێ هێشتووەو لەکۆیە نیشتەجێ بووە، ئەو کاتە لەتەمەنی مێردمنداڵیدا بووە.

بەپێی ئەو زانیارییانەی حاجی قادری کۆیی دەریدەبڕێ دەبێ کەیفی لە شارەزوور لەدایک بووبێ، لەبەر ئەوە بەشارەزووریش ناوبانگی دەرکردووە، لەوانەیە راستییەکە ئەوە بێ کەیفی خەڵکی جوانڕۆ بێ، قۆناغی یەکەمی کۆچکردنەکەی شارەزوور بووە، لەوێوە لەدەوروبەری ساڵی ١٨٦٣ رووی کردۆتە کۆیە. وەکو هەموو فەقێیێکی بێگانە بووە بەمیوانی مزگەوت بەمەبەستی زیندەگانی و تەواوکردنی خوێندنی حوجرە.

کەیفی لەلای مەلا عەبدوڵلای جەلی خوێندوویەتی. لەو دەمەدا کۆمەڵێک لە مەلاو فەقێیانی مزگەوت دەمیان لەشیعر دەدا. شیعر شیعرێن و شەڕە شیعریان دەکرد. وا ڕێک دەکەوێ شێخ ڕەزا ماوەییێک لەکۆیە دەژی بەمەبەستی خوێندن و میوانی شێخ غەفوری مامی دەبێ. لەسەر شیعر وتن ناخۆشی دەکەوێتە نێوان کەیفی و شێخ ڕەزاو ئەو کەسانەی دەم لەشیعر دەدەن. ئەنجامی ئەم مەسەلەیە دەگاتە ئەوەی کەیفی ریسوا ببێ و هیچی بۆ نەمێنێتەوە تەنیا ئەوە نەبێ لەساڵی ١٨٦٩ کۆیە بەجێ بێڵێ هەتا هەتایە، بەرێگای هەولێرو موسڵ و حەلەب ڕوو بکاتە ئەستەمووڵ. لەوێ لەگەڵ حاجی قادر جارێکی تر دەست لەملی یەکتری دەکەنەوە. دەڵێن کەیفی لەئەستەمووڵ پێوەندی لەگەڵ باڵیۆزخانەی فەرەنسا بووەو شارەزایی لەزمانی فەرەنسی پەیدا کردووە.

وا دەگێڕنەوە کەیفی تەنیا هۆنەرەوەی شیعر نەبووە، بەڵکو دەسڕەنگین و وەستای کۆڵین (زەنگۆگراف و لیتۆگراف) و دارتاشین و مۆزاییک و گرافیک و خەت خۆشیش بووە.

کەیفی لەساڵی ١٨٨٣ لەئەستەمووڵ کۆچی دوایی کردووە. تائێستا گۆڕی پیرۆزی نەدۆزراوەتەوە.

**ناخۆشی نێوان کەیفی و شێخ ڕەزا**

کۆمەڵێک شاعیر لەدەوری مزگەوتی گەورەی کۆیە کۆببوبوونەوە، ئەم مزگەوتە نێوەندێکی گرنگی خوێندەواری و رۆشنبیری بوو لەو ڕۆژگارەدا. گۆشەیێکی شیعری لەو کاتەدا لەناوەوە بوو، فەقێیانی مزگەوت لەشێخ ڕەزا بەولاوە هیچ یەکێکیان لەپلەی کەیفی نەبوو، لەبەر ئەوە شێخ ڕەزا بەسەر هەموو ئەو شاعیرە پێگەیشتووانەدا زاڵ بوو.

شیعر شیعرێن یا شەڕە شیعر جموجۆڵی یەکەمی ئەم

کۆمەڵە خوێندەوارانە بوو. وا دەردەکەوێ گەلێ جار ئەم دوو شاعیرە کەیفی و شێخ ڕەزا بەرامبەر بەیەکتری خەریکی شەڕە شیعر بووبن. لەپێشانا بەهێمنی و لەسەرخۆو ئاشتییانە بەشیعر وەرامی یەکترییان داوەتەوە، بەڵام لەدواییدا دەمییان لەیەکتری کراوەتەوە. لەبەر ئەوەی شاعیریەتی کەیفی لە هی شێخ ڕەزا کەمتر نەبووە هەرگیز لەهەموو هەڵوێستێکدا نەیتوانیوە بەرامبەر بەکەیفی بوەستێ، بەپێچەوانە زۆر جار کەیفی پشتی شێخ ڕەزای بەئەرز داداوە. ئەم حاڵەتە دەماری چینایەتی شێخ ڕەزای بزواندووەو پێی ئاستەم بووە یەکێکی کەس نەناسی کەڵاش خواری وەکو کەیفی لەڕووی ڕابوەستێ، هەروەها بەبێ هیچ هۆیێک ئەو دەمارە لەلای مەلا عەبدوڵلای جەلی مامۆستای کەیفی و چڵکاو خۆرەکانی بزواندووە، بەتایبەتی لەناو کۆمەڵی فەقێیانی ناو مزگەوت، تا مەسەلە گەیشتۆتە ئەوەی هەندێ لەفەقێکان وێنەی زۆر ناشیرین لەسەر دیوارەکاندا بۆ کەیفی بکێشن وەکو ئەوەی کەرو ئاژەڵی دیکە سواری بوون. بۆ کۆتایی هێنان بەم کارە نارەوایە مەلا عەبدوڵلای جەلی بێ بەزەییانە تەنیا بەوە ڕازی نابێ بەجنێو کەیفی ڕیسوا بکا، بەڵکو بەلێدان لەمزگەوت دەریدەکا. ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کەیفی کۆیە بەجێ بێڵێ و بچێتە هەولێرو لەوێوە ڕوو بکاتە ئەستەموڵ.

ڕەشید ئاغای بەکر ئاغای حەوێزی هاوڕێی کەیفی دەبێ، نامەیێکی بۆ دەنووسێ، تکای لێ دەکا بگەڕێتەوە کۆیە. کەیفی بەشیعرێک وەرامی دەداتەوە. تێکستی ئەو شیعرە لەلاپەڕەکانی داهاتوودا تۆمار دەکرێ.

**شیعری کەیفی**

شیعری کەیفی لەڕووی ڕوخسارەوە لەدەستوورەکانی شیعری عەرووزی نەچۆتە دەرەوە، یەکێتی کێش و قافیە مەرجی سەرەکی شیعرەکانیەتی. لەڕووی ناوەڕۆکەوە تازەیە. ڕاستە لەشیعری دڵداریدا بەرهەمی دەچێتە ناو هەموو شیعری کلاسیکی لەم بابەتەی ئەدەبی کوردی، کە سیفەتی لاسایی دەدرێتێ، بەڵام لەداشۆرینەکان و وەسفی دەروونی پڕ لەنائومێدی و دڵ شکاوییەکانیدا شاعیرێکە ئەم لایەنەی شیعری کوردی پڕ کردۆتەوە. بەڵام داخی گران لەهەندێ مەبەست شیعری ون بووەو هیچ نموونەیێک لەناوە نییە، لەهەندێکی دیکە بەرهەمی زۆر کەمەو تێنوویەتی شیعردۆستان ناشکێنێ.

شاعیرێکی وەکو کەیفی بتوانێ بەشیعر بەرهەڵستی شێخ ڕەزا بکاو لەڕووی ڕابوەستێ.

دەبێ ئەو شیعرانەی لەپلەیێکی ئیستێتیکی بەرز بووبن!

**نموونەی شیعری کەیفی**

کەیفی کە ڕوو دەکاتە وڵاتی ئاوارەیی و لەئەستەموڵ نیشتەجێ دەبێ، ڕەشید ئاغای بەکر ئاغای حەوێزی دۆستی کەیفی نامەیێکی شیعری بۆ دەنووسێ، تکای لێ دەکا بگەڕێتەوە کۆیە. کەیفی بەم شیعرە وەرامی دەداتەوەو لەپاش چوار دێڕ ئاوا دەست پێدەکات:

**فیلجوملە کە نووسیوتە لەبۆ نایەوە کۆیە**
**چۆن بێمەوە ئێستەش کە لەسەرمایە شەڕی پار**
**ئێستەش وەکو مورغێ کەزەدەی چنگی هەڵۆ بێ**
**بێ هۆشم و ئوفتادە پەریشان و نگوونسار**
**بێ غیرەت و بێ عارم ئەگەر بێمەوە کۆیە**
**وەک پەیکەری بێ ڕووت و وەکو سەر ڕەشی موختار**
**ئیمان و دڵم وا بەدەسی دلبەرێ دابوو**
**نەیدابوو وەها حاجی ڕەشک دینی بەدینار**
**من خەستە تەن و جەستە شکەستەی غەمی ئەو بووم**
**ئەو بوو بەدەواو مەرهەمی بێگانەو ئەغیار**
**خۆت واقفی ئەسراری کە چۆن ئاخری کاریش**
**بێ حورمەتی کردم بەقسەی موفسیدو بەدکار**
**چۆن هەیبەتی بردم لە حوزووری حەزەراتی**
**چۆن هەیئەتی کردم بەسەرو سووڕەتی دیوار**
**هەر چەندە جەفای دام و سەفام لێ نەدی ئەمما**
**شاهانە دەکەم مەدح و سەنای چاکی بە ئەشعار**
**دایم لە خەراباتی حوزووری حەزەراتم**
**ئەم ماوە لەبەر تاعەتی تەن تاقەتی دیدار**
**هەڵناغەڵەتێ (کەیفی) لەمەولا بە فریبت**
**با بەس بێ وەفای ئێوەو با بەس بێ جەفای یار**

ئەم شیعرەی کەیفی ئاه و هەناسەیێکی ئاگرینە لەدڵ وەدەروون و هەناوێکی پڕ لەزووغاڵەوە وەک بورکان تەقیوەتەوە. دڵێکی ناسکی قانگدراو بەهەوای شیعرایەتی

و گیانی سۆفیزم چۆن بەرگەی دارو حەیزەرانی شەریعەتمەدارانی دڵڕەق هەڵدەگرێ. دیارە ڕەشید ئاغا کەیفی خۆش ویستووە، بۆیە تکای لێ کردووە بگەڕێتەوە کۆیە، بەڵام کارەساتەکە لەوە گەورەتر بووە کەیفی بەقەی ئەو هاوەڵە دڵسۆزەی بکا.

لەغەزەلێکی دیکەیدا کەیفی سەما بەوشەو ڕستەی ڕەوانبێژی دەکا. ئاوازو ڕیتمی مەبەستە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانیویەتی مۆسیقا لەگەڵ ناوەڕۆک بگونجێنێ. کۆمەڵێک وێنەی جوانی لەملاو لەولا هێناوە، کەچی سەرنجی خوێنەر زیاتر بۆ ئاوازو ڕیتم ڕادەکێشێ:

**کافرە مەستە چاوەکەی غارەتی دین و دلبەرە**
**پەرچەم و زولفە خاوەکەی بینی لەمیسک و عەنبەرە**
**زولفی سیاهی وەک زرە تاکو دەگاتە کەمبەرە**
**شکەن شکەن گرە گرە حەلقەو چین و چەمبەرە**
**لەچینی زولفی تا بە تا خوتەن خەتا خەتا**
**لەپێچی پەرچەمی هەتا نەزەر دەچی موعەتتەرە**
**ڕوومەتی ماهی نەوشەبی خەتی عەرەبی سەرلەبی**
**مەتلەعی چاهی غەبغەبی خدر سەر ئابی کەوسەرە**
**قەدی بەڵاو ئافەتە قامەتە یا قیامەتە**
**نازکەری نەزاکەتە نافەتی سەر ڕووی کیشوەرە**
**(کەیفی) لەبەر گرینی تۆ کولکنە مەنزلی دڵی**
**سینە لەبەر گرینی تۆ کون کونە میسلی پەنجەرە**

ئەم بڕە شیعرە کەمانەی کەیفی مایەی شاعیرێکی گەورەیە، کەسێکی وەک ئەو شەست و حەوت ساڵ ژیا بێ دەبێ دیوانێکی گەورەی لەپاش بەجێما بێ. داخی گران زۆربەی بەرهەمی شیعری شاعیرێکی مەزنی وەک کەیفی لەناوچووە.

## جەلی
## ١٩٠٨-١٨٣٤

### ژیانی جەلی

شاعیری ئەم ماوەیە عەبدوڵلا کوڕی مەلا ئەسعەدی جەلی زادەیە. لە ساڵی ١٨٣٤ لەکۆیە لەدایک بووە. سەرەتای خوێندنی حوجرەی مزگەوتی لەلای باوکی بووە. لەقۆناغی فەقێیەتیدا هاوڕێی حاجی قادری کۆیی بووە.



پێکەوە ڕوویان کردۆتە ناوچەی باڵەکیان و لەگوندی شێخ وەتمان لەحوجرەی مەلا محەمەدی کاک عەبدوڵلا خوێندوویانە. عەبدوڵلای جەلی زادە لەو ماوەیەدا دڵی دەچێتە حەلیمەی کیژی مەلا محەمەدی مامۆستای. ئەو کچە جوان بووەو گۆیا دەستی شیعریشی بووە، بەڵام هیچ شیعرێکی نەماوەتەوە. لەوانەیە هەردووکیان شیعریان بۆ دڵدارییەکەیان هۆنیبێتەوە، جەلی زادە لەچوارینێکیدا لەم بابەتەوە دەڵێ:

**کە بێری هاتە ناو مێگەل سەراسەر قرمزی پۆشی**
**مەلا ئیدراکی چوو، شێخیش تەریق، عارف نەما هۆشی**
**حەبیب دیتی ڕەقیب وەستاوە چارۆکەی بەڕوو دادا**
**گوتم هەوری سیا هات شەعشەعەی خورشیدی داپۆشی**

باوکی شاعیر کە بەم دڵدارییەی زانیوە بەوە ڕازی نەبووە عەبدوڵلای کوڕی ئەو کچە بخوازێ. ئەم مەسەلەیە کارەساتی لێ دەکەوێتەوە، بەنەخۆشی سیل کۆتایی بەژیانی حەلیمە دێ.

جەلی لەساڵی ١٨٧١ لەگەڵ باوکی حەجی کردووە لەماوەی جێبەجێکردنی شەعایری حەج مەلا ئەسعەدی باوکی کۆچی دوایی کردووەو لە وڵاتی حیجاز بەخاک سپێردراوە- ئیتر خۆی گەڕاوەتەوە کۆیەو بووە بەجێنشینی باوکی.

جەلی پێوەندی و ئاسیاوی لەگەڵ مەلاو شێخانی دەروێشی ئەو سەردەمەدا بووە هی وەکو شێخ عومەری

بیارەی نەقشبەندی و کاک ئەحمەدی شێخی قادری و مفتی زەهاوی و هی دیکە.

مەلا عەبدوڵلا "جەلی" هەڵبژاردووە وەک نازناوی شیعری، ئەمەی لە لەقەبی بنەماڵە "جەلی زادە"وە وەرگرتووە.

### شیعری جەلی

جەلی شیعری نەکردووە بەپیشە، لەبەر ئەوە شیعری کەمە، شیعری لەموناسەبە وتووە، لەگەڵ ئەوەشدا گومان لەوەدا نییە ئەو بەرهەمەی لەبەردەستدایە هەموو شیعری ئەم شاعیرەمان نییەو بەشێکی لەناوچووە.

لەگەشتێکیدا لەبەغدا جەلی ناسیاوی لەگەڵ شێخ عومەری بیارەی نەقشبەندی پەیدا کردووە، لەدوای ئەوەی هەر کەسە گەڕاوەتەوە جێی خۆی، شێخ عومەر نامەیێکی شیعری بۆ جەلی نووسیوە بەدەستی مەلا عەبدولسەمەدی گۆجی خەڵکی شیواشان ڕەوانەی کۆیەی کردووە، لەنامەکەدا دەڵێ:

**دەمێکە کاغەزت نایێتە لامان**
**عەجەب سستی لە پەیغام و سەلامان**
**جەلی دایم دەبێ جلوەی دیار بێ**
**لەنێو گێژاوی شەت بێ یا کەنار بێ**
**عومەر عومرێکە بۆ تۆ ئینتیزارە**
**لە شەوقی تۆ وەکو ئاو بێ قەرارە**

شاعیری ئەم ماوەیەمان جەلی بەم شیعرە وەرامی دەداتەوەو لەپاش چەند دێڕێک دەنووسێ:

**عومەر عومرێکە گەر مەیلی بەلامە**
**ئەدی بۆ مەرکەزی دەردو بەلامە**
**حەیاتی من لەدووری تۆ مەماتە**
**عەجایەب نیسبەتێک و ئیرتیباتە**
**هەموو عومرم بەپاییز چوو لەهیجران**
**بەهارم هیچ ئەدی بۆ گەشت و سەیران**
**بەقوربان شارەزووری چۆن ببینم**
**زەرو زوورم نییە شەقاو هەڵێنم**
**لەباتی کێوی هەورامانی پڕ نوور**
**لەژێر کێوی غەمان کەوتووم وەکو موور**
**ئەگەر لوتفت هەبێ پێ رادەکێشم**
**لەقافڵەی مەتڵەبا هەردەم لەپێشم**
**لەوێ ڕۆژێ کەتۆم دیوە لەبەغدا**
**ملم داوە بەحەق وەڵلا بەبیللا**

دواجار بەم شێوەیە کۆتایی بەنامە شیعرییەکەی دێنێ:

**لەبەر شێخان ئەگەرچی دین براوە**
**بەتیفی تۆ زمانی من براوە**
**وەلێ بۆ خاتری تۆ بەندەیانم**
**زمان دەگرم لەحەقیان تا بتوانم**
**لەپاشی تۆ خودا بۆ خۆی عەلیمە**
**لەکەرکووکیش دوعا گۆیی عەلیمە**

ئەم شیعرەی جەلی لەسەر شێوەی جووت قافیە (مەسنەوی) هۆنراوەتەوە، بەزۆری نامەی شیعری لەئەدەبی کلاسیکی کوردیدا ئەم جۆرە قافیەی بۆ بەکارهێنراوە.

ئەوەی لەم شیعرەدا سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە ئەتیکێت لەهەڵوێستی بەراوردکردن و موجامەلەدا ئەوە دەخوازێ پیاو ئەوەی بەرامبەری بەگەورە بزانێ و خۆی بەبچووک. لەبەر ئەوە جەلی ئەمەی لەگەڵ شێخ عومەری بیارە کردووە. لەکۆتایی شیعرەکەدا ئەوەی لەبیر نەچووە یادی شێخ عەلی تاڵەبانی برای شێخ ڕەزا بکاتەوە، بەمە جەلی ویستوویەتی بڵێ، هەرچەندە دڵسۆزی شێخ عومەری بیارەیەو لەڕووی تەریقەتیشەوە نەقشبەندییە، بەڵام سۆزی بۆ شێخ عەلی تاڵەبانیش هەیە، کە شێخی تەریقەتی قادرییە.

شانازیکردن بەخۆ سیفەتی زۆربەی شاعیرانی ڕۆژگارانی کلاسیکی بووە، لەوانەیە جەلی هەستی بەوە کردبێ لەڕووی شاعیرییەوە مافی خۆی نەدرابێتێ، واتە وەک شاعیرێک لەناو خەڵکیدا ناوبانگی دەرنەکردبێ، لەم لایەنەوە دەڵێ:

**دەفتەری ئەهلی هونەر بگرن ئەگەر لەم عەسرەدا**
**ماڵی بێ ئیقبال نەبێ وەڵلا (جەلی) سەر دەفتەرە**

ئەمە نارەزایی هەموو شاعیرێکە، یا هەموو ڕۆشنبیرێکە بەرهەمی ئەدەبی و هونەری هەرچی بێ، کە بەچاوی خۆی تەماشا نەکرێ دەبێتە گرێ لێی و ناچار دەکەوێتە ستایشی خۆی، بەڵام هەر چۆنێ بێ ئەو ستایشە ڕەوایە ئەگەر ماکی داهێنانی ئیستێتیکی تێدا بێ.

پەیدابوونی بیری کوردایەتی بەشێوەیێکی تازە لەدوا سالآنی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم کاری کردبووە سەر خوێندەوارانی ئەو سەردەمانە، کە زۆربەیان مەلا بوون. جەلی یەکێک بووە لەو مەلایانەی هەستی کوردایەتییان لەلا دروست بووە بۆ دەربڕینی هەڵوێستی خۆی لەوانەیە بەئانقەست شیعرێکی بەزمانی فارسی دانابێ بۆ ئەوەی لەو زمانە لابداو بێتە سەر زمانی کوردی، نەم لایەنەوە دەڵێ:

**با بکەم تەبدیلی نەزم و قافیەو ڕەویەو عەرووز**
**بەم زمانە هیچی تر شیعرم لەبۆ هەڵناستێ**
**بیکەمە کوردی زمانی خۆمە چاکی تێدەگەم**
**خوایە تۆفیقم بدەی من بەندە تۆ مەولاستێ**

## ئەختەر
## ١٨٨٨-١٨٣٩



### ژیانی ئەختەر

ئەختەر، بەمانای ئەستێرە، نازناوی ئەمین ئاغای کوڕی بەکر ئاغای کوڕی محەمەد ئاغای حەوێزییە. لەساڵی ١٨٣٩ لەگەڕەکی بەفری قەندی لەکۆیە لەدایک بووە.

سەرەتای خوێندنی ئەختەر لەیەکێ لەحوجرەکانی مزگەوتی گەورەی کۆیە بووە. لەتەمەنی مێردمنداڵی وانەی فارسی لای مەلا سمایل مەنتک خوێندووە، ماوەییێکیش لەگەڵ ئەسعەد ئاغای حەوێزی برای لەبەغدا هەردووکیان بەردەوام دەبن لەسەر خوێندن. لەپاشان لەتەمەنی پازدە ساڵیدا ناچار دەبێ دەست لەخوێندن هەڵبگرێ بەهۆی مردنی باوکییەوەو لەجێی ئەو دادەنیشێ. بەم جۆرە دەبێتە سەرۆکی بنەماڵەی حەوێزییان و دیوەخانەی تایبەتی وەک نێوەندێکی ئەدەبی لەو ڕۆژگارەدا خۆی دەنواند. مەڵبەندو جێی کۆڕو کۆبوونەوەی شاعیرانی ئەو سەردەمە بوو، بەتایبەتی حاجی و کەیفی و شێخ ڕەزا میوانی بەڕێزی ئەو دیوەخانەیە بوون و جێگەی دیارییان تێیدا هەبوو.

ئەختەر وەک ئاغایێکی بەدیمەن و دەوڵەمەند لەژیانی کۆمەڵایەتیدا ئوروستوکراتیانە نەبووە، بەزەیی بەهەژاراندا هاتۆتەوە، دەستی گرتوون و یارمەتی داون. ئەختەر خاوەنی قسەی خۆی بووە، بەرهەڵستی خراپەی داگیرکەری عوسمانی کردووە، تا گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی هەجووی سوڵتانی عوسمانی بکا. لەسەر ئەمە والی عوسمانی تەقیەدین پاشا ئەختەری ئاوارەی شاری حیللەی باشووری عێراق کردووە. لەدوای ماوەیێک کە نامیق پاشا بووە بەوالی، ئەختەری لەئاوارەیی ئازاد کردووەو گەڕاوەتەوە کۆیە.

لەژیانی تایبەتی خۆیدا ئەختەر دڵداری کردووە، دڵی چۆتە کچێکی جوانی بنەماڵەی دارۆغە، ناوی ڕابی بووە. ئەم دڵدارییە پاک و بێ گەردە زیندە بەچاڵ دەکرێ بە بەهانەی ئەوەی ئەختەرو ڕابی بەمنداڵی شیریان پێکەوە خواردووە.

ئەختەر تەنیا شاعیر نەبووە، بەڵکو هونەروەرێکی ڕەسەنی مۆسیقاو گۆرانی بووە، ئاوازی بۆ هەندێ شیعری کوردی داناوە، جگە لەوەی شیعری خۆی کە دەکەوتە بەر دەنگی گۆرانیبێژان ئاوازەکانیان لەلایەن شاعیرەوە دادەنران، هەروەها هەندێ جار بۆ ئاوازێکی دیاریکراو شیعری هۆنیوەتەوە، بایەخی بەگۆرانیء سروودی میللی (فۆلکلۆری) داوە.

دیوەخانەکەی مەڵبەندێکی ئەدەب و هونەر بووە. بەگشتی ئەختەر دەورێکی گرنگی بووە لەژیانی خوێندەواری کۆمەڵی کۆیە لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم.

ئەختەر لەساڵی ١٨٨٨ لەکۆیە کۆچی دوایی کردووەو لەگۆڕستانی عارەبیان لەتەنیشت باوکی نێژراوە.

**شیعری ئەختەر**

ئەختەر لەهەندێ لەشیعرەکانیدا ناوی ڕاستەقینەی خۆی "ئەمین"ی بەکارهێناوە وەک نازناوی شیعری. بەرهەمی شیعری ئەختەر ئەوەی بۆمان ماوەتەوە زۆر کەمە، بۆیە زۆربەی بەحرەکانی عەرووزو قافیەی دەنگەکانی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی تیایاندا نابینرێن. پلەی ئیستێتیکی ئەو شیعرانەی لەبەر دەستدایە، ئەوە دەگەیەنێ دیوانی شیعری ئەختەر زۆر لەمە زیاتر بووبێ.

بێ گومان ئەختەر سەر بەقوتابخانەی نالییە، بەڵام لەو شاعیرە بەرچاوانەیە داهێنانی هونەری زۆرە لەناو چوارچێوەی ئەم قوتابخانەیەدا. شیعری ئەختەر لەڕێکخستنی ڕستە و تەعبیر سفت و ئاسانە. مانای ڕستەو داهێنانی ڕەوانبێژی خۆیان بەچێژی خوێنەر دەناسێنن.

بەگشتی ناوەڕۆکی شیعری ئەختەر لەدوو مەبەستی سەرەکی پێکهاتووە، وەسف و دڵداری. ئەم دوو بابەتە بەشێوەییەک تێک ترنجاوون بەهیچ جۆرێ لەیەکتری جیا ناکرێنەوە. شاعیر بەشێوازێکی ڕەوان و بەهەناسەیێکی گازاندەو گلەیی ئامێزەوە وێنەی شیعری دروست دەکاو مانای داهێنراو دەخولقێنێ.

**گەشتی گوڵزاری شیعری ئەختەر**

لە غەزەلێکیدا ئەختەر دەڵێ:

**ڕووحی شیرینم لەبۆچ ئەمڕۆکە وا لوتفت نییە**
**نووری بینای دیدەکانم پێم بڵێ سووچم چییە**
**بێ قەباحەت لێم زویری چاکە ئینسافت هەبێ**
**تاکو نەمرم خۆ مەحاڵە ڕۆیینم لەم قاپییە**
**خوێن لە چاوانم خرۆشا وا فووارەی بەستووە**
**نابێ جارێ بێیتە سەر ئەم حەوزو جۆگەو کانییە**
**ئاگرێ عەشقت وەها کوورەی دڵی هێناومە تاو**
**شێت و شەیدای کردووم ئاگام لەدنیایێ نییە**
**واعیزێ دوێنێ لەسەر مینبەر وەها وەعزی دەدا**
**هەر کەسێ یاری نەبێ تەحقیقە عومری فانییە**
**قازی و موفتی کە دوێنێ نیسحەتی منیان دەکرد**
**ئیمڕۆ قازی موتریبەو ساقی جەنابی موفتییە**
**زاهیدو سۆفی ئەگەر سەد ساڵی تر تەقوا بکەن**
**شارەزا نابن وەکو من موشکیلە ئەم وادییە**
**شێخی سەنعانی ئەگەر دەستی بەدامانت بگا**
**خەرقەو تەسبیح و تاج و تەیلەسانی بۆچییە**
**ئەی (ئەمین) بیستوومە ئیمڕۆ یار خەڵاتی کردووی**
**سا وەرە ئەوجاکە بمرە تۆ لەسەر ئەم خۆشییە**

لەسەرەتای ئەم شیعرەدا ئەختەر ئەوە ڕوون دەکاتەوە کەیاری خۆشەویستی لێی تۆراوە. بێ گومان هیچ هۆیێک لەناوەوە نەبووە بۆ ئەو تۆرانە. واعیز ئامۆژگاری هەموو کەسێکی کردووە پێویستە یارو دلبەری هەبێ، ئەوەی نەیبێ تەمەنی بەخۆڕایی دەباتە سەر. دڵداری پێویستی هەموو کەسێکە قازی و موفتێش دەگرێتەوە. ئەمانە لەڕابردوودا ئامۆژگارییان دەکرد خەڵکی لەئەڤین و دڵداری دوور بکەونەوە، کەچی ئەمڕۆ قازی بووە بەگۆرانیبێژو موفتیش بووە بەمەیگێر. لەکۆتایی شیعرەکە دلبەر لەگەڵ شاعیردا ئاشت دەبێتەوە، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی لەخۆشیاندا مردنی بۆ خۆی بووێ.

لەشیعرێکی دیکەیدا ئەختەر یادی کۆمەڵێک شارو ئاوەدانی و ناوچەی جوگرافی دەکاتەوە، کە بەجوانی کچ ناوبانگیان دەرکردووە، لەغەزەلەکەیدا دەڵێ:

**دەخیلت بم لە عوشاقت مەرەنجە**
**دڵ و دینم فیدای ئەم لارو لەنجە**
**لەدەوری عاریزت کاکۆڵی پر چین**
**دەڵێی ماری سیای ئێشکچی گەنجە**
**لەگورجستان و چین وەک تۆم نەدیوە**
**لەماچین پشکنیم تا مولکی گەنجە**
**بەهایی خاڵی هیندووت هیندو نەوبە**
**فیدایی لەنجەکەت شیرازو تەنجە**
**هەتا وەک شیری دایکت لێت حەڵاڵ بێ**
**خەناوی کە بەخوێنم دەست و پەنجە**
**ئەوەندەم خاک بەسەردا کرد لەهیجرت**
**زەمین دووی بوو بەتۆز ئێستاکە پێنجە**
**لەدووری تۆ لەتۆ دوور ڕووحەکەی من**
**نەسیبی دڵ بڵاوو دەردو ڕەنجە**
**تەماشاکە سەراپا ماهم (ئەختەر)**
**هەموو عیشوەو فریب و نازو غەنجە**

شاعیر لەو غەزەلەدا ناوی گورجستان و چین و ماچین و گەنجە و هیندستان و نەوبەو شیرازو تەنجە دەبا. ئەمانە ناوی جێگەی جوگرافی و ئاوەدانین لەنەخشەی ڕۆژهەڵات و

ئەفەریقادا. ئەختەر بەچاوی ڕەمز ئەو جێیانەی کردووە بەمەڵبەندی ژنی جوان.

شاعیر پەشۆکاوە لەدووری لە دلبەر، شین و شەپۆڕیەتی، لەحەوت چینەکەی (تەبەقەکەی) زەوی خۆڵی دوو چینی بەسەری خۆیدا کردووە، لەحەوت چینەکە پێنجیان ماون، ڕەنگە مەبەستی پێنج کۆنتینێنتەکەی وشکایی سەر ڕووی زەوی بێ.

لەشیعرێکیدا ئەختەر نالییانە خەیاڵی کردووە:

**سەرم گێژو دلم بریانە بێ تۆ**
**لەدووریت پیشەکەم گریانە بێ تۆ**
**دەخۆم سوێندێ بەقورئانی جەمالت**
**ریازی جەننەتم زیندانە بێ تۆ**
**لەلای تۆ بێ منی هاوین بەهارە**
**لەکن من فەسلی گوڵ زستانە بێ تۆ**
**دەروونم لەت لەتە ئاهم شەرارە**
**کە ئاوی چاوی من بارانە بێ تۆ**
**شیفاو زیندەگانیم پێ نەماوە**
**لەعیشوە نۆشی بن بێگانە بێ تۆ**
**قەسەم بەو نێرگسی خوماری چاوت**
**کە (ئەختەر) خواردنی دووخانە بێ تۆ**

بەگشتی هەست بەشێوازی نالی دەکرێ لەبەرهەمی شیعری ئەختەردا. بەتایبەتی ئەم غەزەلە لاساییکردنێکی تەواوی شیعرێکی نالییە، کە دەڵێ:

**نەمردم من ئەگەر ئەمجارە بێ تۆ**
**نەچم شەرت بێ هەتا ئەو خوارە بێ تۆ**

لێرەدا دیارە ئەختەر لەکێش و قافیە لاسایی نالی کردۆتەوە، جگە لەوە هەوڵیداوە ئەوەی نالی نەیوتووە، ئەو لەم قاڵبەدا ئەو بیڵێ. هەروەها وێنەو لێکسیکۆنی نالیش لەم شیعرەدا دەکەوێتە بەرچاو، بەڵام بەشێوازێکی دیکە ئەختەر دەریبڕیوە.

## سانی

۱۹۰٦ - ......

### ژیانی سانی

کاک عەبدوڵڵا کوڕی کاک عەلی کوڕی کاک عەبدوڵڵا کوڕی کاک مستەفایە، نازناوی شیعری "سانی" بووە،



ئەمەی لەوشەی "الثانی" عەرەبی وەرگرتووە. ناوی باپیری عەبدوڵڵا بووە، ئەوی بە عەبدوڵڵای یەکەم داناوە خۆشی بەعەبدوڵڵای دووەم. بەڵام وشە عەرەبییەکەی هەڵبژاردووە بۆ نازناوی (سانی = الثانی).

سەردەمی لەدایکبوونی سانی نەزانراوە، بەڵام دیارە کەسێتی شیعری لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم بووە، خوێندنی سەرەتایی لەمەڵبەندی خۆی بووەو هەر بۆ ئەم مەبەستەش ناوچەکانی دیکەی خۆشناوەتی بەسەر کردۆتەوە. پێوەندی و تێکەڵاوی لەگەڵ کۆیە زۆر بووە بەتایبەتی نموونەی بڵاوبوونەوەو پەرەسەندنی قوتابخانەی نالی لەخاکی سۆران لەکۆیە بووە لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم. لەڕووی بەڕێوەبردن و کاروباری میرییەوە مەڵبەندی بنەماڵەی کاکی هیران گوندەکانی هیران و نازدنێن سەر بەکۆیە بوون.

سانی کەسێک بووە لەئەنجامی چێژی شاعیری و ئاواز گیرۆدەی گۆرانی و سروودو مۆسیقا بووە. غەزەلەکانی لەسەر ئاوازی دەف، دەنگخۆشەکان چڕیویانە.

شاعیر تەمەنێکی درێژی بردۆتە سەرو لەساڵی ۱۹۰٦ کۆچی دوایی کردووەو لەگۆڕستانی بنەماڵە لەگوندی هیران نێژراوە.

### شیعری سانی

ئەو شیعرە کەمەی ئەم شاعیرەمان لەبەردەستدایە لەچوارچێوەی قاڵبی غەزەلی دڵداری و وەسف نەچۆتە

دەرەوە. شاعیر بایەخێکی زۆری بەڕەوانبێژی داوە، کێشی شیعری ڕەوانە، قافیەی بێ خەوشە، وشەی هەڵبژاردەیە، ڕستەو تەعبیری بێ گرێیە، مانای ئاشکرایە.

### نموونەی شیعری سانی

لەشیعرێکیدا سانی هانا دەباتە بەر مەیگێڕ بۆ ئەوەی لەخراپەی ڕەقیب بیپارێزێ:

**گوتی چارەم نەبوو هەرچەند هەلاتم**
**دەخیل ساقی وەرە وەعدەی وەفاتم**
**بدە جامێ بەقوربانی وەفاتم**
**لەبەر جەوری ڕەقیب و دەردی دووری**
**هەمیشە چاوەڕێی مەرگە حەیاتم**
**هەزار دەفعە شەوو ڕۆژ گەر دەرم کەی**
**غولام و بەندەیی تۆم خاکی پاتم**
**لەعەشقی چاوەکانی مەستی لەیلا**
**وەکو مەجنوون شەیدایی ولاتم**

شاعیر لێرەدا باکی بەڕەقیب نەکەوتووە، ئەگەر یاری نازدار بەقسە دەریشی بکا سانی عەبدو غولام و خاکی بەر پێی ئەو یارەیە، وەک مەجنوون سانیش ناگاتە لەیلای خۆی.

سانی غەزەلێکی حەوت دێڕی مستەفا بەگی کوردی هەڵبژاردووە، سێ دێڕ لەو غەزەلەی کردووە بەپێنج خشتەکی، دێڕی یەکەم و دووەم و کۆتایی، لەوانەیە هەمووی کردبێتە پێنج خشتەکی و ئەوانی دیکە ون بووبن:

**بەدڵ ئەفغان و زارییە لەچاوان گوڵ دەبارێنم**
**لەهیجری یاری بێ میهرم لەجەوری چەرخی پڕ کینم**
**وەها سەرگەشتەو مەحبووسی ئەم کاکۆڵی پڕ چینم**
**(ڕەفیقی کونجی میحنەت عاجزن هەر شەو لەناڵینم**
**گورێزانن لەبەر لێشاوی بەحری مەوجی ئەسرینم)**
**فیدای لەعلی لەبانت بم جەفا لەبیە حەمیەت بێ**
**هەتا کەی قیسمەتی من لەو قەدی ڕەعنا ئەزییەت بێ**
**بەقوربانی نیگاهت بم لەڕێگای خوا مورووەت بێ**
**(ئەگەر مومکین نەبوو وەسڵم کە من مردم وەسییەت بێ**
**لەباتی قەوم و خوێشانم لەسەر مەیتم بکا شینم)**

* * *

**سەدایی مەقسەدی قەتلە بەئەو موژگانی خوێنینت**
**تەشەبوس نابەمە بەر کەس بەغەیرەز لێوی شیرینت**
**سوئالی بێ جوابە گەر بکەن لەو عەبدی دێرینت**
**(عەبەس (کوردی) مەلایێک دێن دەپرسن مەزهەب و دینت**
**کە قادر خۆی دەزانێ من لەسەر کام مەزهەب و دینم)**

ئەم کارەی سانی ئەوە دەگەیەنێ، کە هۆگری شیعری مستەفا بەگی کوردی بووەو تەنانەت ئەم غەزەلەشی بەدڵ بووە، بۆیە کردوویەتی بەپێنج خشتەکی، ئەم کارە لەئەدەبی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پێڕەو دەکرێ.

## نیهانی
## ١٩٣٤-١٨٦٥



### ژیانی نیهانی

ناوی ئەم شاعیرە شێخ محیەدین کوڕی شێخ عەبدولکەریم کوڕی شێخ ئەحمەدە. لەساڵی ١٨٦٥ لەشاری کۆیە لەدایک بووە. سەرەتاکانی خوێندنی قورئان و فێربوونی زانستەکانی ئایینی ئیسلام لەحوجرەی مزگەوتی مەلایان بووە. قۆناغی فەقێیەتی لەمزگەوتی بابیز ئاغا لەکۆیە تەواو کردووە، مەلا عەبدولڕەحمانی کوڕی مەلا عەباس مامۆستای بووە.

لەو دەمەی شێخ محیەدین دەستی بەشیعر نووسین کردووە، ناوی "نیهانی" وەک نازناوی شیعری. هەڵبژاردووە هێشتا لەتەمەنی مێردمنداڵی بووە کە لەگەڵ باوکی گەشتی سلێمانییان کردووە، بەتایبەتی بۆ بینینی کاک ئەحمەدی شێخ بەمەبەستی وەرگرتنی ئیجازەی دەروێشی تەریقەتی قادری. لەدوای ئەمە نیهانی وەکو

هەمــوو فــەقـێکانی کــوردســتــان گــوند بەگــوند گــەڕاوە بەمــەبەسـتی کـۆتایی هێنان بەخـوێندنی زانسـتـییـەکـانی ئاییـنی ئیسـلام و زمـانی عـەرەبی. لەپێشـان چووە بۆ گوندی "زێوە"ی ناوچەی خـۆشـناوەتی لـەلای مــەلا حــوسـێنی کەرکووکی خوێندوویەتی، لەپاشان لەگەڵ مامۆستای خۆی مەڵبەندی ژیانیان دەگوێزنەوە گوندی "قەرەناو"ی ناوچەی شــوانی کـەرکـووک. لەدوای ئـەمـە ڕووی کــردۆتە گــوندی "عەزە"ی دەشتی هەولێرو ماوەیێکیش لای مەلا شەریفی ڕەنگەڕێژانی خــوێندوویەتی. دوا جــار ڕووی کــردۆتە شەقڵاوەو لەوێ پێویستییەکانی خوێندنی مەلایەتی تەواو کردووە.

وەک زانراوە نیـهانی لەتەمـەنی هەژدە ساڵی ئیـجازەی تەریقەتی قـادری لەکاک ئەحمەدی شێخ وەرگرتووە، بەڵام پێش کـۆچی دوایی باوکی لەسـەر دەسـتی ئەو ئیـجـازەی تەریقەتی تازە کردۆتەوە. کە باوکی لەساڵی ١٨٩٦ کۆچی دوایی کـردووە نیــهـانی لەجـێی ئەو دانیــشــتــوودو بووە بەڕێبەری تەریقەتی قادری لەتەکیەی شێخ ئەحمەد.

لەســاڵی ١٩٢٢ لەو کــاتەی ئینگلیــز بەردوومــانی کۆیەیان کردووە نیـهانی ئەوێی بەجێـهێشـتـوودو چووە بۆ گوندی "هەڵەجە"ی دەشتی هەولێر، لەلای شێخ مەعرووفی برا گەورەی نیشتەجێ بووە، تا ساڵی ١٩٣٤ لەوێ ژیاوەو هەر لەو ساڵەدا کۆچی دوایی کردووەو لەگۆڕستانی هەڵەجە نێژراوە.

#### شیعری نیهانی

نیـهانی شیـعری کـەمە، ئەوەی هەیە هەمـووی بەچاپ نەگـەیەنراوە، بەشـێکی کـەمی بڵاوکـراوەتەوە، بەگـشـتی شیعری ئەم شاعیرە خەریکی دڵدارییە، دەوری گرنگی بووە لەپەرەپێـدانی شـیـعـری تەقلیـدی کـلاسـیکی کـوردی و دەوڵەمەندکردنی.

#### نموونەی شیعری نیهانی

لەشیعرێکیدا شاعیر دەڵێ:

**دیســان وا دڵ پەرێشــان بوو چووە بازاڕی ڕیســوایی**
**مــەتاعی خــاسی ئیــدراکی فــرۆشت دای بەیەغــمــایی**
**ڕەفــیــقــان و برای جــانی لەڕێی خــوا ســا عــیــلاجێ کـەن**
**لەعــەشــقی شـۆخی بێ ڕەحــمی ئەوا لێم بوو بەشـەیدایی**
**نەسیحەت نابیسێ نەسڵەن دەڵێ من باوکە کوشتەکەی ویم**
**دەڵێ ســا لاچۆ لێم لادە یەخــەم مــەگــرە بەبابایی**
**کەمن گەنجینەیی عەشقم بەدەس کەوت شاهی سەر تەختم**
**چ باکم تۆیە ئەم گــەنجــە بدۆڕێنم بەخــۆڕایی**
**هەزاران جــانی شــیــرینم هەبێ نایێــتــە بەر چاوم**
**فــیـدای خـاکی ڕەهی ئەو بێ و نیـسـاری زوڵفی تایایی**
**بەقــوربانی دوو چاوی نێرگــسی و فــەتتـان و مــەسـتی بم**
**بیم فــیـدیەی دوو لەعلی لێوی یاقــووتی شـەکـەر خـایی**
**لەدەعـوای شـۆڕی ئەو مـاهە وەها چاکـە (نیـهـانی) بێ**
**هـەزارانـی هـەیـە دیـوانـەیـی دوو زوڵـفـی یـەڵـدایـی**

هەندێ داهێنانی شاراوە لەدوو توێی ڕستـەکانی ئەم شیـعرە بەدی دەکرێ. شاعیـر دڵ وەکو قاووغێکی دڵداری لەخۆی جیا دەکاتەوە، یا بەمانای فەلسەفی لەخۆی تەجرید دەکا. ئەوە دەگێـڕێتـەوە دڵ بەقـسـەی خـاوەنەکـەی ناکـا، ئاراسـتـەی کـاری چاکی ناکـا. ئیـتـر شـاعـیـر بەبێ عـەشق دەیگرێ، لەبەر ئەوە منەتی پێ نییە.

لەدوا دێڕی شیـعرەکـە سـیـفـەتی یەڵدا بۆ زولفی یاری بەکـار دێنێ. ئەوەی ئاسـاییـە لەم شـیـعـردا ئەوەیە یەڵدا ڕەمـزی درێژترین شـەوی سـاڵە، دەکـەوێتـە شـەوی ٢١ی کـانوونی یەکـەم. لەبەر درێژی ئەو شـەوە شـاعـیـران بۆ سەردەمی عەشقبازی و ماچوموچ لەگەڵ یاری خۆشەویست بەکاری دێن، کەچی ئەم شاعیرەشمان بۆ سیفەتی ڕەشی و درێژی بەکــاری دێنێ، بەڵام زوڵفی یـار بەو شــەوە دەچووێنێ.

## مەنفی
### .....-١٩٢١

#### ژیانی مەنفی

مـەنفی نازناوی مـەلا ڕەسوول کـوڕی مەلا مـەحمـوودی بێتـووشـیـیـە، باوکی لەبێـتـووشـەوە هاتووە بۆ کـۆیەو لەوێ نیشتەجێ بووە. ئینجا مـەلا ڕەسووڵ لەکۆیە لەدایک بووە. باوکی لەمزگەوتی منارە مـەلا بووە. ڕەسـوولی کـوڕی لای ئەو خـوێندوویەتی، لەدوای مـردنی باوکی جێنشـینی ئەو بووەو حوجرەی خوێندنی داناوەو زانسـتـیـیـەکـانی ئاییـنی ئیسلام و زمانی عەرەبی فێری قوتابیان کردووە.

مـەنفی زمـانی فـارسی زانیـوە، لەبەر ئەوە لەسـەردەمی



داگیرکردنی کۆیە لەلایەن ئینگلیزەوە بووە بەتەرجومانی داگیرکەرە ئینگلیزەکان، چونکە هەندێ لەو ئەفسەرە ئینگلیزانە ڕۆژهەڵاتناس بوون، زمانی فارسییان لەکوردی باشتر زانیوە.

مەنفی لەبنەماڵەی بێتووشییە، لەو خێزانەدا زاناو شاعیری گەورە هەڵکەوتوون، لەوانە مەلا عەبدوڵڵای بێتووشی ناودار. شاعیری ئەم ناوە پێوەندی بەکاک مستەفای هیران (سافی) بووە، نێوانییان خۆش بووە، شیعری بەسەر سافیدا هەڵداوە.

لەساڵی ١٩١٩ مەنفی کراوە بە بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی لەکۆیە کەناوی "ئووڵا" واتە (یەکەم) بووە.

مەنفی لەساڵی ١٩٢١ لەکۆیە کۆچی دوایی کردووەو هەر لەوێش نێژراوە.

**شیعری مەنفی**

شیعری مەنفی لەمەبەسە کلاسیکییەکانی شیعری کوردی لەڕووی ڕوخسارو ناوەڕۆکەوە نەچۆتە دەرەوە، زمانی شیعری ئاسان و ڕەوانە، کێشی عەرووزییە، یەکێتی قافیەی بەکارهێناوە، هەندێ لەمەبەستەکانی شیعری لاسایی دەور دەکاتەوە لەوەسف و دڵداری و داشۆرین. لەدیوانی شیعری کوردیدا جێ پەنجەی مەنفی دیارەو ئەو دیوانەی ڕەنگین و دەوڵەمەند کردووە.

**نموونەی شیعری مەنفی**

لەشیعرێکیدا مەنفی دەڵێ:

**قەمەر خەددی سەهی قەددی کەمەر موویی سەمەن بوویی**
**بەدەن سیمی دەهەن میمی جەفاکاری دڵ ئازاری**
**فەلەک خوویی مەلەک ڕوویی سیا چەشمی موژە سەهمی**
**بەڵا جوویی تەلخ گوویی مەهی بێ میهرو غەدداری**

لەم پارچە شیعرەدا مەنفی ڕیتم و مۆسیقاییێکی تایبەتی بەناوەڕۆکی شیعرەکە بەخشیوە. هەر نیوە دێڕی کردووە بەچوار ڕستەی قافیەدار، جۆرە ئاوازێکی دروست کردووە لەتریەی پێی وڵاغی ڕەسەن و خوڕەی ئاوی گەلی دەکا، کە سەرەو خوار دەبێتەوە. خوێنەر لەگەڵ مۆسیقای ڕەوانبێژی دەژی، خۆ ئەگەر سەرنجی ناوەڕۆکیش بدا کە وەسفی یارەکەیەتی، ماناو مۆسقا هارمۆنییێک دروست دەکەن دەبێتە ئارامی گوێ و مێشک.

مەنفی لە شیعرێکیدا موناجات لەگەڵ یاری خۆشەویستی دەکا:

**جەمیعی عاشقانی دڵ حەزینت**
**بەقوربانی دوو چاوی نێرگسینت**
**هەزارانی وەکو عەزراو لەیلا**
**کەنیزانی غولامی کەمتەرینت**
**کە مەقسوودی دڵم ماچێکە قوربان**
**دەسا بیدە لە لەعلی شەککەرینت**
**ئەگەر مەیلت لەقەتلی عاشقانە**
**بەسە شمشێری ئەبرۆی نازەنینت**
**چییە جانا وەها بێ ڕەحمی ئەمڕۆ**
**چ قەوماوە کەوا تێکچوو جەبینت**
**پەرێشان بوو دڵی عالەم بەکوللی**
**وەکو زوڵفت لەسەر ڕووی ئاتەشینت**
**کە (مەنفی) بەندەیی قوربانی تۆیە**
**بەماچێ دەستی بگرە دەست و دینت**

شاعیر ئەم دلبەرەی خۆی بەگەورەتر دەزانێ لەهەموو دلبەرانی گێتی، بەتایبەتی عەزراو لەیلا، لەبەر ئەوە دڵداری زۆرە. بێ گومان ئەم هەموو پێدا هەڵدانەی لەپێناوی ماچێکە دلبەر پێشکێشی شاعیری بکا، دیارە ئەو ماچەش دەست ناکەوێ.

مەنفی خۆی بەدەروێشی کاک مستەفای هیران (سافی) داناوە، شیعری هەیە بۆ ستایشی ئەو دەروێشیزمەی لەکاک مستەفا بەرجەستەی کردووە، لەشیعرێکیاندا دەڵێ:

**تاڵعم بێ دار بوو باز بەختم ئەوا نوستۆتەوە**
**کاغەزم ناردۆتە لای دڵدارو نەیخوێندۆتەوە**
**جوزئەیێ ڕەحمی موسوڵمانی لەدڵ پەیدا ببوو**
**بوو بەشەیتانی ڕەقیب و مانی لێ سەندۆتەوە**
**من کە خۆراکم نییە وا تێمەگەن بێ خواردنم**
**باری لێوم خواردووە خوێنی دڵم خواردۆتەوە**
**نووری دینی مستەفایە ڕەوشەنی کرد ڕووی زەمین**
**یا مەیی بێ میهرو مەه ڕووی ڕۆژی دەرخستۆتەوە**
**یووسفی میسری کە مەشهوورە بەحوسن و دلبەری**
**ئێستە هەم چەشمی پەیا بوو بۆچی خۆی شاردۆتەوە**
**(مەنفی) یا وا بەستەیی زولفی نیگاری خۆیەتی**
**یا نەخۆ دێوانەیە شێخ دەست و پێی بەستۆتەوە**

مەنفی ئەم شیعرەی وەک نامەیێک یا پەیامێک بۆ کاک مستەفای هیرانی نووسیوە گلەیی لێ دەکا، چونکە وا دەردەکەوێ پێشتر مەنفی نامەی بۆ کاک مستەفا نووسیبێ و ئەو وەرامی نەدابێتەوە. بێ گومان ئەم نامەیە وەک موناجاتێکی دڵداری دەکەوێتە ڕوو، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە پێویستە بەهەوایێکی سۆفیزمیانە تەماشا بکرێ.

مەنفی بەشداری لەو چوونە مەیدانە دەکا، کە شێخ ڕەزاو شوکری فەزڵی بەشەڕە شیعر نابوویانەوە. شاعیری ئەم ماوەیەمان خۆی دەکا بەلایەنی شێخ ڕەزاو بەگژ شوکری فەزڵیدا دەچێ، لەم بابەتەوە دەڵێ:

**شوکری خۆت دەیزانی تۆڵەی چاکە قەت ئاوا دەبێ**
**نانی کێری شێخ دەخۆی تا ڕووی زەمین ئاوا دەبێ**

بەم جۆرە دوایی بەشیعرەکە دێنێ:

**کێوی ئەلبورزی سوڕێنت گەر بەری گورزم کەوێ**
**وای دەهاڕم سەد هەزار دەربەندی لێ پەیدا دەبێ**
**گەر ڕەئیسی شاعیران ڕوخسەت بداتن کافییە**
**کێری (مەنفی) قوون دڕێنی دوژمن و ئەعدا دەبێ**

ئەم دێڕانە وەک بەرهەمێکی جوان دەکەونە بەرچاو لەڕووی هونەرییەوە. بەڵام پێویستە لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە لێیان بکۆڵرێتەوە. مەنفی بۆچ لای شێخ ڕەزای گرتووەو دژی شوکری فەزڵی وەستاوە؟ لێرەدا هەڵوێست هەر ئەوەیە بۆچ مەلا عەبدوڵڵای جەلی لەکۆیە لەکێشەکەی نێوان شێخ ڕەزاو کەیفی لایەنی شێخ ڕەزای گرتووەو بەئیهانەو لێدان کەیفی دەرکردووەو ناچار بووە کۆیە بەجێ بێڵێ، ڕوو بکاتە ئەستەموول. هۆی ئەمە لەهەردوو باردا ئەوەیە شێخ ڕەزا بەناوو ناوەڕۆک کوڕی بنەماڵەیێکی شێخی قادری بەناوبانگ بووە، مەقامێکی بەرزی بووە لەبەر خۆشی نەبوو بێ لەبەر بنەماڵەی بووە. یەکێکی وەکو مەلا عەبدوڵڵای جەلی و مەلا ڕەسوولی مەنفی کە لایەنی شێخ ڕەزایان گرتووە لەدژی کەلاش خوارێکی وەکو کەیفی و کەسێکی ئاسایی وەکو شوکری فەزڵی کارێکی ڕیاییان کردووە. نەدەبوو بیکەن، ئەگینا ئەگەر مەسەلە شاعیری بووبێ کەیفی و شوکری فەزڵی لەگەڵ ئەوەی شیعریان کەمە، بەڵام لەشاعیرە مەقام بەرزەکان بوون.

## حاجی
## ١٨٩٧-١٨١٦



### ژیانی حاجی

حاجی لەبابەت خۆیەوە دەڵێ:

**باوکم ئەحمەد بوو ناوی فیکرم دێ**
**خەڵقی لادێ بوو دایکی من فاتێ**

حاجی قادر کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا سالّحی کوڕی مەلا ئەحمەدی گەورەیە. ناوی دایکی فاتێ (فاتیمە) بووە. لەنێوەندی ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردیدا ئەوە باوە وشەی "حاجی" پێشناوی چوونە حەجی نییە، چونکە حەجی نەکردووە، ناوی قادر یا عەبدولقادر بووەو لەمانگی حاجییان لەدایک بووە لەبەر ئەوە لە منداڵییەوە بەحاجی قادر ناوبانگی دەرکردووە.

حاجی لەساڵی ١٨١٦ لەگوندی گۆڕقەرەج لەدایک بووە، ئەم ئاواییە کەوتۆتە خوارووی ڕۆژئاوای شاری کۆیە نزیک شوێنەواری گۆمەلاڵەی دۆڵی مۆردان.

حاجی زۆر منداڵ بووە کە باوکی مردووە. لەتەمەنی حەوت ساڵیدا فاتێی دایکی ناویەتیە بەرخوێندن. لە نەریتی ناو کوردەواری ئەوە باو بووە کوڕی تاقانە بەمنداڵی باوکی کۆچی دوایی کردبێ دایکی دەیخستە بەرخوێندن. خوێندنی بەرایی حاجی لای مەلا ئەحمەدی ئۆمەر گونبەتی بووە. ئەمە خاڵۆزای حاجی بوو. لەدوای دوو ساڵ فاتێی دایکیشی کۆچی دوایی دەکا. بەم جۆرە بێ کەس دەمێنێتەوەو مەلا ئەحمەد بەخێوی دەکا.

لەخوێندنی حوجرە تا گەیشتۆتە قۆناغی فەقێیەتی لەکۆیە بووە. لەهاوینی ساڵی ١٨٥٣ لەگەڵ مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە وەک فەقێیێک بۆ خوێندن ڕوو لەگوندی شێخ وەتمان لەناوچەی باڵەکایەتی دەکا. هەردووکیان دەبن بە فەقێی مەلا محەمەدی کاک عەبدوڵلا. لەدوای ماوەیێک حاجی لەمەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە جیا دەبێتەوەو بەتەنیا بەرەو شارەکانی سەردەشت و سابلاغ (مەهاباد) و شنۆ دەکەوێتە ڕێ، بۆ ماوەی شەش حەوت ساڵ لەم شارانەدا دەمێنێتەوە تا پرۆگرامەکانی خوێندنی حوجرە تەواو دەکا لەزانستەکانی ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبی. لەساڵی ١٨٦٢ ئیجازەی دوازدە عیلمی وەرگرتووەو بەرێگای دەشتی لاجان و باڵەکایەتی گەڕاوەتەوە کۆیە.

ژیانی حاجی لەکۆیە ئاسان نەبووە، لەبەر ئەوە بەهیچ جۆرێ بۆی نەکراوە مەلایەتی بکا، یا خۆی نەیویستووە خەریکی پیشەی مەلایەتی بێ، هەروەها بێ ئۆقرەیی کاری لە ژیانی تایبەتی خۆی کردووەو بووە بەهۆی ئەوەی ژن نەهێنێ و خۆی نەخاتە ناو داوی خێزانی و تووشی بەخێوکردنی ماڵ و منداڵ نەبێ.

پێوەندی حاجی بەئاغاو کاربەدەستانی سەرەوەی کۆمەڵی کۆیە بنەماڵەکانی حەویزی (بەتایبەتی ئەختەر- ئەمین ئاغای شاعیر) هەروەها غەفووری و مەلاکان باش بوو، بەلام ئەمە نەیتوانیوە لەتیرو توانجی سیستێمی دەرەبەگی و بزووتنەوەی دەروێشیزم، کە هەمیشە لەخزمەتی دەسەلاتی سولتانی عوسمانی بوون ڕزگاری ببێ. لێرەدا شێخ نەبی ماویلی دەوری گرنگی بووە لەبەربەرەکانێ کردنی حاجی و تەنگەتاو کردنی تا پلەیێک وڵات بەجێ بێڵێ و ئاوارەی وڵاتان بێ. ئەم شێخ نەبی ماویلییە مەلایێکی باش بووە، لەرواندز خوێندوویەتی و لەوێ ژیاوە، شێخی تەریقەتی نەقشبەندی بووە، ماڵی لەکۆیە بووە، ئامادە بووە هەرچی خراپە هەیە بیکا بۆ بەرژەوەندی خۆی و دابینکردنی دەوڵەت. بێ گومان هەڵوێستی کەسێکی وا بەرامبەر بەبلیمەت و ڕاستگۆو زیرەک و نیشتمانپەروەر، لەخۆبردوویێکی وەکو حاجی لەکاری خراپە بەولاوە بەرامبەری هیچی دیکە نابێ.

حاجی سەری خۆی هەڵدەگرێ و ڕوو دەکاتە وڵاتی ئاوارەیی، لەئەنجامدا لەئەستەموڵ دەنیشێتەوە، وەکو نالی لەو شارە گەورەیەدا گوم نابێ، لەکوردی دڵسۆزی هاوڕەگەزی خۆی دەگەڕێ، هەندێکیان دەدۆزێتەوە، دیارترینی ئەو کوردانە چەندانێک لەئەندامانی بنەماڵەی بەدرخان پاشا دەبن.

حاجی لە ئەستەموڵ وەکو جووتیارێکی دواکەوتووی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمی کوردستان ناکەوێتە ڕوو، هەروەها وەکو کوڵکە مەلایێکی مردووشۆر نابینرێ، بەڵکو وەک ڕۆشنبیرێکی شارەزاو هۆشیارو دڵ و دەروون پڕ لەهێزی پێشکەوتن و شۆڕشی خۆی دەنواند. لەبەر ئەوە کۆمەڵی تازە پێشکەوتوو لەچاو کۆمەڵە دواکەوتووەکەی خۆی زیاتر ڕێی بۆ خۆش دەکرد شتی تازە فێر ببێ. نزیکی ئەستەموڵ لەئەورووپا ڕێگای بۆ حاجی خۆش کرد بینینی بەرامبەر بە ئەورووپا فراوانتر بێ. ئۆتۆمبێل و شەمەندەفەری لەو وڵاتەدا چاو پێ کەوت، لەنزیکەوە ڕۆژنامەو گۆوارەکانی وڵاتی عوسمانی دەخوێندەوە.

بناغەی بوونی حاجی بەڕۆشنبیرو زانای هاوچەرخ و سیاسی و ستراتیجی و دانا لەکۆیەوە دەستی پێ کرد، لەکوردستانەوە ئەم بیروڕا تازانەی لەلا دروست بوو بوون، بەلام لەوڵاتی عوسمانی لەم لایەنەوە گەلێ شتی تازە فێر

بوو. حاجی کە پشتی لەوڵاتی خۆی کرد تەنیا شاعیر نەبوو، هەڵگری بیرو باوەڕی نوێی دەردەوەی دوازدە عیلمەکەی ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبی بوو، کۆمەڵی تازە یاریدەی دا ئاسۆی بیروڕای مرۆڤایەتی و نەتەوایەتی زیاتر فراوان ببێ، ڕۆژگارانی ماوەی ژیانی حاجی لەوڵاتی عوسمانی زۆر ئاشکرا نییە، راستە ئێمە دەزانین پێوەندی بەبەدرخانییەکانەوە هەبوو، بەڵام لەو سەردەمەدا ئەندامانی بنەماڵەی بەدرخانییان، خۆیان دەستبەسەر بوون چاوی خەفیەو جاسووسی دەوڵەت بەدوایانەوە بوون، لەهەموو هەرێمەکانی کوردستانی گەورە بلاوبوو بوونەوە هەروەها لەئەستەمووڵ و شارەکانی سووریاو قاهیرەی میسرو جێگەی دیکە دەبینران، زیاد لەسەر ئەمە لەمەڵبەندی خۆشیان جزیری بۆتان دەژیان، جا ئێمە ئەوە دەزانین زۆربەی ژیانی ئەو وڵاتەی حاجی لەگەڵ ئەواندا لەئەستەمووڵ بوو، بەڵام ڕەنگە لەجێگای دیکەش لەگەڵیاندا ژیا بێ، جێی وەکو جزیری بۆتان.

سەرچاوەی هەرە گرنگ بۆ ڕوونکردنەوەی ژیانی حاجی شیعری خۆیەتی، چونکە تەنیا شیعری دڵداری نەوتووە، بەڵکو چۆتە ناو ناخی یانی کۆمەڵایەتی نەتەوەکەیەوە، بێ گومان ئەم جۆرە شیعرانە زانیاری زۆر بەدەستەوە دەدەن، لەبەر ئەوە پێویستە بایەخ بەم جۆرە بەرهەمەی شاعیر بدرێ. هەر چۆنێ بێ لەدوای تەمەنێکی درێژ زۆربەی بۆ خۆی نالەباری بوو، بۆ نەتەوەی بەختیاری بوو لەئەستەمووڵ لەساڵی ١٨٩٧ کۆچی دوایی کرد. واباوە لەئەستەمووڵ نێژراوە، بەڵام گۆڕی پیرۆزی دیار نییە. ڕۆژنامەی "کوردستان"ی قاهیرە لەژمارە سێیەمی (٢٠ی مایسی ١٨٩٨) بەهۆی تێپەڕبوونی ساڵێک بەسەر کۆچی دوایی حاجی هەواڵی مردنی بلاوکردبووەوە.

### شیعری حاجی

#### حاجی لە نامەخانەی کوردیدا

لەڕۆژنامەی "کوردستان- ١٨٩٨"ەوە تارۆژی ئەمڕۆ ڕۆژنامەو کۆواری کوردی نییە شیعرو پێناسینی لەبابەت حاجییەوە بلاو نەکردبێتەوە. ئەوانەی لەسەریان نووسیوە گەلێ زۆرن. لەم ماوەیەدا ناوی ئەو کەسانە دەهێنرێ، کە کتێبیان لەسەر داناوە یا وتارو باسی درێژیان لەسەر نووسیوە. لەوانە: ئیحسان فوئاد، ڕەشید فەندی، ڕەفیق حیلمی، عەبدولسەتار تاهیر شەریف، عەلائەدین سەجادی، سەردار حەمید میران، کەریم شارەزا، مەسعوود محەمەد، محەمەدی مەلا کەریم.

لەبابەت بلاوکردنەوەی دیوانی شیعری حاجی تائێستا ئەم چاپانە کەوتوونەتە ناوەوە:

١- کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی، چاپ و بلاوکەرەوەی، عەبدولڕەحمان سەعید، بەغدا، ١٩٢٥.
٢- دیوانی حاجی قادری کۆیی، گردو کۆکەرەوەو بلاوکەرەوە، گیو موکریانی، هەولێر، ١٩٥٣.
٣- دیوانی حاجی قادری کۆیی، گردو کۆو پەخشکار، گیو موکریانی، هەولێر ١٩٦٩.
٤- دیوانی حاجی قادری کۆیی، لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی، سەردار حەمید میران و کەریم مستەفا شارەزا، بەغدا، ١٩٨٦.
٥- هەنگاوێکی تر بەرێگادا بەرەو ساغکردنەوەی دیوانی حاجی قادری کۆیی، محەمەدی مەلا کەریم، بەغدا، ١٩٨٩.

### کێشی شیعری حاجی

شیعری حاجی هەمووی لەسەر کێشی بەحرەکانی عەرووز هۆنراونەتەوە. شاعیر بەهیچ جۆرێ بایەخی بەوە نەداوە کێشی زۆربەی شیعرەکانی هەبێ. لەشیعریدا ئەم کێشانە دەبینرێن: هەزەج، ڕەمەل، موزاریع، موجتەس، موتەقاریب، خەفیف، سەریع. لەو سێ کێشەی دوایی لەهەر یەکێکیان تەنیا شیعرێکی هەیە، ئەوانی دیکەش بەگشتی زۆربەی هەرە زۆریان لەسەر کێشی بەحری هەزەج و ڕەمەلن.

### قافیەی شیعری حاجی

یەکێ لەخاسیەتە هەرە گرنگەکانی شیعری حاجی ئەوەیە یەکەمین شاعیرێکی کلاسیکیە شۆڕشێکی لەشیعری عەرووزی ئیسلامەوی (کوردستانی باکوور- جزیری، کوردستانی باشوور- نالی) نایەوە. ئەوەی ئاشکرایە لەو قوتابخانە کلاسیکییەدا غەزەل و قەسیدە دەبوو یەکێتی قافیەی تێدا بێ. لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمدا، واتە نەوەی دوای نالی هەندێ شاعیر هەوڵیاندا

لەسنوورێکی تەسکدا غەزەل و قەسیدە لەسەر بنچینەی جووت قافیە (مەسنەوی) بنووسن، بەڵام حاجی گۆڕانێکی بنچینەیی تێدا کرد، بەوەی نزیکەی سێیەکی دیوانی شیعری بریتییە لەجووت قافیە (مەسنەوی). ئەوە ئاشکرایە لەپێشانا ئەم جۆرە قافیەیە تەنیا بۆ چیرۆکی شیعری بەکار دەهێنرا وەکو ئەحمەدی خانی لەم "مەم و زین"دا کردوویەتی، کەچی غەزەلەکانی هەموویان لەسەر بنچینەی یەکێتی قافیە دامەزراون. بەم جۆرە دەتوانین دیوانی حاجی لەڕووی قافیەوە بکەین بەدوو بەشەوە:

١- یەکێتی قافیە

ئەم جۆرە شیعرە ئاساییە وەکو هەموو شاعیرانی دیکە یەکێتی قافیەیان تێدایە، حاجی بەشێکی زۆر کەم لەدەنگەکانی ئەلفوبێی زمانی عەرەبی لەو شیعرانەدا بەکارهێناوە. دەنگەکان ئەمانەن: ا، ت، ر، س، ک، م، ن، و، هـ، ی، ێ.

٢- شیعری جووت قافیە (مەسنەوی)

بەشێکی زۆر لەبەرهەمی شیعری حاجی لەڕووی قافیەوە لەم بابەتەیە، هەر ئەمانەش دەبن بەڕەمزی نوێکردنەوەی شیعری حاجی، چونکە ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی و نیشتمانپەروەری و کوردایەتی و سیاسی زیاتر لەگەڵ ئەم جۆرە شیعرە دەگونجێن، ئەگەرچی حاجی شیعری یەکێتی قافیەشی بۆ مەبەستی ناوەڕۆکی سیاسی بەکارهێناوە.

## نالی لەشیعری حاجیدا

دیوانی حاجی ناوی کۆمەڵێک لەشاعیرانی ناوچە جیاوازەکانی کوردستان و رۆژگارە کۆن و نوێکانی مێژووی کورد دەور دەکاتەوە. جگە لەوە درێژترین شیعری (بریتییە لە ٧٩ دێڕ) لەسەر شێوەی جووت قافیە دانراوە تایبەتییە بۆ یادی کۆمەڵێک لەشاعیرانی کورد لەو بەرهەمەیدا ناوی هێناون. لەم شیعرەو لەسەرانسەری دیوانیدا حاجی بایەخێکی تایبەتی بەنالی داوە، لەهەموویان زیاتر یادی دەکاتەوە، چونکە بەشاعیری هەرە گەورەی کوردی دەزانێ. لەشیعرێکیدا دەڵێ:

**ئەو کە نۆشی شەرابەکی تالی**
**(نالی) لەو عەرسەدا بووە تالی**
**(نالی) ئوستادەکی گەلێ چا بوو**
**خدری ئابی حەیاتی مەعنا بوو**

مەبەس لە "ئەو" مستەفا بەگی کوردییە لەدێری پێشتر باسی لێوە دەکا، واتە مستەفا، حاجی ئەوەندە گیرۆدەی نالییە بەسلێمان پێغەمبەری دەچوێنێ و بەخاوەن دیوان و فەرمانی دادەنێ، دیارە کەس ناتوانێ بێتە مەیدانی ئەوەوە حاجی نەبێ.

ئەستووری بیروڕای حاجی بەرامبەر بەنالی ئەوەیە کە دەڵێ:

**سەد قوبەیی خەوەرنەق و سەددی سکەندەری**
**ناگاتە بەیتە کاولی (نالی) و مەتانەتی**

بەلای حاجییەوە هیچ موعجیزەیێک ناگاتە شیعرە بەرزەکانی نالی. بەگشتی ئەمە تەنیا هەڵوێستی حاجی نییە بەرامبەر بەشاعیری گەورە، بەڵکو بیروڕای هەموو شاعیرو خوێندەوارو رۆشنبیرێکی کوردە لەدوای نالی ژیاون.

### یادی شاعیرانی کورد

گیانی کوردایەتی هەمیشە حاجی هان داوە هۆگری سامانی نەتەوایەتی بێ، شانازی بەڕابردووی نەتەوەی خۆیەوە بکا. سەر بڵند بووە بەوەی گەلێ پیاوی ماقووڵ و سەرکردەی سوپایی و زانای هۆشیارو شاعیری بەرزی لێ هەڵکەوتووە، بەتایبەتی بایەخی بەشیعر داوە. لەوانەیە ناوی هەموو ئەو شاعیرانەی هێنا بێ، کە ناویانی بیستووە، یا چاوی پێ کەوتوون، یا شیعریانی خوێندۆتەوە. جگە لەوەی رەنگدانەوەی ئەم هەموو دیاردانە لەسەرانسەری شیعریدا دەبینرێن بەڵام درێژترین شیعری ناو دیوانی بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کردووە.

سەرەتا بەم شیعرانە دەست پێ دەکا:

**شەهسواری بەلاغەتی کوردان**
**یەککەتازی فەساحەتی بابان**
**مستەفایە تەخەللوسی (کوردی)**
**غەزەلی کوردە بەربوتی کوردی**
**ناوی ساحێبقرانی خاسی ئەوە**
**چونکە لەم عەرسە ئەسپی ئەو بەدەوە**

لەهەندێ دێڕی دیکەی شیعرەکەدا دەڵێ:

**دەشتی کەرکوک و کێوی هەورامان**
**شاعیری زۆرە بێ حەددو پایان**
**سادە هەر ناویان بکەم ئیملا**

**ئەم كــتـــێـــبـــە بچـــووكـــە بەش ناكـــا**
**هەر لـەشـــــێـــــــــــرازەوە هـەتا بـابـان**
**پاكی یەک نەزمـــە پـێی دەڵـێن گـــۆران**
**هەر لـەمـــــووسڵ هەتا حـــــەددی بـابان**
**بەیتـــێـــــان كـــردووە وەكـــو جـــافـــان**

بەم دێرانەش حاجی كۆتایی بەشیعرەكەی دێنێ:
**كــــەچی ڕۆمی كــــە ئێـــمـــــە دەیناسێ**
**وا دەزانێ كــــە ئێـــمـــــــە نەسناسێ**
**یانە ئێـــرانی یەک كـــــە مـــــەعلومـــــە**
**دایكی مـــوتعــــە باوكی مـــــەوهوومــــە**
**ئەمــــــە دەیكاتە كـــــاســــــە دەینۆشێ**
**ئەو كـــــەوای لێ دەكـــات و دەیپـــۆشێ**

لەم شـــیـــعـــرە درێژەیدا حـاجی یادی ئەم شـاعـــیـــرانە دەكاتەوە: مستەفا بەگی كوردی، نالی، محەمەد فیكری، ڕەنجووری، ئەمین بەگی دزەیی، كـەیفی، سـالم، مـەشـوی (نازناوی مـەحوی بووە)، شـێخ ڕەزا، خەسـتـە، وەفـایی، مەلكەقۆر، حیماری، كیسە شكەل (ئەم سێیانەی دوایی لەشاعیرە جەربەزەكانی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم بوون لەكۆیە).. شێخ ئەحمەدی جزیری، ئەحمەدی خانی، فەقێ تەیران، شـێخ خـالیـدی نەقـشـبـەندی، عـەبدولڕەحـمـان خـالیـسی، مـەلا عـەبدوڵڵای بێـتـووشی، مـەولەوی، مـەلا مـسـتـەفـای بێـسـارانی، مـەلا خدری ڕوودباری، مـیـرزا یەعقوب، حەسەن، فەقێ ئۆمەر، ئەحمەد بەگی كۆماسی، مـیـرزا مـحـەمـەدی دەربەند فـەقـرە، عـەلی هەریری، عـەلی بەردەشانی، ئەحمەدی كۆر.

حاجی كە ناوی سێ شاعیرە جەربەزەكەی هێناوە دەڵێ شـیـعـریـان جـوانە، چونكە كـوردن، بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا بەدناوو گەلێ وردن. ئەم جۆرە شاعـیـرانە لەناو میللەتانی دیكەش هەبوون، لەئەوروپاو لەناو عەرەبانیشدا سوعلووک و سەعالیک (صعلوک، صعالیک)یان پێ دەوتن.

ئەم شـیـعـرەی حـاجی دەچێـتـە ناو شـیـعـری فـێـركـردن و پەروەردەیی (دیداكـتی)، زمـانی شـیـعـری مـیـللیـیـانەیە، حاجی بایەخی بەكێش و قافیە نەداوە، ماكی جوانكاری تێیدا لاوازە، مەبەسی شاعیر بیروڕایە، چێژو خەیاڵ نییە.

**نموونە كلاسیكییەكانی شیعری حاجی**

لێرەدا باس لەحاجی دەكرێ وەكو نوێنەرێكی بلیمـەتی قوتابخانەی شیعری كلاسیكی كوردستانی باشوور، دوور لەهەمـوو نوێكردنەوەو بەرپاكـردنی شـۆڕشـێكی بیـری و هونەری لەشـیـعـری كۆنی كـوردیدا. ئەوی ڕاسـتی بێ ئەو بەشـە شـیـعـرەی لێـرە باسی لێـوە دەكرێ بۆتە هۆی ئەوەی بەشاعیری گەورە لەقەڵەم بدرێ، لەوە بترازێ لەشیعرەكانی دیكەیدا نیشـتـمـانپـەروەرو كوردپەوەرو زاناو داناو سیاسی گەورەو دڵسۆزێكی بێ هاوتای نەتەوەكەیەتی.

لەم بەشـە شـیـعـرەیدا حـاجی لەمـەرجـەكـانی شـیـعـری لاسـایی نەچۆتە دەرەوە، بەڵام ئەوە هەیە گـۆڕانی بەسـەردا هێناوەو پێـشی خـسـتـووە لەڕووی داهێنانی هونەری و ئیستێتیكییەوە. بێ گومان شیعری لەم لایەنەوە كەمە، ئەویش لەبەر ئەوەیە لەنیـوەی زیاتری بەرهەمی شـیـعـری دەچێتە ناو تازەكەوە، كە لەدواییدا باسی لێوە دەكرێ. بەم پێـــە ئەگـەر شـیـعـرە نوێكانی نەبوونایەو هەمـوو دیوانی لەسەر سیستیمی شیعری كلاسیكی لاسایی بڕۆیشتایە دیوانی بە قەوارە دەگەیشتە دیوانی شاعیرانی پێش خۆی.

- لەم ماوەیەدا باس لەناوەڕۆكی شیعری كلاسیكی حاجی دەكـرێ لەگـەڵ هێنانەوەی بەڵگەو نموونە بۆ مـەبەست و هونەرە شیعرییەكانی.

**ئایینی- ئیلاهییات، موناجات**

حاجی لەشیعری ئایینیدا نەعتی پێغەمبەری نییە، تاكە شیعرێكی موناجاتی هەیە:

**ئەی بێ نەزیرو هەمـــتـــا هەر تۆی كـــە بەرقـــەراری**
**بـێ دارو بـێ دیـاری بـێـــــــــــدارو پـایـەداری**
**بۆ باغی مـــەردی باغی ســـەرمـــایەكـــەی خـــەزانی**
**بۆ مـــەزرەعـــەی فـــەقـــیـــران ســـەرمـــایەكـــەی بەهاری**
**تۆ پادشـــا نیـــشـــانی بۆ هەر ســـەوادی ئەعـــزەم**
**بێ ســـەدرو شـــانشـــینی بێ پەردە پەردەداری**
**خـەلاقی بێ فـوتووری سـوڵتـانی بێ قـوسـووری**
**ڕەززاقی مـــارو مـــووری ئاودێری دێمـــەكـــاری**
**فەیرۆزە تەختی گەردوون مەسنووعی نەقشی تۆیە**
**یاقـــووت و لەعلی ڕۆژە ئەســـتـــێـــرەكـــان دوراری**
**جێ و مـــەكـــانی تۆیە بێ جێ وو بێ مـــەكـــانی**
**لەیـل و نەهـاری تـۆیـە بـێ لـەیـل و بـێ نـەهـاری**
**هەر ئەمـــری تۆ مـــەدارە بۆ كـــاروباری عـــالەم**

ئامینە وەرامی غەزەلەکەی حەسەن دەداتەوە:

**سەلامی یاری ئاوارە لە بەندی تۆقی سولتانی**
**بەدەستی من گەیی قوربان لەوەختی دڵ پەرێشانی**
**سەراپا چون موتالام کرد سەلامی یاری بێ هاودەم**
**دڵە غەمبارەکەم دیسان برینی تازەگی هانی**
**خەرامان و گوڵەندام و زولەیخاو و قەمەر چەهرە**
**وەکو من قەت نەسووتاون لەدووری یارو هیجرانی**

بەگشتی شێوەی دڵداری حەسەن و ئامینە لەدڵداری هەموو کیژو کوڕەکانی میللەتە جیاوازەکانی گیتی دەکا، کەچی شیعرەکەیان کلاسیکی ئاساییە.

## بەشی دووەم
## سافی
## ١٨٧٣- ١٩٤٢

### ژیانی شاعیر

کاک مستەفا کوڕی کاک عەبدوڵڵا کوڕی کاک عەلی کوڕی کاک مستەفای هیرانییە. وشەی "کاک" لەکوردەواریدا بۆ ڕێزلێنان لەپێش ناو بۆ برا گەورە یا هەر کەسێکی ڕێزدار بەکار دەهێنرێ. لەم بنەماڵەیەدا ئەم وشەیە لەباتی مەلا یا شێخ بەکارهاتووە. کاک عەبدوڵڵا باوکی کاک مستەفای شاعیر بووە، نازناوی "سانی- ثانی"یە، لەساڵی ١٩٠٦ لەگوندی هیران کۆچی دوایی کردووە. لەم کتێبەدا وەک شاعیرێک باسی لێوە کراوە.

کاک مستەفا لەساڵی ١٨٧٣ لەگوندی هیران لەدایک بووە. ئەم ئاواییە ماوەی ٢٢کم بەلای کۆیەوە لەشەقڵاوە دوورەو خوێندنی بەرایی لای باوکی بووە، لەدوایدا بەشێکی خوێندنی لەحوجرەی مزگەوتەکانی کۆیەو هەولێرو ڕواندزو گوندی سەران بردۆتە سەر. ئینجا لەلاجان و سابلاغ (مەهاباد) و گوندی پەسوێی کوردستانی ئێران، بەشێکی دیکەی خوێندنی مەلایەتی تەواو کردووە. کە تەمەنی دەوروبەری سی ساڵی بووە کاک عەبدوڵڵا (سانی) باوکی کۆچی دوایی کردووە، ناچار بووە دەست لەخوێندن هەڵبگرێ و ببێ بەجێنشینی باوکی و کاک مستەفای هیرانی ناوبانگ دەربکات. ئیتر لەپاش ئەمە کاری دیاری دەکرێ و دەبێ بەشێخی تەریقەتی قادری و وەک مورشیدێک تەکیەی قادری هیران بەڕێوە دەبا. لەو ماوەیەدا وەک شاعیرێک نازناوی سافی (صافی) بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ. ئەم وشەیە بەمانای دڵپاکی و خاوێنی بیروباوەڕ هاتووە، بێ گومان وەک زاراوەیێکیش پێوەندیی بەئیدیۆلۆجییەتی سۆفیزمەوە هەیە.

لەکۆنەوە لەگوندی هیران حوجرەی خوێندنی مەلایی و شەریعەت مێژوویێکی بووە. لەسەردەمی ژیانی سافی لەلایەن خۆیەوە سەرپەرشتی کراوە. هەندێ جار مەلای ناودار لەو قوتابخانە ئایینییە وانەی زانستییەکانی ئیسلامی و زمانی عەرەبییان وتۆتەوە. هەندێ لەمەلا گەورەکانیش لەهیران خوێندنیان تەواو کردووە. سافی لەو شێخانە بووە تەریقەتی لەگەڵ شەریعەت گونجاندووە. بۆ ئەم مەبەسە گەشتی بەغدای زۆر بووە بۆ زیارەتی تەکیەی شێخ عەبدولقادری گەیلانی. لەتەک ئارامگەی شێخ خەلوەتی کێشاوە.

سافی کەسێکی کۆمەڵ حەز بووە، دۆست و برادەری گەلەک بوون. لەناو هەموو توێژەکانی کۆمەڵدا ناسراو بوو. جگە لەدەروێش و مریدی تەریقەتی قادری لەگەڵ شاعیرانی هاوچەرخی خۆی پێوەندیی بووە، بەتایبەتی بێخودو خادیم و هی دیکە.

سروشتی هیران لەهەموو کەژەکاندا دڵڕفێنە. لەناوچەکەدا خەڵکی کە هیران و نازەنین دێننەوە یاد دوو گوندی خۆرسک دێتەوە بیریان. ئەمانە چێژی گوشادی و خەیاڵی شیعری دەدەن بەئادەمیزاد. هەر ئەم سروشتە جوانەشە لەداروبارو درەخت و گوڵ و گوڵزاری ڕەنگین و

مـیـودی بەتام و ئاوی کـانی و جـۆباری زوڵاڵ ئەو چێـژە جوانەی بەخشیوەتە سافی و کەسوکاری و چەند شاعیریان لێ هەڵکەوتووە. سافی ئاشقی کەو بووە، ڕاوە کەوی پێ خۆش بووە، بەڵام نەیکوشتـووە، بەڵکو بەخێـوی کردووە وەک هەوەسێک بۆ رابواردن. بەمە بووە بەکەوناس. جگە لەمە مەراقی گۆرانی و ئاواز بووە، لەگەڵ گـۆرانیبێـژو دەنگخـۆشـان دۆست بووە. غـەزەلی کـۆنی کـلاسیکی و دەنگی خـۆش و ئامێرەکانی مۆسـیقای وەکو دەف و تەپڵ لەئاهەنگی مەولوود یا هەر ئاهەنگێکی دەروێشی هەوەسی سافی بووە، بۆیە لەگەڵ گۆرانیبێژانی سەردەمی خۆی نزیک بوودو خۆشیانی ویستووە، بەشێ لەشیعری کراون بەگۆرانی و دەنگ و ئاواز بێژراون.

سـافی ژیانێکی نەرمـونیـانی بێ گـرێی بردۆتە سـەر، رۆژگـار بەدڵی ئەوو لەسـەر ویست و ئارەزووی بووە، لەو مەڵبەندە خۆش سروشتەی بۆ کەم کەس رێک کەوتووە. شاعـیر لە ١٢ی شوباتی ١٩٤٢ کـۆچی دوایی کـردووەو لەهیران نێژراوە. لەدوای خۆی کوڕی گەورەی کـاک عەلی بووە بەجێنشین و مورشیدی تەکیەی قادری لەهیران. ئەم کـاک عـەلییـە شاعـیر بوو، نازناوی "سـەفـوەت" بووە، لەساڵی ١٩٧٧ کۆچی دوایی کردووە.

**شیعری سافی**

**شیعری سافی لەڕووی ڕوخسارەوە**

سـافی یەکێکە لەو شاعـیرانەی پێڕەوی مـەرجـەکانی شیـعری کـلاسیکی کـردووە لەبابەت ڕوخسـارەوە. زۆربەی شیعرە لیریکییەکانی لەحەوت دێڕ پێک هاتوون، ئینجا نۆ دێڕە شیـعری. دیوانی شاعـیر تەنیا قـەسیـدەیێک دەور دەکاتەوە لەبیست و شەش دێڕ پێک هاتووە، قافیە (ە - د)یە.

ئەو بەحـرە عـەرووزیـیـانەی شـاعـیـر بەکـاری هێناون ئەمـانەن: هەزەج، ڕەمەل، ڕەجەز، مـوزاریع، مـوتەقـاریب، زۆربەی هەرە زۆری شیـعـرەکـان لەسـەر بەحـری هەزەج و ڕەمەل ڕێکخراون. قـافیـەی شیـعری سافی لەسـەر چەند دەنگێکی ئەلفوبێی کوردی دامەزراوە، وەکو: ا، ت، م، ر، ن، و، (ە-د) ی. لەمەدا ئەوە دەردەکەوێ شاعیر بەشێکی کـەمی لەهەمـوو دەنگەکـانی ئەلفـوبێی کوردی و عـەرەبی بەکـارهێناوە. هەروەها دەنگە تایبـەتیـە عـەرەبیـیـەکـانی وەکـو: پ، ط، ظ..هتـد، کـوردییـەکـانی وەکـو: پ، ژ، گ..هتد بەکاری نەهێناون.

لەدیوانی سـافی مـولەممەعـێک بەرچاو دەکـەوێ بەچوار زمانی کوردی و تورکی و عەرەبی و فارسی وتوویەتی:

**ئەی بادی سـەبا هەسـتـە لەحـاڵم بەوە هوشـیـار**
**شـەرحی دڵی مـاتەمـزەدەکـەی من بەرە بۆ یار**
**لەو فـیـرقـەتی ئەو وا ڕەمـەقێ مـاوە لەعـومـرم**
**ئومێـدی حـەیاتم نیـیـە ڕووحم نەبێ غـەمـخـوار**
**(اجیـغلە دشدی شو غـریب گـوگلمـە هیـهـات)**
**(وصلنلە نجـات بو لمسـە بیـچـارە کـیـمی وار)**
**(کـیـمـسـە صـورەمـز علت عـشـاقنە هرگـز)**
**(تیـمـارە سنک بشـقـەسی یوق زمـرەڕ بیـمـار)**
**(لا أمنع عن قـــربک من لومــــە لائم)**
**(أن أصـبـر فی بعـدک قـد أحـرق بالنار)**
**(لو جـسـمی بعـیـد لک فـالروح قـریب)**
**(إن ترحم بالروح وأن تقـتل فـاخـتـار)**
**(من مـسـتم أز ان بادە، صـهـبـاء تو لکن)**
**(این سـر تو در جلوەگـهی عـشق تو هشـیـار)**
**(کـاشـانە، لاهوت بود لائق ان کس)**
**(مـال وسـر وجـانش کـە نهـادە بەرە یار)**
**خۆی کوردییە (سافی) لەهەوای عیشقی تۆ ئێستێ**
**کوردی و عـەرەبی و فارسیی و تورکی بووە ئەشعار**

ئەم لیـریکە لەنۆ دێرە شیـعـر پێک هاتووە، دوو دێڕی سـەرەتاو دێڕی دوایی بەزمـانی کـوردین، شـەش دێڕەکـانی دیکە دووانی یەکەمیان تورکی و دووانی دووەمیان عەرەبی و دووانی سێیەمیان فارسییە.

لەم مـاوەیەدا سـەرتاپای شـیـعـرەکـە جـارێکی دیکە دەنووسرێتەوە بەوەرگێڕانی دێڕە بێگانەکان بۆ زمانی کوردی

**ئەی بادی سـەبا هەسـتـە لەحـاڵم بەوە هوشـیـار**
**شـەرحی دڵی مـاتەمـزەدەکـەی من بەرە بۆ یار**
**لەو فـیـرقـەتی ئەو وا ڕەمـەقێ مـاوە لەعـومـرم**
**ئومێـدی حـەیاتم نیـیـە ڕووحم نەبێ غـەمـخـوار**
**(درێغ بـۆ ئـەو دڵـە ئـاوارەیـەی کـە تـۆراوە)**
**(بێچارە کێی هەیە! تەنیا بەدیداری یار دەگاتە ئامانج)**
**(لەهیچ کـاتێکدا کـەس لەدەردی عـاشـقـان ناپرسێ)**
**(بەرەی نەخۆشان لەتیمارکردن بەولاوە هیچیان ناوێ)**

**(لەتۆوە نزیک بم باکم لەلۆمەی خەڵکی نییە)**
**(ئەگەر لەدووری تۆ ئارامم بێ بەئاگر دەسووتێم)**
**(ئەگەر لەشم لەتۆوە دوور بێ گیانم لەتۆ نزیکە)**
**(بەزەیی هاتن بەگیانم یا کوشتنم بەدەست تۆیە)**
**(من مەستم لەو بادەی سەهبای تۆیە بەڵام)**
**(ئەم نهێنییەی تۆ لەجێی جیلوەی عیشقت بەهوشیاری ئاشکرا دەبێ)**
**(مەنزلی لاهووت "خواوەندی" لایقی ئەو کەسەیە)**
**(ماڵ و سەرو گیانی خۆی بخاتە بەر پێی یار)**
**خۆی کوردییە (سافی) لەهەوای عیشقی تۆ ئێستێ**
**کوردی و عەرەبی و فارسیی و تورکی بووە ئەشعار**

جگە لەمولەممەع دیوانی شاعیر کۆمەڵێک قەسیدەی چوارین (اااا، ب ب ب ا، جـ جـ جـ ا) و قەسیدەی پێنجین (ااااا، ب ب ب ب ا، جـ جـ جـ جـ ا) دەور دەکاتەوە، هەروەها سافی پێنج خشتەکی هەیە لەسەر غەزەلی ناری و عەونی، هەرچی شیعری خۆشیەتی شاعیرانی وەکو نووری و سەفوەت و لۆلانی و ئەنوەرو جەریحی و بەرزنجی و عەونی و بەندی، بێبەش کردوویانە بەپێنج خشتەکی.

### شیعری سافی لەڕووی ناوەڕۆکەوە

بەگشتی شیعری سافی لەڕووی ناوەڕۆکەوە دلداری و وەسف چوونەتە ناو یەکتری، هەندێ جاریش بەتەنیا دەکەونە روو، شاعیر دڵبەرو یارێکی دیاریکراوی نییە. سیفەتی ژن و پیاو لەدلدارییەکەیدا بەرچاوە. سافی هەوڵ دەدا خۆشەویستەکەی ناو گێتیی سوفیزمەوە، بەڵام نەچۆتە ناو ناخی چوارچێوەی سۆفیزم و داهێنانی نییە، شێوازی رۆمانتیکییانەو سیمبۆلییانەی جەلالەدینی رۆمی و مەلای جزیری و مەولەوی، بەڵکو لەوەسف و پێ ناسین و لێکدانەوەو بەکارهێنانی زاراوەی سۆفیزم سەرکەوتووە.

سافی بەلای مەبەسەکانی دیکەی شیعری کلاسیکی نەچووە، وەک موناجات و ستایش و داشۆرین و ئەوانی دیکە. زاراوەو لێکسیکۆنی سۆفیزم لەشیعریدا ئەگەر بەگشتی مانای شیعری لێک بدرێتەوە زیاتر دەشکێتەوە سەر عیشقی مەجازی و عیشقی حەقیقی. هەر چەندە تەریقەتی لەگەڵ شەریعەتدا گونجاندووە، کە بەڕاستی تەواوکەری یەکترین، بەڵام تا ڕادەیێک شەریعەتی پشتگوێ خستووە.

سافی شاگردێکی زیرەکی قوتابخانەی نالییە. کاری مستەفا بەگی کوردی زیاتر ئاشکرایە بەسەر هەندێ لەشیعرەکانی، دەڵێی ئەو ئامێرە مۆسیقییانەی ئاوازی شیعری کوردی داناوە هەر ئەوانەن سافیش بەکاری هێناون. سەرەڕای ئەم هەموو جوانکارییەی لەشیعری سافی کۆبوونەتەوە یادی شێخ عەبدولقادری گەیلانی سەراپای دیوانی داگیر کردووە.

### نموونەی شیعری سافی

ئەدگارو خاسیەتی شیعری سافی لەمەبەسی غەزەلی دلداری و وەسف نەچۆتە دەرەوە، شێوازی لاساییکردنەوەی قوتابخانەی غەزەلی نالییە، لەڕووی ڕوخسارو ناوەڕۆکەوە، وەک قوتابییێکی زیرەکی ئەو قوتابخانەیە. سافی یەکێکە لەشاعیرانی نەوەی دوایی سێیەمی ئەو قوتابخانانەیە و لەناوەڕاستی سەدەی بیستەم نوێ کراوەتەوە.

لەغەزەلێکیدا بەم شێوەیە هەستی گیانی خۆی دەردەبڕێ:

**دڵ لە بۆ مەحبووبە ئێستا گریەوو زاری دەکا**
**وا لە هەردوو چاوەکانی خوێن و ئاو جاری دەکا**
**وا سەراسەر ڕووی زەمینی گرتووە خوێناوی ئەشک**
**دووری ئاهیش ڕۆژی پۆشی وئاسمان تاری دەکا**

لەکۆتاییدا دەڵێ:

**قەت مەڵێن یار بێ وەفایە وا بەناحەق دەیکوژێ**
**بیکوژێ یا نەیکوژێ (سافی) فیداکاری دەکا**

ئەم یارەی شاعیر هەیوولایێکی نادیارو بێ ناسنامەیە. لە بەشی یەکەمی غەزەلەکەدا شاعیر پەرێشانە لەبەر دووری ئەو یارە، گریان و فرمێسکی خوێنین، دووکەڵی ئاه و هەناسەی ئاسمان دەکا بەتاریکستان. ئەگەر لێی بپرسێتەوە دەگەشێتەوە، بەڵام کەی یار ئاوڕ لەعاشقان دەداتەوە! شاعیر هەوڵ دەدا شێوازێکی سۆفیزم بئاخنێتە ناو شیعرەکەوە، کە باس لەڕێوڕەسمی شەریعەتی ئیسلام و زیناری (پشتێندی) مەسیحییان دەکا. دروێ لەیار سەرچاوەی ئیلهامی شاعیرە:

**لەبەر مەیلی مەیی عیشقی تووە یاری وەفادارم**

**لەتەکیەو خانەقا دەرچووم خەریکی دەیرو زیننارم**
**لەحوببی تۆ لەلای ئەو عالەمە کافر بووم گەرچی**
**کە نازانن لەعەینی کوفرەوە ئیسلامییە کارم**
**ئەگەر سەد جار دەرم کەی قەت بەبێ تۆ سەبرەکم نایێ**
**بەزۆری دێمەوە دەرگانەکەت ئەی دۆست ناچارم**
**لەبەدکرداری من ڕوو وەرمەگێڕە ئەی شەهی خووبان**
**کەتۆ ڕوو وەربگێڕی کەس نییە گەر بێتە غەمخوارم**
**لەدووریت لەززەتی من پایە مالی زیللەتە هەردەم**
**حەیاتم بێ جەمالی تۆ مەماتی ژینە ئەی یارم**
**ئەگەر شەمعی ویسالی تۆم نەبێ ڕۆژم شەوی تارە**
**بینایی نووری چاوانم ئەتۆی ماهی زیادارم**
**ئەوەندەم عیجزو شادی وەسڵ و هیجران دیوە ئەی یاران**
**لەڕۆژی حەشردا ئەسلا نەحاجەت جەننەت و نارم**

ئەم غەزەلەش وەکو ئەوەی پێشوو لەبزووتنەوەی ناوەوەو سەربەستیی بیر دەدوێ. سافی دڵداری دەکا بەبەهانە لەپێناوی عیشقی یار. لە تەریقەت لادەکەوێ نەک تەنیا قادری کە تەریقەتی خۆیەتی، بەڵکو لەنەقشبەندی و لەتەکیەو خانەقاشیان دوور دەکەوێتەوەو دەبێ بەمەسیحی. شاعیر ئاماژەی هەیە بۆ دڵداری خوسرەوی پەروێزو شێخی سەنعان، ئەوانە کەوتبوونە ناو داوی دڵداری کچە مەسیحی. بەلای سافییەوە ئەگەر لەبەر دڵداری دیانیشی پێ بلێین کاردسات دروست نابێ، چونکە لەڕاستیدا موسوڵمانە، هەردوو ئایینیش باوەڕیان بەخودا هەیە.

وێنەکانی دیکەی ئاسایین لەشیعری کلاسیکیدا، وەکو ڕوو وەرگێڕانی دلبەر لەدڵدار، دەرکردنی، دوورکەوتنەوە لێی، دلبەر نازانی، نزیکبوونەوەی لەدڵدار ڕووناکییە بۆی. شاعیر ئەوەندە خۆشی و ناخۆشی دیوە پێویستی بەبەهەشت و دۆزەخ نییە. بینینی یار یا جیلوەی کردگار (بینینی کردگار) وا هۆشی شاعیری بەنج کردووە دەمێ بێدارو دەمێ هوشیارە. لەم هەڵوێستەدا ئاماژە هەیە بۆ موناجاتی مووسا لەسەر کێوی توور (حۆریب). نووری خودا دەبینێ و خۆی نابینێ.

ئەو ئاماژە سوفیزمییانەی سافی ناچنە ناو داهێنانی ڕۆمانتیکی- سیمبۆلی ئەدەبی سۆفیزمەوە، بەڵکو وەسف و لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەی هەندێ لەئەدگارو سیماکانیەتی.

"بێ تۆیی" واتە دووری، دووڵی و بێ ئۆقرەیی هەموو کات و سەردەمێکی سافییە، لەغەزەلێکیدا موناجات لەگەڵ یار دەکا:

**حەبیبا دڵ گەلێ بیمارە بێ تۆ**
**لەبەر دووریت لەڕووح بێزارە بێ تۆ**
**فەرامۆشی نییە بەو خەڵکە ئیستێ**
**لەلای نەقشێکی ڕووی دیوارە بێ تۆ**
**هەمموودەم وا لەگۆشەی بێکەسیدا**
**بەشێن و زاریی و هاوارە بێ تۆ**
**ئەگەر فەرمووی چلۆن ماوە ئەمێستێ**
**لەئەم سەگ مەرگییە بێعارە بێ تۆ**
**شەوی هیجران لەبەختی دڵ درێژە**
**کەڕۆژی تالیعیشی تارە بێ تۆ**
**کە شادی دوژمن و غەم دۆستە قوربان**
**جەفا یارو وەفا ئەغیارە بێ تۆ**
**غەمی خۆی بەس بوو (سافی) وا ئەمیستێ**
**دڵی غەمباریشی سەربارە بێ تۆ**

ئەم غەزەلەی سافی لە کێش و قافیەی غەزەلێکی نالی هۆنراوەتەوە "نەمردم من ئەگەر ئەم جارە بێ تۆ.." لەم شیعرەدا سافی لەناو خەیاڵی نالی تواوەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەستدرێژی نەکردۆتە سەری، بەڵکو بووە بەسەرچاوە بۆ داهێنانێکی نوێ. بەم جۆرە لیریکێکی ناسکی مانا لەڕووی لێ دروست بووە، وەکو شیعرەکەی نالی.

لەغەزەلێکیدا بەسەرهاتی دڵداریی خۆی لەگەڵ جوانی یووسف و عیشقی زولەیخا بەراورد دەکا:

**عەزیزێکم هەیە ئیسم و بەجیسما یووسفی سانی**
**هەزاری وەک زولەیخا حەبسی نێو چاهی زەنەخدانی**
**لەسەد فەرسەنگەوە بۆ چاوی نابینا ژیان بەخشە**
**هەزارانی وەکو یەعقوب لەبۆنی عەتری زولفانی**
**لەنێو خاکی عەجەم تاکو عەرەب سەرحەددی ڕۆم و کورد**
**شەهی وا نابێ ئەسلا ساحیبی موهری سلێمانی**
**بەئینساف گەر تەماشاکەن سەراسەر عەیبی لێ نایێ**
**جەمالی یاری من بۆ ئەهلی دڵ گەنجێکە پەنهانی**
**لەبۆ فەرمانی یارم هەرچی گەردن کەچ نەبێ یاران**
**لەژێر پێی جەهلەوە سەر دادەنێ وەک شێخی سەنعانی**

**مەتافی سالیکان و ڕەهنوماوو کەعبەیی عوششاق**
**دەربازی خودا کانی وەفا سولتانی گەیلانی**
**ئەگەر سولتانی دونیا بێ گەدای دەرگانەکەی تۆیە**
**بەنازی خۆت نیازی پێ کەرەم کە (سافی) هیرانی**

لەم شیعرەدا سافی باس لەیارە عەزیزەکەی دەکا. وەک دیارە ئاماژەیە بۆ عەزیزی میسریش (بووتیفار). ئەم خۆشەویستەی لەپەیکەری یووسف بەرجەستە بووەو ناوی ناوە یووسفی دووەم، یەکەمەکەیان زولەیخای ژنی عەزیزی میسر گرفتاری بووە، لەلایێکی دیکەوە ئاوڕ لەپێوەندیی باوک و کوڕ، یەعقووب و یووسف دەداتەوە. ئەگەر لەجێگەیێکی یەکجار دوورەوە بۆنی یووسف بێ هەزاران کوێری وەکو یەعقووب چاویان دەکرێتەوە. یار هەموو لایێکی گێتیی گرتۆتەوە، لەهەموو جێگەیێکدا هەیە، هەموو کارێکی بۆ دەچێتە سەر، ئەنگوستیلەی سلێمان لەئەنگوستی دایە.

وێنەی دیکەش لەم لیریکەدا دەدۆزرێتەوە، وەکو یادکردنی سۆفییە گەورەکانی گێتیی سۆفیزم، شێخی سەنعان و شێخی گەیلانی بەشێخ عەبدولقادر دەڵێ: ئەگەر سافی ببی بەسوڵتانی هەموو گێتیش، هێشتا هەر گەدای تۆیەو مەقامی گەورەتر دەبێ.

سافی سێ قەسیدەی چوارینی هەیە، هەر یەکەیان لەحەوت بەند (کووپلە) پێکهاتووە، بەکێش و قافیەو پاش قافیەوە لەقەسیدە چوارینە بەناوبانگەکەی بێخود دەکەن "لەو ڕۆژەوە ڕۆیشتووە تۆراوە دڵی من.." بێ گومان ئەم دوو شاعیرە لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم ژیاون و ئاگایان لەیەکتری بووە و یەکتریشیان ناسیوە. لەبارەی کارلێکردنی یەکتریان لەئەوی دیکە، یا کامەیان قەسیدەکەی پێش ئەویتر وتووە، ئەمەیان ئاشکرا نییە. هەر چۆنێ بێ ئەم ڕیزە قەسیدە پڕ لەئاهەنگ و سۆزی ونبوون و لێک دابڕان و دوورکەوتنەوە دیوانی شیعری کوردییان ڕەنگین کردووە، سافی ئاوا دەست بەقەسیدەکەی دەکات:

**جانا لەفیراقی تۆ پەشێواوە دڵی من**
**پەروانەیی شەمعی تووە سووتاوە دڵی من**
**سەر تا بەقەدەم غەرقەیی خوێناوە دڵی من**
**وەحشی سیفەتە بەستەیی نێو داوە دڵی من**

بەم شێوەیە کۆتایی بەشیعرەکە دێنێ:

**ئەی بادی سەبا قاسیدی جانانی ڕوح ئەفزا**
**نامەی غەم و دەردو ئەلەمم بۆ بەرە بەغدا**
**تا چەند لەم میحنەتەدا بێ سەگی دەرگا**
**موودێکە وەکو (سافی) کە شێواوە دڵی من**

شاعیر دووەمین قەسیدە چوارینەکەی بەم بەندە دەست پێ دەکا:

**جانا لەغەمت والەوو حەیرانە دڵی من**
**سەرگەشتە وەکو وەحشی لەکێوانە دڵی من**
**دایم لەدەرودەشت و بیابانە دڵی من**
**موشتاقی ویساڵی ڕوحی جانانە دڵی من**

بەم بەندەش کۆتایی پێ دێنێ:

**عەبدێکی وەفادارو جەفاکێشە لەهیجران**
**وا کەوتووە وەک (سافی) لەدەرگانەیی گەیلان**
**بەم دەردی سەرە کوشتنی لازم نییە قوربان**
**لەم جێژنەیی قوربانە کە قوربانە دڵی من**

سافی سێیەمین قەسیدە چوارینەکەی بەم بەندە دەست پێ دەکا:

**موودێکە لەهیجرانی تۆ شێوایە دڵی من**
**سەرگەشتەوو بێچارەوو ڕیسوایە دڵی من**
**پەیوەستە لەکێوان و لەسەحرایە دڵی من**
**مەجنوون سیفەتە مائیلی لەیلایە دڵی من**

بەم بەندەش کۆتایی پێ دێنێ:

**بێ ڕەحم و وەفایی بەسە ئەی یاری وەفادار**
**شەیدا بێ هەوایی تووە ئەو (سافی)یی بیمار**
**پابەندی دوو سەد غەم بووە لەو لۆمەیی ئەغیار**
**جێی چارەسەری دەرگەیی بەغدایە دڵی من**

سافی لەم قەسیدانەدا وێنەی فرمێسک و زاراوەی ماتەم و لێکسیکۆنی ماتەمنامەی کلاسیکی بەکار هێناوە، هەوڵیداوە بە بۆیاغێکی تەنکی زاراوەکانی سۆفیزم ڕەنگرێژی بکا. تائێستا نەزانراوە ئەو کەسەی سافی ئەم

ڕیزە شیعرەی بۆ داناوەو شیوەنی بۆ دەکا کتێبە! ڕەنگە هەر لەبنەڕەتدا هیچ ڕووی نەدابێ و بۆ کەسیش نەوترابێ، بەڵکو شاعیر بەخەیاڵ دروستی کردبێ و لاسایی بێخودی کردبێتەوە، کەچی قەسیدەکەی بێخود بۆ مردنی کەسێکی دیاریکراو وتراوە.

## مەلا محەممەدی کۆیی
## ١٨٧٦-١٩٤٣



### ژیانی مەلا محەممەد

محەممەد کوڕی مەلا عەبدوڵلا کوڕی مەلا ئەسعەد لەقەبی خێزانی جەلی زادەیە. مەلا عەبدوڵلای باوکی نازناوی شیعری "جەلی" بووە، لەشاعیرانی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمی کۆیە بوو. لەم کتێبەدا باسی لێوە کراوە.

محەممەدی مەلا عەبدوڵلا لەشاری کۆیە لەساڵی ١٨٧٦ لەدایک بووە. وەکو قوتابییەکی خوێندنی ئایینی لەتەمەنی منداڵییەوە لەحوجرەی مزگەوت دەستی بەخوێندن کردووە. لەپێشان بووە بەقوتابی لای موستەعیدەکانی باوکی، لەتەمەنی مێردمنداڵی وانەکانی قوناغی پێشکەوتووی خوێندنی زانستەکانی ئایینی ئیسلامی و زمانی عەرەبی لەباوکی وەرگرتووە وا باوە لەتەمەنی هەژدە ساڵیدا هەر دوازدە زانستییەکەی تەواو کردووەو ئیجازەی مەلایەتی لەباوکی وەرگرتووەو بووە بەمەلا.

بەپێی نەریتی کوردەواری فەقێ هەرچەندە کوڕی مەلای زیرەکیش بووایە دەبوو لەلای مەلای دیکە بخوێنێ لەو جێیەی لێی دەژی، جگە لەوە پێویست بوو بۆ مەبەسی خوێندن سەردانی مەلا ناودارەکانیش بکا هەر چەندە لەمەڵبەندی ژیانی فەقێکە دووریش بووبن. جگە لەوە بەپێی نەریتی خوێندنی حوجرەی کوردەواری جوانتر بوو مەلا محەممەد لەمەلایێکی گەورەی ئەو سەردەمە ئیجازە وەربگرێ.

کە مەلا عەبدوڵلای باوکی مەلا محەممەد لەساڵی ١٩٠٨ کۆچی دوایی کردووە مەلا محەممەد لەجێی دانیشتووەو حوجرەی مزگەوتی بەڕێوە بردووەو بووە بەپێشنوێژو خوتبە خوێنی نوێژی ڕۆژانی هەینی و وانە وتنەوەی زانستییە ئیسلامییەکان و زمانی عەرەبی. لەسەردەمی دەسەڵاتی عوسمانی لەساڵی ١٩١٢ مەلا محەممەد بووە بەمفتی کۆیە. لەپاشان لەماوەی دەسەڵاتی ئینگلیزی داگیرکەر لەساڵی ١٩١٩ لەدوای جەنگی یەکەمی گیتی بەقازیی شار لەکۆیە دانراوە. لەدواییدا لەئەنجامی هەڵبژاردنی یەکەمی عێراق لەساڵی ١٩٢٤ بووە بەنوێنەری کۆیە لەپەرلەمانی عێراق لەبەغدادا. لەدوای تەواوبوونی خولی یەکەمی پەرلەمان جارێکی دیکە بۆتەوە قازیی شار تاساڵی ١٩٢٨ ئیتر وازی لەمووچەخۆری هێناوەو خۆی خانەنشین کردووەو هەموو کاتێکی تەرخان کردووە بۆ مەبەسی بلاوکردنەوەی زانستییەکانی ئایینی ئیسلام و ئامۆژگاریکردن و ڕێ پیشاندان و ئاراستەکردنی خەڵکی بۆ ڕەوشتی خێرخوازی و بەهێزکردنی گیانی کوردایەتی و ئەخلاقی بەرزی کۆمەلایەتی.

مەلا محەممەد کاری مەلایەتی پێ خۆش بووە، بۆیە زۆربەی هەرە زۆری ژیانی لەمزگەوت بردۆتە سەر. گەشتوگوزاری کەم بووە، شانازی بەخۆی و باب و باپیرانی کردووە. حەزی کردووە خەڵکی بەچاوێکی بەرز تەماشای بکەن. هەمیشە ئارەزووی ئەوەی بووە خوێندەواری ئەو ڕۆژگارە لەمەلایان و خەڵکی تر بەجەمالەدینی ئەفغانی (١٨٣٨-١٨٩٧) یا شێخ محەممەد عەبدەی (١٨٤٩-١٩٠٥) کوردی دابنێن. لەو کاتەدا ویستوویەتی وەک ئەو دوو ڕۆشنبیرە نوێخوازە بیر بکاتەوە، واتە شەریعەت لەگەڵ مەدەنییەتی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی قەومی بگونجێنێ، لەبەر ئەوە لەدژی کردەوە پراکتیکییەکانی سۆفیزم بوو، کە

لەدەروێشیزم خۆی دەنوێنێ. ئەم دژایەتییەی لەگەڵ پراكتیكی دەروێشیزم بووە، نەک شێخان و تەكیەو خانەقای هەردوو تەریقەتەكانی قادری و نەقشبەندی. مەلا محەمەد سەر بە تەریقەتی نەقشبەندی بوو، كەچی لەكردەوەیدا هەوڵی دەدا لەنگەری پێوەندیی بەشێخانی هەردوو لا لەیەک پلەدا بێ.

لەلایێكی دیكەوە بەئامۆژگارییە ئایینی و شیعرە میللییەكانی پڕ لەسۆزی كوردایەتی خۆی لەخەڵكی كۆیە نزیک كردبووەوە، بەڕێزەوە تەماشایان دەكرد. هەوڵی دەدا وەک مەلایێكی مەدەنی و هاوچەرخییانە خۆی پیشانی خەڵكی بدا.

مەلا محەمەد هەموو ژیانی لەمزگەوت بردە سەر تارۆژی ١٢ی تشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٤٣ لەكۆیە ماڵئاوایی یەكجاری كردو هەر لەوێش نێژرا.

### شیعری مەلا محەمەد

### شیعرەكانی لەڕووی ڕوخسارەوە

مەلا محەمەد هەردوو كێشی عەرووزی و سیلابی خۆماڵی بەكار هێناوە. زۆربەی شیعرە عەرووزییەكانی لەسەر بەحری هەزەج و خەفیف هۆنراوەتەوە، تاكە تاكە لەسەر بەحری موزاریع و ڕەمەلیشی هەیە، وەک ئاشكرایە ئەمانە لەكێشە سووكەكانی عەرووزین. جگە لەمە كێشی سیلابی خۆماڵیشی بەكارهێناوە. لەڕووی قافیەوە زۆربەی شیعری جووت قافیەیە (مەسنەوی)ن ئەم جۆرە قافیەی لەهەردوو بەشە عەرووزی و خۆماڵییەكەدا بەكارهێناوە. هەرچی دەنگی قافیەی شیعرە عەرووزییەكانیەتی ئەوەی لەسەر سیستیمی یەكێتیی قافیە دانراون، لەبەر كەمی شیعرەكان تەنیا ئەم دەنگانەی بەكارهێناوە: د، ن، و، (ە-د)،یێ.

بەرهەمی شیعری مەلا محەمەد هەمووی دەچێتە ناو شیعری میللییەوە، لەسەر هەر كێش و قافییەیێک دانرابێ. لەڕووی ڕوخسارو ناوەڕۆكەوە ئەدگارو شەقڵی شیعری میلليی حاجی قادریان پێوەیە. لەخوێندنەوەی شیعریدا ئەگەر كەسێک نەزانی شیعرەكە مەلا محەمەد داینــاوە -بەتایبەتی نازناویشی نییە- بەشیعری میللی فۆلكلۆری بێ خاوەن حسێبی دەكا.

زمانی شیعری مەلا محەمەد ئاسان و ساكارە، وشەكانی لەزمانی قسەكردنی ناو خەڵک وەرگیراون. ڕستە و تەعبیری زیاتر دەشكێتەوە سەر دیالێكتی ناوچەی كۆیە، ئەمە سەر بەدیالێكتی سۆرانییە، كە بەشێكە لەكرمانجی باشوور. لەخوێندنەوەی شیعریدا خوێنەر هەست بەكۆیییەتی مەلا محەمەد دەكا. بایەخی بەخەیاڵی شیعری و وێنەی ڕۆمانتیكی و داهێنانی ڕەوانبێژی نەداوە. مەبەسی تەنیا ئەوە بووە بیروباوەڕی كۆمەڵایەتی و سیاسی بگەیەنێتە خوێنەرو ئامۆژگارییەكانی لەبارەی كوردایەتی و كۆمەڵایەتی و بیروباوەڕی موسوڵمانیەتی پێشكێش بەخەڵكی بكا، لەبەر ئەوە بەرهەمی شیعری شەقڵی هۆنراوەی پەروەردەو فێربوون (دیداكتیكی) وەرگرتووەو چۆتە ناو بازنەی بزووتنەوەی تەنویری لەئەدەب و هونەردا.

### شیعری مەلا محەمەد لەڕووی ناوەڕۆكەوە

شیعری مەلا محەمەد لەڕووی ناوەڕۆكەوە لەدەوروبەری مەسەلەیێكی كۆمەلایەتی و سیاسی دەسووڕێتەوە، پێوەندیی بەچەسپاندنی بیروباوەڕی كوردایەتییەوە هەیە لەناو دڵی خەڵكیدا. بەلای شاعیرەوە هۆی هەرە گرنگ بۆ دواكەوتوویی میللەتی كورد ئەو كەسانە نین، كە دەیانەوێ مەسەلەی ئایین (موسوڵمانەتی) لەگەڵ قەومییەت (كوردایەتی) بەیەكترییەوە گرێ بدەن و لەگەڵ یەكتریدا بیانگونجێنن، بەڵكو تەریقەتی دەروێشی بووە بەمایەی تەمبەڵی و تەوەزەلی و دواكەوتوویی. ئەم هەموو هۆیانە بوون بەگیروگرفت بەرامبەر پێشكەوتنی كورد. ئینجا دێتە سەر ئەوەی خوێندەواری دەرمانی دەردی كوردە بەتایبەتی خوێندنی كیژی كورد.

مەلا محەمەد لەم بیروڕایانەیدا چاوی لەوە پۆشیوە كە ئایین (شەریعەت) لەپێشان دوژمنی بەڕاستی تیۆرییەكانی سۆفیزم بوودن، لەدواییدا دەستی بەسەر داگرتووەو داگیری كردووەو لەگەڵ ئیدیۆلۆجییەتی خۆی گونجاندوویەتی، لەبەر ئەوە شاعیر تەنیا دژی كردەوە پراكتیكییەكانی دەروێشیزم بووەو هەوڵیداوە بەرێگای ئایینەوە مافی نەتەوەیی كورد بەدەست بێنێ. دیارە ئەمەش بیروڕای خۆیەتی.

مەلا محەمەد وەكو شاعیرانی دیكە هەستی دڵداری و خۆشەویستی بووە، چێژی لەسروشتی ڕەنگین و جوان وەرگرتووە، بەتایبەتی شاری كۆیەو دەوروبەری لەشاخ و مێرگ و كانی و جۆبارو بەهاری ڕەنگاوڕەنگ،سەرچاوەی

ئیلهامی شیعری بووە لەهەموو سەردەمێکدا، لەبەر ئەوە نێوەندێکی ئەدەبی گرنگ بووە لەکۆمەڵی کوردەواریدا. کەچی بەڕاستی شیعری هونەری و داهێنانی ڕۆمانتیکی و سیمبۆلی ئەوەی بۆ خوێندەوارو ڕۆشنبیر دەنووسرێتەوە بەرچاو ناکەوێ. لەگەڵ ئەوەشدا شیعری ئەو بۆ زۆربەی خەڵکی ناو میللەت دانراوە، بۆیە کەڵک و سوودی زۆرە.

### نموونەی شیعری

زۆربەی شیعری مەلا محەمەد بەژمارەی دێڕ درێژن، ئەگەر بەشیعری کلاسیکی نووسراو بژمێررێن پێویستە قەسیدەیان پێ بوترێ، شیعرە کورتەکانیشی دەچنە ناو زاراوەی غەزەل لەڕووی ڕوخسارەوە. بەپێچەوانە ئەگەر مامەڵەی شیعری میللیی سەرزاریان لەگەڵدا بکرێ پێویستە "بەیت"یان پێ بوترێ. لەبەر ئەوە لەشیعرە درێژەکانیدا دەتوانرێ بۆ بەڵگە گوڵبژێر بکرێ.

### دژی دەرویشیزم و کۆلکە مەلایان

لەبەشێکی زۆر لەشیعریدا مەلا محەمەد کارو کردەوەی دەرویشی وشک و کۆلکە مەلا ڕیسوا دەکا.

لەیەکێ لەئامۆژگارییەکانیدا دەڵێ:

**قسێکت بۆ دەکەم چاکی بزانە**
**قبوولی کە بەبێ عوزرو بەهانە**
**لەسەر زارو زمانان گەرچی سووکە**
**لە میزانی حەقیقەت زۆر گرانە**
**بەخێری خۆت بەخەڵکی ڕاگەیێنە**
**هەتا زاهیر بێ ئەو سیڕڕی نیهانە**
**هەتاکو ئەهلی شارو دەشت و لادێ**
**خەبەردار بن لە ئەحواڵی ئەوانە**
**بۆ خۆت ئەحواڵی لادێ چاک دەزانی**
**یەکێ جووتیار یەکێکی بەرخەوانە**
**فلان ئاودێرە ئەویان عارد دەکێڵی**
**شوانە ئەو ئەویتریان سەپانە**

دواجار دەڵێ:

**بەهەر نەوعێ کە شێخ تەشریفی ڕۆیی**
**یەکێ عاقڵ هەڵستێ لەو میانە**
**دەڵێ ئەی قەوم و گەل ئێوە بەڵەد نین**
**لە کەیدو فێڵ و نەیرەنگ و فەسانە**
**لەلام مەعلووم بووە بێ شکک و شوبهە**
**بە ئاسارو بە ئەتوارو نیشانە**
**ئەهەمی مەقسەدی شێخی زەمانە**
**لە دونیا ئالیکەو هەم نان و گانە**

بەزمانێکی ئاسان و ئاسایی شاعیر لەگەڵ ڕەنجبەرو جووتیاری دەشت و خەڵکی کرێکارو هەژارانی شار قسە دەکاو بەسەرهاتی نالەباری خۆیانیان بۆ دەگێڕێتەوە، لەکارو کردەوەی کۆلکە مەلا دەدوێ و شەریعەت دەکا بەداردەست لەپێناوی چاکەی شێخی تەریقەتی دەرویشی. ئەفسانە دروست دەکا بۆ توانایی شێخ و نزیکی لەکردگار لەبەر ئەوەی هەموو دەبێ لەخزمەت شێخ بن، ژن و پیاو هەڵقەی زیکر دەبەستن، حاڵ دەگرن و لەهۆش خۆیان دەچن. ئینجا دەست دەکرێ بەباربوو کۆکردنەوە. هەموو شتێک بۆ شێخ پێویستە. توێشکی مەبەسی شاعیر ئەوەیە شێخ بیر لەگێتیی دوایی ناکاتەوە، بەڵکو بۆ ئەوەی ئێستایەتی لەنان و ژنان دەگەڕێ.

مەلا محەمەد بایەخی بەکێشەی شێخی تەریقەت داوە، لەبارەی ژنانەوە وەکو لەشیعرەکەی پێشوودا ڕوون و ئاشکرایە، دەیەوێ خۆشی لەمێینەییان وەربگرێ، هەر بۆ ئەم مەبەسە شیعرێکی دیکەی تەرخان کردووەو دەڵێ:

**شۆڕەژن من لەهەوەڵ پێم نەوتی**
**ئاخری حەزرەتی شێخ تێت دەکوتی**
**دێتە یادت کە بەشەو دەردەپەڕی**
**سەری قۆت سینەیی ڕووت پایی پەتی**
**وەکو ماین بەتەڵەب دادەوەشای**
**لات نەبوو سەبرو قەرارو ڕەحەتی**
**عاقیبەت کەوتییە ژێر حەملەیی شێخ**
**بەدوو سەد حیلەوو مەکرو دەووتی**
**کوو بە ئەفسانەیی شێخ هەڵخەڵەتای**
**بەچ ڕوو دەچییەوە لای ئەلیفەتی**
**شێخ ئومێدێکی وەها دابوو بە من**
**من لە بۆیە سەری خۆم خستە پەتی**
**بۆ ڕەزامەندی خودا کەوتمە دوای**
**دەمپەرستی شەوو ڕۆژ میسلی بوتی**
**ئەودی دیم دی پەشیمانیش بووم**
**ئێستەکەش ماوە خوداو مەرحەمەتی**

ئەم شیعرە دیالۆجێکە لەنێوان شاعیرو ئەو شۆڕە ژنە جوانەی شێخ هەڵیخەڵەتاندووەو کاری خۆی لەگەڵدا کردووە. لەلیریکەکەدا لەپێشان شاعیر لەگفتوگۆیدا لەگەڵ ژنەکە ئامۆژگاریی دەکا لەشێخ نزیک نەبێتەوە، چونکە نیازی خراپە. ئینجا کۆمیدییانە وەسفی هەڵپەی شێتانەی شێخ و بەباهاتنی ژنەکە دەکا. لەدواییدا شۆڕە ژن دێتە وەرام و ئەوە دەردەبڕێ، کارەکەی لەڕێی خودا بووە، چونکە شێخی بەگەورەو لەخودا نزیکی زانیوە، ئێستا پەشیمانەو چاوەنۆڕی بەزەیی خودایە.

**لاواندنەوەو ئامۆژگاری**

مەلا محەممەد وەکو شاعیرانی دیکەی کورد لای ئاشکرا بووە هەژاری و نەخوێندەواری و دواکەوتوویی دەردی بێ دەرمانی کورد بووە لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا هیچی بۆ نەکراوە.

لە قەسیدە یا بەیتێکی درێژیدا دەڵێ:

**هەتا دەمرم لەبۆ کوردان دەناڵم**
**عیلاجیان چۆن بکەم هاوار بەماڵم**
**فەقیرو جاهیل و نەخوێندەوارن**
**لەلای نەوعی بەشەر بێ قەدرو خوارن**

تا دەگاتە:

**گەلێ جاران دەچێتە فەوقی عەرشی**
**ئەگەر حەزکا لەلای خوا دادەنیشی**
**خولاسە چەند خورافاتێکی دیکە**
**مەلا نەقلی دەکا بەو فاک و فیکە**
**عەوامی قوڕ بەسەر وەک وا دەزانن**
**جەنابی شێخ بەخزمی خوا دەزانن**
**ئەوانە شێخیان لایان خودایە**
**حیسابی وان لەسەر تەوقی مەلایە**
**مەلا تۆ باسی خوایان بۆ بفەرموو**
**وەها باشە لەبۆ وان و لەبۆ تۆو**

لەسەرەتادا شاعیر سۆزی خۆی دەخاتە ڕوو بەرامبەر بەنەتەوەکەی، ئینجا باس لەدواکەوتوویی دەکا. کورد ژێر دەستە، دیل و بەندەی تورک و عەجەمە. شاعیر ناوی عەرەبی نەهێناوە ئەمەی لەڕووی ئایینییەوەیە، ئەگەرنا ئەوە ڕاستە چەوساندنەوەی کورد لەلایەن تورک و عەجەمەوە بووە، چونکە عەرەب لەگەڵ ڕووخانی دەوڵەتی عەباسی دەسەڵاتی لەدەستدا، لەدوای جەنگی یەکەمی گێتی خۆی گرتەوە. لەعێراقدا چەوساندنەوەی کورد لەلایەن عەرەبەوە دەستی پێ کرد، بەتایبەتی لەدوای ساڵی ١٩٣٠ بەکۆتایی هاتنی هەڵسان و ڕاپەڕینەکانی کوردی عێراق زاراوەی "کوردستانی عێراق" پەیدا بوو و کورد کەوتە ژێر دەسەڵاتی عەرەب و ئەمپریالیستی بەریتانی.

مەلا محەممەد ئەوجا بەرگری لەئایینی ئیسلام دەکاو پێی وایە مەلاو شێخ بەڕاستی فیکری شەریعەت ناخەنە خانەی پراکتیکەوە، بەڵکو دەیکەن بەئەفسانە بۆ چاکەو بەرژەوەندی خۆیان و خەڵکی ڕەش و ڕووتی پێ هەڵدەخەڵەتێنن.

لەشیعرێکی دیکەیدا مەلا محەممەد دەڵێ:

**ئەم خاکە دایکی تۆیە کەوتە دەستی ئەجنەبی**
**ئەی کوردی ساحێب غیرەت تۆ چلۆن ڕازی دەبی**
**بۆ خۆت ئەوا دەبینی دوژمن ئەرزت دەکێڵی**
**.پاشی چەند ساڵێکی دی هیچت بەدەست ناهێڵی**

تا دەگاتە:

**ئێوەش ئەگەر پیاو بان چشتێکو لەدەست دەهات**
**کەسێ غیرەت بنوێنێ خودا تۆفیقی دەدات**
**ئێوەن بێ قەدرو قیمەت بێ عەسکەرو بێ عەلەم**
**بێ تاج و تەخت و دەوڵەت ژێر دەستی کوللی عالەم**

لەم شیعرەدا شاعیر مەسەلەیێکی گرنگ لەمێژووی تازەی کوردی سەردەمی خۆی دەوروژێنێ. بۆ جاری دووەم دابەشکردنی خاکی کوردستان لەدوای جەنگی یەکەمی گێتی دەیەوێ ئەوە دەربخا تورک و عەجەم و عەرەب لەکورد چاپووکتر بوون بۆ دروستکردن و پێشخستنی دەوڵەت. ڕەزا شای پەهلەوی لەئێران و مستەفا کەمال دەوڵەتی عوسمانی ڕووخاندو دەسەڵاتی بۆ تورک دامەزراندو فەیسەڵیش بوو بەمەلیکی عێراق لەبەغدا. هەروەها بەچاوێکی سووک دەنواڕێتە مەلیکی ئەفغان و بە بەچکەسەقا ناوی دەبا، ئەمە بوو بەمەلیک کەچی کورد نەبوو بەهیچ!

لێرەدا ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە شاعیر لەڕووی

گەشبینییەوە باس لەڕەزا شاو کەمال ئەتاتورک و فەیسەڵی یەکەم دەکا بەناوی ئەوەی خزمەتی گەلەکانی خۆیانیان کردووە. لەکاتێکدا دەبوو هیچ نەبێ بەڕەشبینیش لەڕەزا شاو کەمال ئەتاتورک بدوێ، چونکە دەستی درێژیان هەبوو لەکوشتن و برین و تالانی کورد.

شاعیر لەقەسیدەکەیدا ئەو ڕاستییە دەردەبڕێ، کورد ناگاتە ئامانجی بەدەست و بازووی خۆی نەبێ. ناتوانێ مافی قەومی و مرۆڤایەتی خۆی دەست بخا بەزانستی نەبێ:

**سووری موو زەردی چاوشین نەکەی بەئومێدی بی**
**ئەوومل بەقـووەتی خـۆت دووەم بەعـەونی ڕەببی**
**عیلم و عەمەل خۆیەتی جەهل و تەمبەڵی مەرگە**
**پۆست و زەرگان فرێ دەن وەعدەی تۆپ و تفەنگە**
**بینە پۆلیس و عـەسکەر بۆ خـزمـەتی مـەفـتـەنی**
**سەعی و غـیـرەت بۆ وەتەن وەک ڕووحە بۆ بەدەنی**

لێرەدا شاعیر لەبێگانەی ئەوروپایی دەدوێ، بەسووری موو زەردو چاوشین ناویان دەبا، بێ گومان مەبەسی لەم بێگانەیە ئینگلیز بووە، نەیویستووە ناوی ببا.لەپاشان بەم دێرانەی کۆتایی بەقەسیدەکەی دێنێ:

**خـاکـو هەمـوو مـەعـدەنە مـەعـدەنی زێڕو زیوی**
**پڕ لە لەعل و یاقـووتە ناو شـاخ و داخ و کـێـوێ**
**ئەمما ئێـوە نازانن لەبەر گـێـژی و دەبەنگی**
**ئەم زمـرووت و یاقـووتە چلۆنتـان دێتـە چەنگی**
**حـاسـیلی عـەرزو دەکـەم بەنەمری خـەیرولئـەنام**
**دین و دونیا ڕێک بخەن نامـە تەمام وەسـسـەلام**

لەم دێرانەدا شـاعـیـر باس لەدەوڵەمەندی خـاک دەکـا ئەوەی لەگەڵ دواکەوتوویی کورد ڕێک ناکەوێ، چونکە کوردستان دەوڵەمەندە کەچی کورد دواکەوتووە. ئەگەر کورد پێش نەکەوێ نابێتە خاوەنی ئەم خاکە. لەپاشان مەلا محەمەد ئەوەی لەبیر نەچۆتەوە، کە مەسەلەی نیشتمانی کورد سەر ناگرێ ئەگەر بەڕێگای ئایینی ئیسلامەوە خەبات نەکا، واتە پێویستە دنیاو قیامەتی هەبێ.

**ئەفسانەی ئایینی**

مـەلا مـحـەمـەد یەکێک بوو لەو مـەلایانەی لەدژی پراکتیک کردنی ئەفسانەی ئایینی بوو. بۆ ئەم مەبەسە لەلیریکێکیدا دەڵێ:

**عـیـسـا لەئاسـمـان مـەهدی لەناو بیـر**
**ئیـشـمـان شلۆقـە یاران چ تەدبیـر**
**نە ئەو دێتـە خـوار نە ئەم دێتـە دەر**
**دەجـالیش زۆرن گـشـتی سـواری کـەر**
**لەدێ و لەشـاری سـەربەست دەگـەڕێن**
**بـەنـاوی دیـنـی بـاش دەلـەوەڕێـن**
**ڕیش پان و درێژ مل قـەوی شـان کـۆم**
**دووربن لەدینی وەحـایەو ناحـۆم**
**دوویان دەکـەون پـیـرێژن و منداڵ**
**بەغـارد سـەمـا بەجـەزبەو بەحـاڵ**
**پـیـرێژنە کـۆنی قـوون قـالب بەتاڵ**
**دوای دەجـال دەچن وەک مـاینی بەفـاڵ**

لەلای مەسیحییان عیسا لەئاسمانە، لەلای موسوڵمانی شیعە مەهدی لەژێرزەوییە، خەڵکی سەر ڕووی زەوی چاوەنۆڕیانن بێن مرۆڤ لەچەوساندنەوە ڕزگار بکەن. ئەمانە هەردووکیان ونن و لەهیچ شوێنێکدا دیار نین. ژیانی سەر ڕووی زەوی بەهاتنی دەجال کۆتایی پێ دێ، ئەویش هێشتا نەهاتووە. خەڵکی وەکو ئەو دەجالە زۆرن، ئەمانە کۆلکە مەلاو وشکە سۆفین، هەموویان وەکو ئەون، چاوەنۆڕن پەیدا بێ بۆ ئەوەی بەدوای بکەون وێنەکانی شاعیر هونەراوین، لەیەکچوواندنەکانی هەواییێکی کۆمیدییان داوەتە شیعرەکە.

**نەوتی کورد**

مەلا محەمەد لەهەموو شیعرەکانیدا تەنیا خەریکی وێنەگرتنی دواکەوتوویی و بێکەسی میللەتی کوردە ئەم لیریکەشی بەوە دەست پێ کردووە:

**یا ڕەببی بەلوتف و جـوودو ئیـحـسـان**
**لوتفـێکی بکەی لە حـەقـقی کـوردان**
**قـەومـێکی فـەقـیـرو نا تەوانا**
**بێ پەروەرو بێ پیـاوی دانـا**
**بێ مـورشـید و عـالیـمی سـیـاسی**
**بێ سـەتوەت قـاعـیـدەی ئەسـاسی**
**بێ ڕووح و حـەیاتی ئیـجـتـیـمـاعی**
**بێ قـودرەت و قـووەتی دیفـاعی**

دواجار دەنووسێ:

**لەم ئاخرە ئینگلیزو ئەفرەنج**
**پاش حەرێکی زۆر بەمیحنەت و ڕەنج**
**بۆ فیکری عەمیق و حەدس و حیسسە**
**گەر بێتە شەریکی نەفع و حیسسە**
**بیبات و لەنەفسی خۆی خەرج کات**
**ئەم کوردە فەقیرە چی بەسەرهات**
**ئەم میللەتە گەورەو عەزیمە**
**سێ پارچە کراوە بوویتە قیمە**

لەدوای موناجات لەگەڵ خوداو ئاماژەکردن بەدواکەوتوویی کورد مەلا محەمەد دێتە سەر باسی نەوتی باباگوڕگوڕی کەرکووک. ئەم نەوتە گەلێک گرنگە لەسیاسەتی نێودەوڵەتیدا. جەنگ هەڵدەگیرسێنێ، دەوڵەتی کۆن لەناو دەبا، دەوڵەتی تازە دروست دەکا. شاعیر ئەوروپایی بەنەوەی مەیموون دەژمێرێ. لەپێناوی دەستخستنی ئەم نەوتە سیاسەتی زەبرو زەنگ و کوشتن و بڕین بەکار دێنن. شاعیر لەگەڵ کورداندا قسە دەکا و پێیان دەڵێ، وڵاتەکەیان ئەوەندە دەوڵەمەندە تەنیا نەوتی نییە، گەلێ شتی دیکەی نهێنێ و شاراوەی ژێر زەوین. ئینگلیزو فرەنسی کەوتنە خۆ نەوتیان بۆ خۆیان مسۆگەر کردو لەئەنجامدا زیان لەکورد کەوت و بوو بەسێ پارچە، مەبەس کوردستانەکانی تورکیاو ئێران و عێراقە لەئەنجامی جەنگی یەکەمی گێتی پەیدا بوون.

شاعیر واز لەئامۆژگاری ناهێنی و حیکایەتی دواکەوتوویی میللەتی کورد وێردی سەر زمانیەتی، قەسیدە درێژەکەی بەم دێڕانە کۆتایی پێ دێنێ:

**قەومێ کە فەقیرو ناتەوان بێ**
**قەومێ کە زەلیل و بێ زمان بێ**
**ئەلبەتتە خراتری بەسەر دێ**
**جێی ناکەنەوە لەشارو لادێ**
**وەک بزنی گرو دەبێ دەربکەن**
**نابێ تخوونی بێرو مەڕی کەن**
**تا ئێوە لەحەققی یەک خراپن**
**بەد خواهو حەسوودو ناتەبا بن**
**تا ئێوە لەحەققی یەک بەکەیدن**
**هەر ژێر چەپەرۆکی عەمرو زەیدن**

نویشکی بیروڕای مەلا محەمەد بەرامبەر بەنەتەوەی خۆی ئەوەیە بەزانین و زانستی و یەکێتی و فیکری ئایینی ئیسلام نەبێ مەسەلەی مافی نەتەوایەتی ناگاتە ئەنجام.

## حوزنی
## ١٩٤٧-١٨٩٣



### ژیانی حوزنی

حوسێن کوڕی سەید عەبدوللەتیف کوڕی شێخ ئیسماعیلی خەزاییە. لەگوندی نیچکە لەنزیک ئاوایی بوغدەکەندی سەر بەبۆکانی موکریان لەساڵی ١٨٩٣ لەدایک بووە. شوێنەواری کاولبوونی گوندی نیچکە لەبەر چاوەو ئێستا کەسی تێدا ناژی. سەید عەبدوللەتیفی باوکی زۆر نەژیاوە، لەپاش مردنی سەلمای دایکی مێردی بەکابرایێکی هورمزیاری کردووە. لە سەردەمی لاویەتیدا هەندێ نازناوی بۆ خۆی داناوەو بەشێک لە نووسینەکانی بەو ناوانە بلاوکردۆتەوە. ناوەکان: حوزنی، خدۆک، داماو، بیژەن بوون. لەناو ئەمانەدا نازناوی "حوزنی" بەسەر ئەوانی دیکەدا زاڵ بوو. بەگشتی کەسێتی مێژوونوس و شاعیرو نووسەری ئەم ماوەیە بەحوسێن حوزنی موکریانی و حوزنی ناوی دەرکردووە. لە هەندێ شیعریدا نازناوی "داماو"ی بەکارهێناوە. حوزنی لەخێزانێکدا ژیاوە منداڵ بووە کە باوکی کۆچی دوایی کردووە. لەتەمەنی دوازدە ساڵیدا بێ کەس و بێ داڵدە ماوەتەوە، بەتایبەتی لەدوای شووکردنی

دایکی ژیانی ئاسان نەبووە.

لە سەرەتای سەدەی بیستەم و رۆژگارانی جەنگی یەکەمی گێتی سنووری سیاسی نێوان ئێران و عوسمانی تەگەرەیێک نەبووە بۆ هاتوچۆی کورد لەهەموو ناوچە کوردنشینەکانی کوردستانی ئێران و عوسمانی. ئەمە رێگای بۆ حوزنی خۆش کرد بەشوێن کاردا بگەرێ لەناو خاکی هەردوو دەوڵەتکە. هێشتا لە تەمەنی لاوییەتیدا بووە، کە کەوتۆتە ئەستەمووڵ و لەوێ فێری مۆر هەڵکەندن بووە. لەو ماوەیەدا ناوچەکانی باکووری کوردستان گەڕاوە. تا دوای داگیرکردنی کوردستانی باشوور و دروستکردنی دەوڵەتی عێراق لەلایەن ئینگلیزەوە، حوزنی بەهۆی سەید تەهای نەهرییەوە لە رواندز جێی کراوەتەوەو لەوێ نیشتەجێ بووە، لەو شارەدا زۆر نەماوەتەوە. لەو سەردەمەی ئەفسەری کوردی عێراقی فایق کاکەمین لە ئۆردووی سوپایی رواندز بووە، ناخۆشی کەوتۆتە نێوانیانەوە، ناچار بووە رواندز بەجێ بێڵێ و روو بکاتە حەلەب. لەو شارەدا حوزنی خەریکی پیشەی مۆر هەڵکەنی و چاپخانە بووە تا ساڵی ١٩٢٥ز. ئەو چاپخانەیەی لە حەلەب کاری تێدا کردووە لەدواییدا بۆتە هی خۆی بەکرین یا بەهەر جۆرێک بووبێ.لەساڵی ١٩٢٦ حوزنی خۆی و چاپخانەکەی گەڕاوەتەوە رواندزو چاپخانەکەی لەوێ دامەزراندووەو ناوی ناوە "چاپخانەی زاری کرمانجی". هەروەها کۆوارێکیشی دەرکردووە بەناوی "زاری کرمانجی" هەر بەو ناوەوە بڵاوخانەیێکیشی داناوەو کۆمەڵێک کتێبی ئەدەبی و مێژوویی و هی دیکەی بڵاوکردۆتەوە، تا ساڵی ١٩٣٤ خەریکی کۆواری "زاری کرمانجی" و بڵاوەخانەکەی بووە. لە حوزەیرانی ئەو ساڵەوە تا ناوەڕاستی مانگی تشرینی دووەم لە سلێمانی بووە لەگەڵ پیرەمێرد لە رۆژنامەی "ژیان"دا کاری کردووە. لە ساڵانی ١٩٣٥-١٩٣٦ لەهەولێر کۆواری "رووناکی" بڵاوکردۆتەوە. لەدوای ئەمە ماوەیێک بێ کاری بەخۆیەوە دیوە. لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگی دووەمی گێتی کەوتۆتە بەغداو لەساڵی ١٩٤٣ وەک نووسەرێک لەگۆواری مانگانەی "دەنگی گێتیی تازە" دامەزراوە، لەدوای کۆتایی جەنگیش لەکۆوارەکە ماوەتەوە تا لە ٢٠ی ئەیلوولی ١٩٤٧ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووەو تەرمەکەی گواستراوەتەوە هەولێرو لەگۆڕستانی ئیمام محەممەد نێژراوە.

**حوزنی مێژوونووس**

لە گۆڕەپانی رۆشنبیری کوردیدا لە سەرەتای ژیانی خوێندەواریدا حوزنی لایەنی زانستی مێژووی هەڵبژاردووە لەپێناوی خزمەتی رۆشنبیری کوردی. لەبەر ئەوەی خوێندنێکی رێکوپێکی ئەکادیمی نەبووە لەمێژوودا لایەنی پراکتیکی یا مەیدانی وەرگرتووە، واتە زیاتر لەسەرچاوەی سەرزاری و گێڕانەوەی رووداوی پێشینان و سەرو سەربردەو بەسەرهاتی پیاوانی مێژوو کەڵکی وەرگرتووە، دیارە بەهەموو جۆرێک ئەمە ئەوە ناگەیەنێ سەرچاوەی نووسراوی نەبووبێ، گومان لەوەدا نییە ئەمەی بووە، چونکە بێجگە لەزمانی کوردی. فارسی و تورکی و عەرەبی و فەرەنسی و ئینگلیزی زانیوە. ئەمە بووەتە هۆی ئەوەی ئاگاداری ئەو زانیاریانە بێ، کە لەمێژووی ئەو میللەتانەی حوزنی زمانیانی زانیوەو بۆ نووسینی خۆی کەڵکی لێ وەرگرتوون. لەئەنجامدا حوزنی بەزمانی کوردی کۆمەڵێک کتێبی مێژوویی نووسیوەتەوە، ئێستا بووە بەسەرچاوەیێکی گرنگ بۆ دانانی مێژووی کوردو کوردستان، لەوانە: غونچەی بەهارستان (حەلەب ١٩٢٥)، ئاورێکی پاشەوە (بەرگی یەکەم ١٩٢٥، بەرگی دووەم ١٩٣٠، بەرگی سێیەم ١٩٣١)، تاریخی حوکمدارانی بابان (١٩٣١)، مێژووی ناودارانی کورد (١٩٣١)، کوردو نادر شا (١٩٣٤)، کوردی زەردوشت (١٩٣٤)، مێژووی میرانی سۆران (١٩٣٥)، کوردستانی موکریان (ئاترۆپاتین) ١٩٣٨، ئەم کتێبانە هەموویان لەرواندز لەچاپخانەی زاری کرمانجی چاپ کراون.

جگە لەمانە حوزنی هەندێ باس و وتاری مێژوویی لەرۆژنامەو کۆوارە کوردییەکانیدا بڵاوکردۆتەوە. لەژیانی خوێندەواریدا حوزنی پێوەندی و نامەنووسینی لەگەڵ هەندێ کوردناسی رۆژهەڵاتناسانی ئەوروپا هەبوو، لەوانە ئەدمۆنسی ئینگلیزو مینۆرسکیی رووس و نیکیتینی پۆلۆنی (یا رووس) و کارل هەدەنگی ئەڵمان.

**حوزنی هونەرمەند**

حوزنی پیشەی مۆرهەڵکەنی و خۆشنووسی لە ئەستەمووڵ فێر بووە. بەکۆشش و توانای خۆرسکی بۆی لواوە خۆی وەکو هونەروەرێکی دیار بخاتە روو. ئەم پیشەیە وەک دیارە پێوەندییێکی بەهێزو راستەوخۆی هەیە

لەگەڵ چاپکردن (پولیگراف). بەهۆی ئەم دەست ڕەنگینییە حوزنی لەسەر مس و زەردو شووشەو بەردی بەنرخ و داری کەوەت نووسین و نەخش و نیگاری هەڵکەند (گرافیک). ئەوەی جێی ئافەرینە ئەم هونەرەوەرە ئەوەندە بەسەلیقەو ورد بوو کاری هەڵکەندنی زەنگوگرافی، کە بەچەند چرکەیێک بەهۆی مادده کیمیاوییەوە وێنەیێک یا لاپەڕەیێکی نووسراو لەسەر مەعدەن (زەنگ) دروست دەبێ، کەچی حوزنی ئەو وێنەیە یا نووسینەی بەسومبە (قەڵەمی ئاسن) لەسەر داری کەوەت هەڵدەکەندو وەک زەنگوگراف کتێبەکانی بەوێنەو خەتی خۆشنووسی دەڕازاندەوە.

جگە لەمە حوزنی بایەخی زۆری بەوێنەگری (فۆتۆگراف) داوە، بێ گومان ئەو پیشەسازییە پێوەندی بەچاپەوە هەیە. بۆ ئەم مەبەستە کتێبێکی بەناوی "وێنەگەری و کۆڵێن" (ڕواندز ١٩٣٤) داناوە. مەبەستی لەم کتێبەدا ئەوە بوو نهێنییەکانی پیشەی فۆتۆگراف و زەنگوگراف بۆ ڕۆشنبیری کورد ئاشکرا بکا. هەموو وێنەو خەتی خۆشنووسەکانی ناو ئەو کتێبەی لەسەر داری کەوەت هەڵکەندووە وەک لەوحە و زەنگوگراف و وێنەکانی ناو کتێبەکەی بەوان چاپ کردووە. بەم جۆرە حوزنی دەوری گرنگی بووە لەبڵاوکردنەوەی زانیاریی گشتی لەبارەی چاپ و چاپخانەو خۆشنووسی هەڵکەندن و هەموو کارو کردەوەیێکی پێوەندی بەلیتوگراف و زەنگوگراف و گرافیکەوە هەیە. کتێبی "وێنەگەری و کۆڵێن" نرخێکی مۆزەیی هەیە لەمێژووی ڕۆشنبیری کوردیدا، چونکە ئەو ماوەیەی حوزنی بۆ دانانی ئەم کتێبە خەرجی کردووە بێ گومان بەساڵ دەژمێرێ، کەچی تەکنیکی چاپی ئێستا بەچەند کاتژمێرێک دروستی دەکا.

**حوزنی ڕۆژنامەنووس**

ئەوەی جێی گومان نییە ئەوەیە جموجۆڵی حوزنی لە مەیدانی ڕۆشنبیری و ڕۆژنامەگەریدا لە ساڵی ١٩٢٥ لە حەلەب دەست پێ دەکا. ئەو کاتە لەنزیکەوە بەتەواوی لەگەڵ چاپ و چاپخانەو بڵاوکردنەوە ئاشنا بووە. دیارە پێش ئەو ساڵە لەحەلەب نیشتەجێ بووەو کتێبی مێژوویی "غونچەی بەهارستان"ی چاپ کردووەو بڵاوی کردۆتەوە، ئەمە وەکو کتێب یەکەمین بەرهەمی نووسینەیتی. لەپاشان لەساڵی ١٩٢٦ چاپخانەی لەحەلەبەوە گواستۆتەوە ڕواندزو دەستی کردووە بەبڵاوکردنەوەی کۆواری "زاری کرمانجی". ئەم کۆوارە بەپچڕ پچڕی لە ماوەی ساڵانی ١٩٢٦-١٩٣٢دا بیست و چوار ژمارەی لێ بڵاوکرایەوە، کۆوارێکی کۆمەڵایەتی و مێژوویی و هونەری و ئەدەبی مانگانەیی بوو. زۆربەی نووسینی ناو کۆوارەکە حوزنی خۆی ئامادەی دەکرد. بایەخی بەهەموو ئەو لایەنە زانیارییانە دەدا کە لەو سەردەمەدا گرنگ بوون و پێویست بوو خەڵکی کورد ئاگاداری بن.

لەدوای وەستانی زاری کرمانجی لە ساڵی ١٩٣٢، لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٣٤ حوزنی ڕووی کردە شاری سلێمانی و لەگەڵ پیرەمێرد لە بەڕێوەبەرایەتی ڕۆژنامەی "ژیان" بەیەکتری گەیشتن و بوون بەهاوکار بۆ دەرهێنان و بڵاوکردنەوەی ئەو ڕۆژنامەیە. ئەو برادەرایەتییە زۆری نەخایاندو لەپاش چەند مانگێک نێوانیان تێکچوو و حوزنی لە ١٥ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٤ سلێمانی بەجێهێشت.

حوزنی نەیدەتوانی بەبێ پیشەی ڕۆژنامەگەری بژی. لەبەر ئەوە ئەمجارەیان بیری لەوە کردەوە کۆوارێکی هەفتەیی زانستی و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی بەناوی "ڕووناکی" لە هەولێر بڵاو بکاتەوە. بۆ ئەم کارە پێویستیی بەخاوەن ئیمتیاز هەبوو. بەپێی قانوونی ئەو سەردەمەی عێراق و هەموو گێتی دەبوو ئەو کەسە باوەڕنامەی زانستگای هەبێ و مووچە خۆری میری نەبێ، لەو کاتەدا تەنیا ئەوقات (محامی) لەناو کۆمەڵدا باوەڕنامەی زانستگایان هەبوو و مووچە خۆریش نەبوون. لەبەر ئەوە کەسێکی هەولێری محەمەد شێت مستەفا بووە خاوەن ئیمتیازی ڕەسمی کۆواری ڕووناکی. بەڕاستی حوزنی خۆی هەموو کاروبارێکی کۆوارەکەی بەڕێوە دەبرد. زۆربەی وتارەکان خۆی دەینووسینەوەو ئامادەی دەکردن. خاوەن ئیمتیاز لە ژمارە یەکەم و دووەم هەندێ وتاری بڵاوکراوەتەوە.

ژمارەی یەکەمی ڕووناکی لەڕۆژی ٢٤ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٥ بڵاوکرایەوە. تەنیا یازدە ژمارەی لێ دەرچوو، دوا ژمارەی لەڕۆژی ١٦ی مایسی ١٩٣٦ بڵاوکرایەوە، واتە دەوروبەری حەوت مانگێک بەردەوام بوو.

کۆواری ڕووناکی ڕووداوێکی ڕۆشنبیری گرنگ بوو لە

شـــاری هەولێـــر، لەوە پێش ئەم شـــارە بزووتنەوەی ڕۆژنامەگەری بەخۆیەوە نەدیبوو. ڕووناكی بایەخی بەمێژوو و ئەدەب و ژیانی كـۆمـەڵایەتیی كـوردی دەدا، بەتایبـەتی ئەوەی پێـوەندی بەهەولێـرەوە هەبوو. ئاگـــاو ڕووداوی ڕۆشنبیری و كۆمەڵایەتی و ئەدەبی ناو شارو دەرەوەی بڵاو دەكردەوە.

دوا قـۆناغی حـوزنی لەكـاری ڕۆژنامـەگـەریدا وەک كارگەرو نووسەرێک لەكۆواری "دەنگی گێتیی تازە"دا بوو. ئەمـە كـۆوارێكی مـانگانە بوو لەلایەن بەشی پێـوەندیی گشتیـیەوە لە باڵیـۆزخانەی بەریتانیا لە بەغدا دەردەهێنرا (١٩٤٣). كـــاروباری نووسین و هونەری و دەرهێنـانی بەتۆفـیق وەهبی سـپـێـردرا بوو. لە سـەرەتادا دوو كـەس یارمـەتییـان دەدا حوزنی و حەسـەنی شێخ حـەمە مـارف. حـوزنی كـارگـەرێكی بەكـار بوو لەو كـۆوارەدا. چیـرۆک و وتاری ئەدەبی دەنووسی، تێكســـتی ئەدەبی مـــیللیی سـەرزاری (فـۆلكلۆر) لە شیـعرو پەخشـان بڵاودەكردەوە. لە وەرگێـڕاندا بەتوانا بوو، بەتایبـەتی لە وەرگێـڕانی هەمـوو جـۆرە نووسـینێكی عـەرەبی و فـارسی بۆ زمـانی كـوردی. ناوەڕۆكی نووسـینەكـانی لەبابەت ژیانی ڕۆژهەڵاتناس و پیـاوە سیـاسییـەكانی سـەردەمی جەنگی دووەمی گـێتی و شاعیرانی كلاسیكی ئینگلیزو هی دیكە بوو.

نووسینی حوزنی لەدەنگی گێتی تازە لەپلەیێكی بەرزی هونـەریدا بـوو، چونـكە لە تـەمــــەنێكدا بوو زانـست و زانیـــارییێكی زۆری وەرگـرتبـوو بەهۆی كـۆشـشی خـۆی و تاقـیكردنەوەكـانی لەمەیدانی مێژوو و ڕۆژنامەنووسـیدا. حوزنی لەسەرەتای دەرچوونی دەنگی گێـتیی تازە لەگەڵیـدا بوو تـا ئاوابوونی. لەدوای ئەو حـوزنیش ئەم گـێـتـییـەی بەجێهێشت. كردەوەكانی ماونەتەوەو لەمێژووی ڕۆشنبیری كوردی پارێزراون.

**حوزنی نووسەرو شاعیر**

حوزنی كوردی زانێكی چاک بوو، گۆڕەپانی نووسـینی ئەدەبی فــراوان بوو. دەتوانرێ لەم خـــاڵانەی خـــوارەوە بدۆزرێنەوە:

١- وتاری ئەدەبی: لەم هونەرەدا حوزنی وەک یەكێک لە دامەزرێنەرانی ئەم بابەتە بەرهەمـە پەخشـانییـە حسێب دەكرێ. شێوازی جوانی لە تابلۆ ڕۆمانتیكییەكانیدا بەرچاو دەكـەوێ، وەكـو وتارەكـانی "گـوندێكی كـاول بوو" و "بەختـەوەری" و "جـەنگی مـرۆڤ لەگـەڵ مـەرگ" و "هەی خاک" و هی دیكە.

٢- چیرۆک: حوزنی لەم هونەرەدا یەكێكە لەداهێنەرانی لە ئەدەبی كوردی لە نیـوەی یەكـەمی سـەدەی بیسـتـەمدا. بەڕاسـتی ڕێبـازێكی جـوان و لەباری گـرتووە لەم جـۆرە هونەرەدا. تەنیـا بەوە نەوەسـتاوە چیرۆكی ڕەسەن لەژیانی كـۆمـەڵایەتی وەربگرێ، بەڵكو حیكایەتی ئەدەبی مـیللی (فۆلكلۆر) گەلێ جار بووە بەسەرچاوە بۆ نووسینی چیرۆكی تازە لەسـەر بنچینەی داڕشـتنەوەی ناوەڕۆكی بەشـێوازێكی تازەو زمـانێكی كوردی پەتیی سـەردەم. بەگـشتی چیـرۆكە نایابەكانی حوزنی لەمانەدا دەبینرێن: "چاک و بەد" و "مام پیـــاو" و "سـەپان و جـووتیـار" و "دزو ڕەبەن" و "خـاوەن دارستان و پشیلە" و "پادشا و كراس" و هی دیكە.

•ئەوەی لەبەرهەمی حـوزنیـدا سـەرنج ڕادەكێـشێ هەست بەچوونە مـەیدانێک دەكـرێ لە نێـوان وتاری ئەدەبی و چیرۆكی كورتدا. هەندێ جار بەرهەمەكە بەناوی وتار بڵاو دەكرێتەوە، كەچی لەچیرۆكەوە نزیكترە، دیارە پێچەوانەش دەبینرێ، ئەم دیاردەیە تایبەتی نییە بەحوزنی، بەڵكو لای هەموو پەخشاننووسانی ئەو ڕۆژگارە بەرچاو دەكەوێ.

٣- حـوزنی بایەخی زۆری بە وەرگێـڕان داوە لە هەمـوو بابەتەكانی ئەدەبی. وەرگێڕانەكانی لە عەرەبی و فارسییەوە بووە. ناوەڕۆكیـان ڕەنگاو ڕەنگە لە سیاسەتی ڕۆژانەوە تا مەسەلەی ڕۆشنبیری و كۆمەڵایەتی و ئەدەبی و هونەری و لایەنی دیكەی ژیانەوە.

**نموونەی پەخشانی حوزنی**

لە تابلۆ ڕۆمانتیكییەكەیدا لە وتاری "گوندێكی كاول بوو" حوزنی دەنووسێ:

"ئێـوارەی گـوندەكـە لەسـەرخۆ تێـپـەڕی، چرووسكەی ڕووناكی لە كـەلی ئاسـمـانـدا ڕووی لە پووچبـوونەوە بوو، ئێوارەكانی بەجێماوی، وە شەوەكانی بەبیرەوەری ڕۆیشتن. ئێـوارە ڕەنگ و ڕوو زەرد هەڵگەڕاوەكـەی لەسـەر ملەو كەڵەشاخەكان بەسوور هەڵگەڕاوی چاوەڕوانی ئەو لاوانەی دەكرد كە گوندەكەیان بەبێ كەسی بەجێ هێشتبوو، وە لەدەمی هاوارلێكردنیان وە دەنگی هۆ مەڕۆندا خۆیان پەنا دابوو هەرچەند نووزەو لالانەوەشیان بەدوودا بوو. بەنیوەی

شەو و بەیانی نزیک سپێدەی گەزەنگی نادیار ئەو نووزانەوەو لالانەوەشیان هەر بەدووەدا بوو، هەتا دەمێ کە شەو نزیک بەسەرچوونی، وە دەمی بەیانی سپێدە بەردان بوو. گوندی کاولبووی دیوارە بەسەریەک رماوی داماو، لەبەر بێ کەسی و ماندووبوونی و زۆر قیژەکردن و نووزانی کەفت کەوت و چاوی لەسەر یەک داناو بەئاخ و داخەوە لەبەر خۆیەوە لە نەتەوەکانی دەپرسی کە داخۆ ئەوانە لەکوێن! وە کەی دەگەڕێنەوە لای تاکو کاول بوو ئاوەدان بکەنەوەو پیرۆزمەندی بخەنەوە دەست خۆیان.

**نموونەی شیعری حوزنی**

حوزنی توانای ئەوەی بووە شیعر دابنێ، ئەو بەڵگە کەمانەی لەبەردەستدان راستی لەم لایەنەوە دەخەنە بەرچاو، لەگەڵ ئەوەشدا دانانی شیعری نەکردووە بەپیشەو ناوی وەک شاعیر بڵاو نەبۆتەوە.

حوزنی لە شیعرێکیدا دەڵێ:

**خراپێکی کە تۆ لە منی دەبینی**
**دوو پیتە پێت دەڵێم با دانەمێنی**
**یەکێ کوردم دووەم راستە وتارم**
**لەوەم زیاتر نیە سووچی نهێنی**
**لەوێ رۆژێوە بەدبەخت و کەنەفتم**
**کە هاتمە شارێکی وا مەرگە ژینی**
**گرفتاری غەم و دەردێکی وا بووم**
**نیە رزگاری تۆ مەرگم ببینی**
**لە دەست کوردان برا ژینم بەڵایە**
**خوراکم تاڵە کارم دڵ برینی**
**غەم و دەردو بەڵاو گێچەڵ و شەڕ**
**بەرێژن دێ بەسەرما دەمکەوێنی**
**وەها (داماو)ی دەستی جەهلی کوردم**
**کەنەفتی و ناهومێدیم کەس نەبینی**

لە ساڵی ١٩٢٦ کە حوزنی چاپخانەی لەڕواندز دامەزراند، مایەی خۆشی و شادی بوو بۆ لاوان و نیشتمانپەروەرانی خەڵکی رواندزو هەموو کوردی کوردستانی باشوور. هەندێ لە مەلاکانی شار کەوتنە بەربەرەکانی حوزنی بەناوی ئەوەی چاپەمەنی خوو و رەوشتی خەڵکی دەشێوێنێ. لەدواییدا هەر ئەم هەڵوێستەش بوو نەیتوانی لە خەباتی خوێندەواری و رۆشنبیری بەردەوام بێ، ناچار شاری رواندزی بەجێهێشت.

ئەم لیریکەی حوزنی هەموو مەرجەکانی شیعری کلاسیکی تێدایە، دەکرێ لەشیعری ئامۆژگاری و دانایی و رەخنەگرتن لەکردەوەی ناهەمواری کۆمەڵایەتی بژمێررێ.

لە شیعرێکی دیکەیدا حوزنی هەر بەو هەناسەیەی شیعری پێشوو دەڵێ:

**ئەگەر رووت و نەدارو بێ کەوا بم**
**وە گەر برسی و گرفتاری هەوا بم**
**لە خۆیش و نیشتمان ئاوارە مابم**
**لە دەس یارو نەیارا سەر شێوا بم**
**لە ژێر جەورو جەفا و توهمەت رزا بم**
**لەنێو تاریکی کونجی غەم خزا بم**
**وەکو مەم بەندی زنجیری بەڵا بم**
**وەکو بێژن لە چاڵاوی قووڵا بم**
**نەسیری زوڵم و ئیستیبدادی وابم**
**لە خاکی خۆم غەریب و بێ نەوا بم**
**لەنێو بێگانە داماوی قەزا بم**
**بە خزم و کەس و باب و برا بم**
**ئەوەم پێ چاترە نەک سەر نەوی کەم**
**لەپێش گەورەی نەزان گەردەنکەچی کەم**

لەم شیعرەدا پتەوی بیروباوەڕی حوزنی ئەوەیە هەرچی رۆژگار لەدژیدا بیکا، هەموو کردەوەیێکی ئەوانەی خۆیان بەگەورە دەزانن زیانی پێ بگەیەنن سەریان بۆ شۆڕ ناکاو نابێتە پیاویان. مەبەسی ئەوەیە مرۆڤی سەربەست تەنیا دەبێتە پیاوی ژێری بەکاری سەربەستی وەکو خۆی.

ئەم شیعرە جۆرە تەرجیع بەندێکی یەک بەندییە. شەش دێری یەکەم یا هەر دوازدە نیوە دێڕ شیعرەکان لەسەر یەک قافیەن و دێری حەوتەم تەرجیعەکەیەتی (وەک "خەرجە"کەی مووەششەحی ئەندەلوسی). ئەم تەرجیع بەندە ئەگەر چەند بەندێک بوایە، دەبوو دێڕی دوایی لە هەموو بەندەکاندا دووبارە ببێتەوە.

## میهری
## ١٩٠٣-١٩٤٢



محەمەد شەریف كوڕی مەلا ئیبراهیم كوڕی مەلا عەبدولفەتاح لە ساڵی ١٩٠٣ لە هەولێر لەدایك بووە. بنەماڵەی بەمونەزین ناوبانگی دەركردووە چونكە باب و باپیرانی بانگدەری مزگەوت بوون. خۆیان بەحەنەفی بەخەڵكی دەناسێنن، چونكە لەسەر ئایینزای ئیمامی حەنەفین، كە یەكێكە لەچوار ئایینزاكەی سوننە.

محەمەد شەریف لە سەردەمی پشكووتنی ئیلهامی شیعری وشەی "میهری" وەك نازناوێكی شاعیری بۆ خۆی هەڵبژاردووە. سەرەتای خوێندنی لەماڵەوە لای كەسوكاری بووە، چونكە لەبنەڕەتدا لەخێزانێكی مەلازادەیە. لەسەر ڕێبازی خوێندنی مزگەوت میهری لای باوكی و لەپاشان لای هەندێ لەمەلایانی هەولێر خوێندوویەتی، ئینجا ڕووی كردۆتە كەركووك لەپاشان شەقڵاوە، لەوێوە گەڕاوەتەوە هەولێرو خوێندنی حوجرەی تەواو كردووەو هەر لەو شارەشدا ئیجازەی دوازدە عیلمەكەی وەرگرتووە. لەپاشان لەدادگای شەرعی لەهەولێر وەك مووچە خۆری میری كارێكی پێ سپێردراوە، لەو كارەیدا چوار ساڵ ماوەتەوە. ئینجا چووە بۆ لەغدا لەدوای تاقیكردنەوەیێك لەوەزارەتی زانیاری (مەعاریف) كراوە بەمامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی. وادیارە هەندێ لەفەقێ و مەلا گەنجەكانی ئەو سەردەمە بانگ كرابوون و تاقیكردنەوەیێكی سەرپێییان كردبوون، چونكە ئەو كاتە دەوڵەتی عێراق تازە بوو و پێویستیان بەمامۆستا هەبوو، ئیتر میهری لەناوچەی قەرەداغی سلێمانی بەمامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی دادەمەزرێ و ماوەی چوار ساڵ لەوێ دەمێنێتەوە. وا دەردەكەوێ میهری ژیانی ئەو ناوەی پێ خۆش نەبووبێ. هەستی بەئاوارەیی كردووە لەگەڵ ئەوەشدا بیرەوەریی خۆشی هەیە لەقەرەداغ و لەهەندێ شیعریدا ڕەنگی داوەتەوە. لەماوەی زیندەگانیی قەرەداغ و سلێمانی ئاشنایەتی لەگەڵ ماڵی مەلا عەبدولعەزیزی چاوماری مفتی و قانیعی شاعیر پەیدا كردووە.

هۆی گەڕانەوەی بۆ هەولێر ئەوە بوو میهری و هەموو ئەو مامۆستایانەی بەتاقیكردنەوەی سەرپێیی و بەبێ خوێندنی قوتابخانەی میری دامەزرابوون لەكاری مامۆستایی دوورخرانەوە. ئەمجارەیان میهری ڕووی كردۆتە بەغداو لەوێ وەك مووچەخۆرێكی سویلی لەوەزارەتی بەرگری دامەزراوە.

میهری دەنگی خۆش بووە، شارەزایی لەمەقام هەبووە، نەك تەنیا لەڕووی تیۆرییەوە، بەڵكو هەندێكیانی بەدەنگە خۆشەكەی خۆی چڕیوە. شاعیر لە ژیانیدا دوو جۆرە نەهامەتی و نەهاتی بووە لەژیانیدا، یەكێكیان ئاه و ناڵەی لەدەست ئازاری سییەكانی لەبەر نەخۆشیی سیل هەناوی داوەشاندبوو، ئەوی دیكەیان حەزی لەكچێك كردووە، لەبەر هەر هۆیێك بووبێ بۆی نەبووە، نەریتی كۆمەڵایەتی بۆتە تەگەرەو بەو خۆشەویستەی شاد نەبووە، لەبەر ئەوە ژنی نەهێناوە، جگە لەوە نەخۆشییەكەش هۆیێك بووە بۆ ئەوەی ژن نەهێنێ.

بەم ڕەنگە بەبێ وادە لەدوای ژیانێكی كورت میهری لەشاری هەولێر لەڕۆژی ٢٧ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٢ سەر دەنێتەوەو لەگۆڕستانی گەورەی شار بەخاك دەسپێردرێ. جگە لەم "میهری"یەی لەم ماوەیەدا باسی لێوە دەكرێ، لەمێژووی ئەدەبی كوردیدا دوو شاعیری دیكە بەم نازناوەوە باسیان لێوە كراوە. یەكێكیان ناوی محەمەد سەعید كوڕی مەلا عەبدولڕەحمان كوڕی مەلا یەحیای مزووریییە (١٧٩٥-١٨٨٢)، ئەوی دیكەیان محەمەد عەبدوڵلا دشەیی مفتیی سنەیە (١٨٨٩-١٩٥٨)ز، لەسنە لەدایك بووەو لەئەستەموول كۆچی دوایی كردووە، ئەوقات (محامی) و نووسەرو شاعیر بووە.

### شیعری

میهری گوێییێکی مۆسیقی بەهێزی بووە، لە منداڵییەوە لەگەڵ کتێب و کاغەزو قەڵەم ژیاوە، شیعری شاعیرە کلاسیکییە کوردەکانی خوێندۆتەوە، بەو شیعرانە گۆش بووە. لەبەر ئەوە توانای شیعر نووسینی لەلا خوڵقاوە. ئیتر لەئەنجامی کۆبوونەوەی کۆمەڵێکی باش لەوێنەو مانای شیعری کوردی، مێشک و خەیاڵی توانیویانە لەو وێنەو مانایانە بەرهەمی تازە دروست بکەن. ژیانی قەرەداغ و سلێمانی و ناسینی شاعیرو ڕۆشنبیرانی ئەوێ سەرچاوەیێکی گرنگ بوو بۆ مشتومالکردنی خەیاڵ و فرەکردنی زانیاری لەبابەت ڕۆشنبیری گشتیی کۆمەڵی کوردەوارییەوە.

### ڕوخساری شیعری

میهری شیعری کەمە، بەپێی ئەمە ئەو بەحرە عەرووزییانەی بەکاری هێناون ئەوانیش کەمن: هەزەج، ڕەمەل، موزاریع، ڕەجەز، کەچی ئەو دەنگانەی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی کە بۆ قافیەی شیعری بەکاری هێناون هەندێ زیاترن: ا، ت، د، ر، ل، م، ن، ه، و، ۆ، ی، ێ.

زمانی شیعری ساکارە، وشەی قورسی بەکارنەهێناوە، بایەخی زۆری بەڕەوانبێژی نەداوە، هەوڵیداوە شیعری لەئەدەبی میللیی سەرزار نزیک بکاتەوە. بابەتەکانی شیعر لەڕووی ژانرەوە زۆربەی بریتییە لەغەزەل (لیریک)، لەنێوان حەوت دێڕە شیعر و بیست دێر، جگە لەوە بایەخی بەپێنج خشتەکی داوە، لەمانە شیعری نالی و کانیێ و ئیبراهیم هوشیارو مەلا ڕەشیدی عەبدی کردووە بەپێنج خشتەکی، هەروەها کۆمەڵێک چوارین و تاک لەناو دیوانیدا بەرچاو دەکەون.

### ناوەڕۆکی شیعری

ئێش و ئازار زادەی ژیانی شاعیر بوو، بەتایبەتی دادو فیغانی لەدەست نەخۆشی، ناوەڕۆکی سەرەکی شیعری بووە، لەگەڵ ئەوەشدا شیعری نیشتمانی و نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی، گوزەرانی خەڵکی، وەسف و دڵداری، بەشی زۆری دیوانە بچووکەکەیان داگیر کردووە.

نزیکترین گەورە شاعیرانی کلاسیکی کوردی لەمیهرییەوە نالی و حاجی و بێخودو قانیع بوون. بەڕێزەوە ناوی شێخ مەحموودی بردووە، لەسەر ئەو باوەڕە بووە کورد ڕزگار دەکا، لەسەرەتای جەنگی دووەمی گیتی لەژیاندا بووە، لەو کاتەی دژی سیاسەتی هیتلەر بووە، ستایشی ئینگلیزی نەکردووە، هەروەها شانازی بەکوردەوە کردووە، هیچ گرێییێکی سایکۆلۆجی بەرامبەر بەعێراق نەبووەو خۆی بەهاووڵاتیی ئەوێ داناوە.

### نموونەی شیعری

لەلیریکێکی وەسف و دڵداریدا میهری دەڵێ:

**دڵ مەستی مەی مەزانە مەستی جەمالی تۆیە**
**حەیرانی عەقڵ و فام و نوکتەو کەمالی تۆیە**
**کوژراوی بەژن و باڵاو گفتارەکەی شیرینت**
**عاشیق بەچاوی شەهلاو ئەبرۆی هیلالی تۆیە**
**مەفتوونی دەنگی خۆش و ئەلحانی داوودیتە**
**قوربانی نێو نیگاه و لەنجەو دەلالی تۆیە**

لەکۆتاییدا دەڵێ:

**دەزانی بۆچی (میهری) لاوازەو ڕەنگی زەردە**
**هەمیشە ئیش و کاری فیکرو خەیاڵی تۆیە**

لەم لیریکەدا میهری وەسفی لەش ولاری دلبەر ناکا، بەگشتی ئاوڕ لەئەندامە جوانەکانی ناداتەوە، بایەخ بەڕەوشت و بزووتنەوەو دەمویل و هۆش و بیروڕای دەدا، لەنجەو نازو عیشوەی بەسەر دەکاتەوە. شاعیر خۆی بەپاڵەوانێک دەژمێرێ، پارێزەری دلبەرە، نایەڵێ کەس دەستی بۆ درێژ بکا، یا لێی نزیک ببێتەوە، بێ گومان مەبەسی لەو کەسە ڕەقیبە، ئەو دوژمنە هەموو کەس پێی دەوێرێ.

لەشیعرێکیدا میهری ئیلهامی لەبێخود وەرگرتووە، لاسایی "لەو ڕۆژەوە ڕۆیشتووە.." دەکاتەوە. لەلای بێخود لیریکەکە بریتییە لەیازدە چوارین، بەڵام میهری شیعرەکەی خۆی بە دە چوارین تەواو کردووە. لەم ماوەیەدا چوارینی یەکەم و دوایی بڵاو دەکرێتەوە.

چوارینی یەکەم:

**لەو ڕۆژەوە ڕۆیشتووە ناڵانە دڵی من**
**پڕ دەردەو غەم و قەهرەوو حەیرانە دڵی من**
**مەدهۆش و پڕ ئەفغان و بریندارە دڵی من**
**سووتاوی سۆزەی تۆیەوو بریانە دڵی من**

چواربنی دوایی:

**بێزارە تەواو (میهری) لەئەحوالی زەمانە**
**خوێنی دڵی عەینەن وەکو سیروانی ڕەوانە**
**یەک مالیکی میلیۆنە یەکیش خەستەیی نانە**
**لەم وەسفی پەرێشانە پەرێشانە دڵی من**

میهری ئەم شیعرەی بۆ خۆشەویستێک وتووە دوور بووە لێی، یا تازە لێی دوور کەوتۆتەوە، بەپێچەوانەی شیعرەکەی بێخود بۆ خزمێکی نزیکی خۆی وتووە کە کۆچی دوایی کردووە.

ئەم شیعرەی میهری لیریکێکی ئاساییە لەدووری دلبەر دەدوێ، ئەم مەبەسە بەشێوەیێکی فراوان ڕەنگی لەبەرهەمی شیعری کوردی داوەتەوە.

لەشیعرێکیدا میهری هۆی هەموو ئێش و ئازاری ژیانی دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی پیاوی چاک بووە، لەبەر ئەوەی خراپە بەسەر چاکەدا زاڵە تووشی ئەو ئێش و ئازارە بووە:

**من خۆم کەموعتەبەر بووم پڕ قەدرو تاجی سەر بووم**
**بەدبەختی زۆری هێنا بێبەش بووم دەربەدەر بووم**
**ئازادی دەردو غەم بووم خالی لەفیکرو هەم بووم**
**لەپڕ لەبێ نەوایی ئەسیرو پڕ کەدەر بووم**
**وەقتێ کە بێ خەبەر بووم لەفەنن و مەکری عالەم**
**لەپڕ لەخوابی غەفلەت تووشی هەراوو شەڕ بووم**
**دەزانی ئەمڕۆ بۆچی ئەسیری داوی شەڕ بووم**
**چونکە لەداری دونیا سەد حەیف بێ زەرەر بووم**
**وەقتێ لەدەست چوو فرسەت بێ سوودە سەعی و کۆشش**
**(میهری) لەوەقتی فرسەت دووچاری گاوو کەر بووم**
**لەفەننی دام و تەزویر من چونکە بێ خەبەر بووم**
**لەسەر ڕەوشتی عیلم و قانوون و ڕێی بەشەر بووم**

میهری لەم شیعرەدا بەسەر خۆی هەڵدەڵێ، پیاوی باش بووە، لەلایەن خەڵکییەوە ڕێزی لێ گیراوە، کەچی ئەمە بەردەوام نەبووە، تووشی بەدبەختی بووە، ئەوجا دەربەدەری. ئەمە هەمووی لەئەنجامی ئەوەوە بووە، فێڵ و فەنەری نەبووە، داوی بۆ خەڵکی دانەناوەتەوە، بێ یاسایی نەکردووە، بەخۆی دەڵێ ئەمە هەمووی لەوەوە هاتووە، چونکە تووشی خەڵکی ئاسایی و پیاو چاک نەبووم، بەڵکو لەناو کەرو گادا دەژیام.

گیرۆدەیی میهری بەنیشتمان و یادی مەڵبەندی نەتەوەیی لەهەولێرەوە دەست پێ دەکا، چونکە لەوێ لەدایک بووەو پەروەردە بووە، شانۆی ئەم خۆشەویستییە فراوانتر دەکا، لەپێشان کوردستان دەگرێتەوە بەهۆی ئەوەی یادگاری لەقەرەداغ و سلێمانی هەیە، ئینجا هەموو عێراق لەو سەردەمەدا بەشێک لەکوردستانی عوسمانی (باشووری کوردستان) کەوتبووە ناو دەوڵەتی عێراقەوە.

لەبابەت هەولێرەوە میهری دەڵێ:

**شاری هەولێر مەنبەعی عیرفانمە**
**شاری هەولێر باغ و هەم بیستانمە**
**سەرچڵی سەر ئەرزە قووتی ڕووحمە**
**شاری هەولێر عەنبەری شارانمە**
**خۆش هەوایە مەنزەریشی شیرنە**
**شاری هەولێر دلبەرو جانانمە**
**زەڕڕەیێ خاکی ئەمن نادەم بەزێڕ**
**گەوهەرە دوڕڕە وە هەم مەرجانمە**
**ماڵ و موڵکم بۆ چییە غەیری وەتەن**
**ماڵ و موڵک و سەروەت و سامانمە**
**مەولیدی خۆم جێگەیی ئەجدادمە**
**بۆ برینم مەرهەم و دەرمانمە**
**هەر لەمنداڵی هەتاکو ئەم دەمە**
**جێگەیی سەیرو وەهەم سەیرانمە**
**جێی شەڕی داراوو ئەسکەندەر بووە**
**جێی کەمال و ئیبن خەللەکانمە**
**فەیلەسووفی عەسری خۆی حاجری**
**جێی ئەوە زاتێکی خاوەن شانمە**
**جێگەیی ڕاستی و وەفایە چاوەکەم**
**جێی موزەففەر شاه و هەم سوڵتانمە**
**جێگەیی تەقوا و و عیلم و عیففەتە**
**جێگەیی تەفسیرو هەم قورئانمە**
**(میهری) مەدحی تا ئەبەد هەر ناکرێ**
**موزهیرە بۆ ڕەئفەتی یەزدانمە**

میهری بەکوڵ دڵداریی لەگەڵ هەولێر کردووە، هەرچی قسەی باش و جوانە هەڵبەستیش بێ جێی خۆبەتی بۆی بهۆنێتەوە، لەدڵێکی پڕ لەسۆزو میهرو وەفاو ڕاستگۆییەوە قسە لەگەڵ خوێنەر دەکاو باسی کەسی سێیەمی بۆ دەکا کە

هەولێرە. شاعیر ئاوڕ لەمێژووی سیاسی و ساماتی ڕۆشنبیری دەداتەوە. باس لەجەنگی داراو ئەسکەندەر دەکا، ناوی زانایانی وەکو ئیبن خەلەکان و ئیبن کەمال و حاجیری دەبا، یەکەمیان بەنەژاد کوردو عەرەبی نووسە، دووەم و سێیەمیان لەشاعیرو زانایانی سەدەکانی ناوەڕاستن لە هەولێر ژیاون و نووسینیان بەعەرەبی بووە. هەروەها یادی سولتان موزەفەری گۆکبەری میری هەولێر لەدەولەتی ئەیووبی سەلاحەدین دەکاتەوە.

میهری لە چوارینێکیدا دەڵێ:

**مەهتووکە هەچی ئەمڕۆ هونەرمەندو ئەدیبە**
**پڕ دانش و ڕووخۆش و وەفادارو لەبیبە**
**لەبەر ئەم نیسبەتە ئەمڕۆ کە چ عەیبم بەسەرا دێ**
**ئەم عەیبە لەبەرچی من ئەمەندەم بەنسیبە**

شاعیر ڕاست دەکا کە لەسەر ئەو باوەڕەیە نووسەرو هونەرمەند هەرچەندە پڕ زانست و پیاو چاک و بلیمەت بێ ئەوەندە بێ نرخە لەکۆمەڵدا. شاعیر لەم ڕووەوە خۆی بەگەورە دەزانێ لەبەر ئەوەیە بەشی زۆرە لەم ڕێز نەگرتنە.

لەچوارینێکی دیکەیدا دەڵێ:

**خودایە ئەی خودایە**
**نەشات و زەوق لە جیسمم قەت نەمایە**
**بکە دەرمان برینم بێ حیسابە**
**نەجاتم دە ئیلاهی لەم بەلایە**

دادو فیغان و لاواندنەوە وێردی زمان و مێشکی شاعیرە، فەرامۆش ناکرێ لەبەر ئازاری نەخۆشی، هیچی بۆ نامێنێ تەنیا پەنا بەرێتە بەر خودا، بۆیە هاواری لێ هەڵدەستێ و دەست بۆ ئاسمان درێژ دەکا و سێ جار هاوار بۆ خودا دەباو لێی دەپاڕێتەوە لەم بەلایە ڕزگاری بکا. ئەم هیوایەی ئەو کاتە دێتە جێ کە کۆتایی بەژیانی بێنێ.

میهری لەتاکێکیدا دەڵێ:

**ڕووی ڕەش بێ ڕەقیب ئەو شەوە کارێکی بەمن کرد**
**نەیدیوە چ کەس دەردی وەها لەو سەگە هارە**

هەواڵێک لەئاسمانی خەیاڵی شاعیر شنەی کردووە، ئەوەی گەیاندووە لەشەوێکی دیاریکراودا دلبەر خۆی لەلای ئەو دەجلوێنێ و بەیەکتری شاد دەبن، بەڵام ڕەقیب وەک سەگی هار دەکەوێتە نێوانیانەوەو دلبەر نەچۆتە لای دڵدار. ئەمە هەستێکی کلاسیکیانەیە میهری لەم دێڕە شیعرەدا دەربڕیوە.

میهری لەتاکێکی دیکەیدا دەڵێ:

**داماوی دەستی شەڕ بووم بێزارو دەربەدەر بووم**
**لە پەندی بێ نەوایی سەد شوکور تازە بەربووم**

ئەگەر زۆر جار شاعیر چاوەنۆڕی خۆشی بووبێ و لەباتی ئەو تووشی ناخۆشی بووبێ وەکو لە تاکە شیعری پێشوودا دەردەکەوێ، هەندێ جاری دیکەش پێچەوانەی ئەم هەڵوێستە ڕوو دەدا، میهری لەو شیعرەدا ئەوە دەردەبڕێ، کە پەژمردەو بێزارو دەربەدەر بوو، لەبەندیخانەی بێ نەوایی گیرساوەتەوە کەچی لەدواییدا لەو بەندیخانەیە ڕزگاری بووە. دیارە بەم یەکتری بینینە شاد بووە لەو کاتەی دەستیان لەملی یەکتری کردووە.

## دڵدار
**١٩١٨-١٩٤٨**



**بەڵێ خۆشە ئەمەل گەر بێ لەسەر ئەم ڕێگایە ڕەنج دەی**
**بەڵام گەر هەر خەیالات بێ ئەوەی هەتبێ ئەویش ئەڕوا**

### ژیانی دڵدار

دڵدار- یوونسی کوڕی مەلا ڕەئووفی کوڕی مەلا مەحموود ئەفەندی کوڕی مەلا سەعدی خادیمولسەججادە لە

٢٠ی شوباتی ١٩١٨ لەشاری کۆیە لەدایک بووە، دایکی (زەهوە)ی کچی خورشید ئەفەندییە، لەبنجدا لەمەلا زادەکانی ناوچەی زەهاون.

دڵدار قوتابخانەی سەرەتایی لە کۆیەو ڕانیە تەواوکردووەو لەهەولێر و کەرکووک کۆتایی بەقوتابخانەی ناوەندی و ئامادەیی هێناوە، ئینجا لە کۆلێجی حقووقی بەغدا خوێندنی بەرزی تەواو کردووە. ژیانی شاعیر سەخت بووە، لەشارێک بۆ شارێک عەودالّی خوێندن بووە و بەشوێنیدا ڕایکردووە، چونکە قوتابخانەی ناوەندی و ئامادەیی لەهەموو شارەکانی کوردستاندا نەبوو.

ماوەی ژیانی بەغدا ئاسۆی بیری فراوانتر کردووە، بەتایبەتی کە ئاشنایی لەگەڵ کۆواری گەلاوێژ پەیدا کردووە، لەسەر لاپەڕەکانی گەلاوێژ نەوەکو تەنیا شیعری بلاو دەکردەوە، بەڵکو بیروباوەڕی ئەدەبی و هونەری و کۆمەڵایەتیشی بلاو دەکردەوە، ئەمە کارێکی گەورەی کردە سەر مشتومالّکردنی بیری.

لەپاش تەواوکردنی کۆلیجی حقووق دڵدار بوو بەپارێزەر (ئەوقات= محامی)، بەلاّم ماوەیێکی نەخایاند، هێشتا سێ ساڵ بەسەر پارێزەری لاو تێنەپەڕیبوو، کە ئێوارەی ڕۆژی ١٢ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ لەهەولێر بەکارەساتی خواردنی خواردەمەنی بۆگەن لەیانەی فەرمانبەرانی هەولێر کۆتایی بەژیانی هات و لەگۆڕستانی گەورەی هەولێر بەخاک سپێردرا.

دڵدار لەبنەماڵەیێکی مەلازادەو مووچەخۆرێکی بچووکی دەوڵەت بوو، بەمە توانی هەندێ لەخوێندەواریی کۆن وەربگرێ و دیارە خوێندنی تازە بابەتی بەهەر دەردی سەرێێک بێ دوا پلەی تەواوکردووە.

ژیانی خوێندەواریی شاعیر لە بزووتنەوەو جموجوڵ بووە، ئەوەی بەوردی یادداشتەکەی بخوێنێتەوە ئەوەی بۆ ئاشکرا دەبێ کە دڵدار ڕۆژ بەڕۆژ لەگۆڕان و پێشکەوتن بووە، ئەمە تەنگوچەڵەمەو پێچەوانە نەبووە لەژیانیدا، بەڵکو دۆزینەوەی ڕاستی بووە. هەر کتێبێکی خوێندبێتەوە لەپێشان باوەڕی پێ کردووە، بەلاّم لەدواییدا کە وردی کردۆتەوە و مێشک و فامی خۆی بەکار هێناوە، هۆشیارانە ڕەخنەی لێ گرتووە. ئەمە بەئاشکرا لەو سەردەمەی دەردەکەوێ، کە خووی دابووە فەلسەفەی ئایینزای بەهائی و خۆی پێوە خەریک کردبوو.

شاعیر زۆری دەخوێندەوە، لەو ڕۆشنبیرانە بوو کە خۆیان خۆیانیان فێر دەکرد، چونکە لەو سەردەمەدا دامودەزگای ئەدەبی لەولاتدا نەبوو، پیشەی پارێزەریش بۆ دڵدار هۆیێکی گەورە بووە کە بچێتە ناو بنج و بناوانی ژیانی هەژارانەوە.

بێ گومان شۆڕشی فەرەنسەو ئۆکتۆبەر کارێکی گەوردیان کردبووە سەری، ئەمە بەگشتی لەکارە ئەدەبییەکانیدا دیارن، ئەگەرچی ڕاستەوخۆ باسی ئەو شۆڕشانەی نەکردووە. گیانی دیموکراتی و هاندانی کۆمەڵ بۆ خوێندەواری و ئامۆژگاریکردنی لاوان لەڕێگایێکی شۆڕشگێڕییەوە، ڕوون و ئاشکران لەبەرهەمەکانیدا.

دڵدار لەڕێکخراوی سیاسی دوورەپەرێز نەبووە، لەسەردەمی قوتابیەتی قوتابخانەی ناوەنجی لەکەرکووک بەشداری لەدامەزراندنی "کۆمەڵەی دارکەر"دا کردووە. لەپاشان ڕێکخراوەکە بووە بەسەرچاوەو بنکەی دامەزراندنی "پارتی هیوا. دڵدار پێش جەنگی دووەمی گێتی خۆی لەناو ئەم ڕێکخراوە سیاسییە دۆزیبیەوە. بەهۆی ئەوەوە ناسیاوی لەگەڵ ڕەفیق حیلمی سەرۆکی پارتی هیوا پەیدا کرد.

لەگەڵ کۆتایی جەنگ (١٩٤٥) پارتی هیوا تێکچوو، لەو ماوەیەدا دڵداریش وەکو زۆربەی لاوی نیشتمانپەروەری ئەو ڕۆژگارە لەمارکسییەکان نزیک بوودوە بەئومێدی ئەوەی لەو ڕێبازەوە کورد مافی نەتەوەیی چنگ دەکەوێ.

**شیعری دڵدار**

دڵدار شاعیری ماوەی تاقیکردنەوەو گواستنەوە بوو لەئەدەبی کوردی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، لەقۆناغێکی گەلێ ئاڵۆزو پڕ لەتەنگوچەڵەمەی کۆمەڵی کورد ژیاوە، ئەم ئاڵۆزییە ڕەنگی لە بەرهەمی شاعیر داوەتەوە. خەبات و زۆرانبازییێکی تیژ لەنێوان قوتابخانەی کلاسیکی تەقلیدی کۆن و بزووتنەوەی شیعری نوێ (ڕۆمانتیزم) لەناوەوە بوو، کلاسیکیش پیر بوو لەخەزانی ژیانیدا بوو لەبەر ئەوە باوی نەما بوو، ڕیالیزم سەری دەرهێنا بوو، لەسەرەتای تەمەنیدا بوو. جەوهەری ئەم هەموو ڕێبازانە لەبەرهەمی دڵدار بەدی دەکرێن، هەندێ جار تێکەڵ و پێکەڵن، بۆیە زانینی نەژادی شیعرێکی دیاریکراو کارێکی قورسە، واتە لە بەرهەمێکی ئەدەبیدا

هەمموو ئەو ڕێبازانە دەبینرێن. هەروەها تاکە تاکە بەرهەمی ڕۆمانتیکی واش دەکەوێتە بەرچاو، کە وێنەی ئەورووپاییەو بەزمانی کوردی وتراوە، وێنەی ڕیالیزمی ساکاری ئەوتۆش دەبینرێ، کە لەگەڵ دواکەوتوویی کۆمەڵی کورددا دەگونجێ، کۆمەڵی زەوی و دەرەبەگ و جووتیارو هەژار.

ئەم تەنگوچەڵەمەیە تەنیا لەناوەڕۆکی بەرهەمی دڵدار ئاشکرا نەبوو، بەڵکو، لەڕوخساریشدا دیار بوو. زۆر زانبازی و چوونە مەیدانێک لەنێوان دیالێکتە بچووکەکانی شێوەی کرمانجیی خوارووی زمانی کوردیدا هەبوو. لەنووسینەکانیدا دەردەکەوێ، کە خەڵکی سلێمانی نییە، ئەگەرچی زمانە ئەدەبییەکەی لەوێ وەرگرتووە، جەوهەری شێوە بچووکەکانی کوردی کۆیەو هەولێرو کەرکووک ئاشکران. وشەی (ئەکا) و (دەکا) لەلای شاعیر هێشتا ساغ نەبۆتەوە.

دڵدار نموونەی تاقیکردنەوەی شیعری تازەی کوردییە بەهەمموو لقەکانییەوە. ئەم شاعیرە لەسەردەمێکدا خۆی ناسی، کە (شیعری نوێ)ی کوردی لەناوەوە بوو، ئەو جۆرە خوێندەوارییە تازەیەی تێیدا دەژیا وای لێ کردبوو لەکۆن دوور بکەوێتەوەو لەتازە نزیک بێ، ماوەیێک لەمەوبەر لەبابەت دڵدارەوە ئەوەم نووسیوە لێرەدا من لەڕاستی دەرناچم ئەگەر دڵدار بەیەکێک لەسەرۆکەکانی قوتابخانەی داهێنان (ڕۆمانتیک) و قوتابخانەی ڕیالیزم دابنێم لەئەدەبی کوردیدا، دڵدار یەکێکە لەهونەرودەرە دیارەکانی، کە شیعری کوردییان تازە کردەوە لەڕووی کێش و قافیەو مۆسیقاو ماناو وشەوە.

شیعری دڵدار هەردوو کێشی شیعری کوردی، بەحری عەرووزی و کێشی سیلابی دەور دەکاتەوە، شیعرە عەرووزییەکانی لەسەر بەحری هەزەج و ڕەمەلن، چونکە لەکێشە سووکەکانن، هەرچی کێشە خۆماڵییە سیلابییەکانیشن لەهەمموو بابەتەکانی هەیە.

لەسەر قسەی دڵدار خۆی یەکەمین شیعری، کە ناوی (ڕووناکی) بووە لەساڵی ١٩٣٥ لەهەولێر بڵاوکراوەتەوە. لەمەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ دڵدار هێشتا لەسەرەتای قوتابخانەی ناوەندی بووە، کە شیعری بۆ هاتووە. هەر ئەو شیعرەش دەرگای دواڕۆژی بەرهەمی دڵدارمان بۆ دەکاتەوە، لەو شیعرەدا دەڵێ: ڕووناکی پێویستی ژیانە، لەبەر ئەوە ئەگەر ڕووناکی نەبێ، ژیان پێش ناکەوێ، کوردستان بەزانستی پێش دەکەوێ، دیارە زانستیش پێویستی بەڕووناکی هەیە. ئەم بیروڕایانە لەسەردەمی کۆمەڵی دەرەبەگی دواکەوتووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پەیدا بوون، بۆ دەربازکردنی ئەو کۆمەڵە بۆ کۆمەڵێکی پیشەسازی و خوێندەواریی پێشکەوتوو.

سەرانسەری دیوانی دڵدار لەچوارچێوەی ئیدیۆلۆجییەتی پێشکەوتوو دایە بۆ چاککردنی باری ژیانی کورد وەکو نەتەوەیێکی دەسەڵاتی لەدەس خۆی نییە. شاعیر لەبەر ئەوەی تاقیکردنەوەی کەم بوو، هەروەها ئەو جۆرە شیعرەی کە تازە پەیدا بوو بوو و بەتەواوی لەقاڵبدا نەمەیی بوو نەیتوانیوە ڕوخسارێکی دیاریکراو دروست بکا یا وەربگرێ بۆ هەمموو شیعرەکانی، ئەوانەی بەڕاستی هەمموویان لەڕووی ناوەڕۆکەوە ئیدیۆلۆجییەتێکی پێشکەوتوویان تێدایە، بەڵام ئەگەر مەرگی ناوەخت ماوەی بدایە جێگەیێکی تری لەئەدەبی کوردیدا دەبوو، لەم لایەنەوە ڕەفیق حیلمی ڕاستی وتووە: هەرچەند بەهۆی منداڵی و خەریکبوون لەگەڵ خوێندن، زۆری شیعر دانەناوەو ئەمڕۆ لەشاعیرە ناودارەکان ناژمێررێ، بەڵام بەو شیعرانەی، کە هەیەو بەرچاوی ئێمە کەوتووە، بەنوورو گەوهەری ئەو زەکایەدا کە لەم چەند شیعرەدا دەبینرێ، جێگەی گومان نییە، کە دڵدار، شاعیری تەجەددود پەروەرو ناوداری دواڕۆژ دەبێ.

شیعری دڵدار لەڕووی مەبەست و ناوەڕۆکەوە بەسەر ئەم بەشانەی خوارەوەدا دابەش دەکرێن:

## شیعری کۆمەڵایەتی و سیاسی

ئەم جۆرە شیعرە لای دڵدار لەڕووی ناوەڕۆکەوە بریتییە لەهاندانی لاوان بۆ خەبات و کۆڵنەدان و بەبێ وچان کۆشش کردن بۆ پڕکردنەوەی ئەو دواکەوتوویییەی کە نەتەوەی کورد گرفتاری بووە، بۆ ئەمە هێرش دەباتە سەر کاری خەراپی لاوان، بەتایبەتی سەرخۆشی و مەی نۆشی، کە بەکردەوەیێکی ناپەسەندی دادەنێ، ئەم جۆرە شیعرانەی دڵدار بەهیچ جۆرێ دەستی لەقافیە نەداوە لەڕووی تازەکردنەوەدو هەر بەشێوەی کلاسیکی هێشتوویەتییەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی زمانی شیعری گۆڕیوە ئەمە بووەتە هۆی ئەوەی کێشی شیعرەکانی سووکتر بکەونە بەرگوێ، ئەگەرچی پێڕەوی عەرووزیشی کردووە.

شیعری "ئەرێ ئەی لاو!" نموونەی ئامۆژگاری و پەندە بۆ لاوان، ئەوانەی بەلای دڵدارەوە دەبێ ڕۆشنبیرو نیشتمانپەروەر بن و چاکەی کۆمەڵ لەسەرووی چاکەی خۆیانەوە بگرن، لەم بابەتەوە دەڵێ:

**لەنێو گەلدا دەبێ ئیعلای جەنگی کەی لەگەڵ جەهلا**
**عیلم چەک بێ لە ئەم جەنگە وەتەن جێگەی کەمینت بێ**

بەلام لەشیعری "ئەی کورد"دا هەر ئەو بیروباوەڕانەی دوا سالانی سەدەی نۆزدەمە، کە لەکۆمەڵێکی دواکەوتووی دەربەگیدا دەخولقێ، ئەم بیروباوەڕە پێشکەوتووانە پیشاندانی ئەو واقیعە نالەبارەی کۆمەڵە دواکەوتووەکەیە، ئیتر شاعیران ڕۆڵەکانی میللەتیان هانداوە، کە کارێک بکەن نەتەوە لەدواکەوتوویی ڕزگار بکەن، ئەم ڕێبازە کۆنە، بەشێوەیێکی میللییانە لەوانەیە حاجی قادری کۆیی (١٨١٦-١٨٩٧) داهێنەری بێ، بەلام لەدەوروبەری جەنگی یەکەمی گێتی و پاش جەنگ بەشێوەیێکی تر خۆی نواند، بیروڕای تازە "سیاسی" لەقالبێکی کۆندا "شیعری عەموودی"، وا بوو ئەم جۆرە شیعرەمان ناو نا "شیعری سیاسی" جا دڵداری شاعیر وەکو نوێنەری هەموو ڕێچکە ئەدەبییەکانی کوردی ئەو سەردەمە، ئەم شیعرەی دەچێتە گێتیی ئەو شیعرە سیاسییەوە.

لەشیعری (ئەی کورد)دا دەڵێ:

**ئەرێ ئەی کورد لەنێو گەلدا هەتاکەی مات و داماوی؟**
**کە عالەم سەربەخۆن گشتی ئەتۆش پەیوەندی نێوداوی**
**دەسا بیرێ لەحالی خۆت بکەو هەستێ بەزیللەت کە**
**بەڵێ! دوێنێکە ڕاوکەر بووی و ئێستاکە خۆت ڕاوی**

### شیعر بۆ مندالان

دڵدار بایەخێکی تەواوی بەمندالی کورد داوە، مندالی بەهیوای دواڕۆژی گەلی کورد داناوە، کۆمەڵە شیعرێکی سووک و ڕەوان و ساکاری بۆ ئەم ئامانجە ئادەمیزادە بچووکانە وتووە، زۆربەی ئەم شیعرانە لەسەر کێشی خۆماڵین و جووت قافیەن (مەسنەوی).

لەشیعری "ڕۆڵەی تازە" لەسەر ئاوازی (سویت هۆم) دایناوە، دەڵێ

**من ڕۆڵەی کوردستانم تازە ڕۆڵەی کوردانم**
**تاکو ولات سەرکەوێ فیدایە ڕووح و گیانم**

***

**پێویستم بەزانینە زانین بناغەی ژینە**
**گەر گەلێ بێ زانین بێ گەر زیندووش بن مردینە**

### سروود

دڵدار سروودی زۆرە، هەندێکیان ئەوەندە بەناوبانگن باوەڕ ناکرێ کوردی خوێندەوار هەبێ سروودەکانی "ئەی ڕەقیب" و "کوردستان"ی نەبیستبێ. ئەی ڕەقیب سروودێکی نیشتمانی شۆڕشگێڕییە، بووە بەڕەمزی بوونی نەتەوایەتی. مانای لەچوارچێوەی بیری ناسیۆنالی دەسووڕێتەوە، لەلایەن هەموو کوردێکەوە بووە بەسروودی نەتەوە، لەبەر ئەوە کۆماری کوردستان لەمەهابادی موکریان کردبووی بەسروودی ڕەسمی، ئەی ڕەقیب بۆ کورد لەپلەی سروودی مارسێلێزە بۆ فرەنسی:

**ئەی ڕەقیب هەر ماوە قەومی کورد زمان**
**نایشکێنێ دانەیی تۆپی زەمان**
**ئێمە ڕۆڵەی ڕەنگی سوورو شۆڕشین**
**سەیریکە خوێناوییە ڕابردوومان**
**ئێمە ڕۆڵەی میدیاو کەیخوسرەوین**
**دینمان ئایینمانە نیشتمان**
**کەس نەڵێ کورد مردووە کورد زیندووە**
**زیندووە قەت نانەوێ ئالاکەمان**
**چەند هەزار لاوانی کوردی نەڕەشێر**
**بوون بەقوربانی و هەموویان نێژران**
**لاوی ئێستاش حازرو ئامادەیە**
**جانفیدانە جانفیدانە جانفیدان**
**لاوی کورد هەڵسانە سەر پێ وەک دلێر**
**سا بەخوێن نەقشی ئەکەن تاجی ژیان**
**کەس نەڵێ کورد مردووە کورد زیندووە**
**زیندووە قەت نانەوێ ئالاکەمان**

چەندە ئەی ڕەقیب مارشێکی لاوچاکی و حەماسییەو بەگەورەترین چوونە مەیدان و هێرش بردن قانگدراوەو گیانی شۆڕش و زەبرو زەنگی لێ دەتکێ ئەوەندە سرووی "کوردستان" نەرمونیان و لەسەرخۆیە، موناجاتێکی پڕ لەسۆزی کوردایەتییە، دڵدار لەگەڵ خاکی نیشتمانی دەکا، کە کوردستانە:

**کوردستانی خۆش نیشتمانی جوان**
**تۆ قیبلەگاهی منی بێ گومان**

چاوم پشکووتووی شاخەکانتە
فێری سەیرانی باغەکانتە
دەنگی شمشاڵی شوانەکانت
زریق و باقی جوانەکانت
قاسپەی کەوانی قەد کێوەکانت
خورەی ئاوەکەی نشێوەکانت
ئەمانە هەمووی گوێیان کردمەوە
هەوێنی شیعری دڵیان گرتمەوە
من درەختێکم لەم خاکە رووام
بەخۆشەویستی تۆوە ئاودرام
بەڵێ کوردستان تۆ منت خوڵقان
تۆ منت خوڵقان پێت بەخشیم ژیان
خۆشی ژیانم خۆشی ژینتە
ئێشی ژینی من رۆژی شینتە
چونکە کوردستان کوردستانی جوان
قبلەمی دینمی خوامی بێگومان

### ریالیزمی فۆتۆگرافی

ئەمە جۆرە بەرهەمێکی ئەدەبییە لەکۆمەڵدا، لای ئێمە لەکۆمەڵێکی دەرەبەگیی دواکەوتوودا لەسەر زمانی خوێندەوارە پێشکەوتووەکان خۆی دەنوێنێ، بریتییە لەپیشاندانی ناگزووری و دواکەوتوویی کۆمەڵ بەشێوەیێکی ساکاری سەرپێیانە، ئەم جۆرە شیعرە لێکدانەوەو شیکردنەوەی سایکۆلۆجی تێدا نییە، بیری تیژو خوێندەواری و رۆشنبیری بەرزو قووڵی ناوێ، چونکە بەزمانێک دەبێژرێ زمانی خەڵک، بەڵام خوێندەوارو نەخوێندەوار دەجووڵێنێ و دەوری خۆی لەگۆڕانی کۆمەڵدا دەبینێ.

لای دڵدار دوو نموونەی بەرزی ئەم جۆرە شیعرە هەیە (لالەباس) و (تووتنەوان)، هەردووکیان رەنجبەرو زەحمەتکێش و جووتیاری رەش و رووتی ئەو کوردستانەن، ئێشی زۆرو ژیانی سەخت. شاعیر سوودێکی زۆری لەفۆلکلۆرو ئەدەبی میللی کوردی وەرگرتووە، وەستایانە توانیویەتی بەزمانێک و شێوازێک نالەباریی جووتیاری کورد بگێڕێتەوە کە هەمیشە پارێزگاریی رێچکەی ئەدەبی فۆلکلۆری و ئەدەبی هونەریی نووسراوی کوردی بکا.

شاعیر لەشیعرەکەیدا دەڵێ:

رۆژێکی پاییز لەپێش نیوەرۆ
لالەباسم دی زەوی دەدا تۆ
رووت و زگ واڵا پیرو تێکشکاو
پشتی چەماوە لووت لەسەر ئەژنۆ
گۆچانی دەسی دەستەندووی جووت بوو
دەنگی نووسا بوو بەهێ هێ و هۆ هۆ
هەی ماندوو نەبی لالۆی جووتیارە!
وتی هەر بژی رۆڵەی لەسەرخۆ
وتم کاری جووت رەنجی لاوێنی
زۆر دوورن لەگەڵ پیرێکی وەک تۆ
رەسووڵەی کورت رەنجبەری چاکە
زەلامی ملهوڕ، لاوی چوست و جۆ
کوا بۆچی جووتت لەباتی ناکا
بۆچی تۆو نادا، بۆچی نابڕی شۆ
هێندێ پێکەنی سەیرێکی کردم
دەستی خستە سەر ریشی وەک پەمۆ
ئاگری دڵی لەهەردوو چاوی
بڵێسەی ئەدا وەک جووتێ پشکۆ
وتی لەهاوین کوێخا کاکەسوور
هاتە ماڵەوە پێی وتم لالۆ
شایەدی بدە "زەوی زێڕین دۆڵ"
کەوا هێ منە قورئانیش بخۆ
وتم کاکەسوور بەم سەرو ریشە
ئۆباڵی خەڵقی ناخەمە ئەستۆ
وتی هەروەها بەسەری ئاغا
ئەتکەمە پۆڕی بەر چەنگی هەڵۆ
بۆ شەو زەلامی هەناردە سەرم
ماڵیان دامە بەر شلینگی برنۆ
سێ مانگام هەبوو بەتاڵانی برد
منداڵی هێشتم بەبێ ماست و دۆ
هەندەی پێ نەچوو عەزەی ساڵح ئاغا
لەسەری کردم بۆ حیسەی تاپۆ
چوومە خرابە وتم ئاغا گیان
ملکم هێ خۆمە قەیدن لەتاپۆ
پێی وتم پیرەی سمێڵ کلکە سە
یا تاپۆ بدە یا بارکە برۆ
دوو سێ رەش و رووت ولاغیان هێنا

**دەغلیان بارکرد بەلێ لێ و لۆلۆ**
**کردی چەمبەریش رەسوولەی پەت کرد**
**کوێخا بەعەسکەر بردی لەبۆ کۆ**
**لەکۆیە چوومە لای زابت وتم**
**ئەفەندی عومرم گەییە حەفتا و نۆ**
**بێجگە لەم کوڕەو وەجاغم کوێرە**
**بەمنی ببەخشە مەمکە رەنجەڕۆ**
**زابت تووڕە بوو هەڵسایە سەر پێ**
**فڕێی دامە دەر بەپاڵە پەستۆ**
**پێم وت لالەباس پارەت بدایە**
**رەسووڵ موعیل بوو بەبێ گفتوگۆ**
**وتی پارەو من هەی خاکم وەسەر**
**بریا ئەمزانی ئەی خودایە بۆ**
**ئەوا چل ساڵە زەوی ئەکێڵم**
**فەللاحی ئەکەم هەتاکو ئیمڕۆ**
**نرخی عارەقەی ڕوونی ماندوویم**
**تیکە نانێکە، چ نان! نانە جۆ**
**ئەویش بەبێ دۆ**
**ئەویش بەبێ دۆ**

ئەمە نموونەیێکی ڕاست و زیندووی ژیانی هەژارو ڕەنجبەرانی کوردستان بوو لەسەردەمی فەرمانڕەوایی مەلیک لەعێراقدا لەژێر چاودێری ئەمپریالیستی بەریتانی بوو، هەموو کاروبارێکی لەلایەن ئەوەوە بەڕێوە دەچوو. چاکەو بەرژەوەندی دەرەبەگی دەست ڕۆیشتووی گوندو دەوڵەمەندی شار لەلایەن دەسەڵاتەوە پارێزرا بوو. مووچەخۆر لەسیڤیل و پۆلیس پارێزەری ئەو دەسکەوتە مفتە بوون، خۆشیان لەو چینە دەوڵەمەندو دەسەڵاتدارە دەژمێرران. داستانی شیعری "تووتنەوان"ی دڵدار لەکۆیە لەساڵی ١٩٤٧-١٩٤٨ نووسراوەتەوە. لەحەوت پارچە شێعر پێکهاتووە، هەر پارچەیێکی بریتییە لە دە دێڕ شیعر، واتە هەمووی حەفتا دێڕە شیعرە، شاعیر بۆ هەر پارچەیێک ناوێکی داناوە: تووتنەوان، کەپری ئاودێر، دووسوار، چەندو چوون، ماڵوێرانی، حساو، حساوکردن.

دڵدار ئەم بەرهەمەی لەسەر شێوازو ناوەڕۆکی بەسەرهاتی لالەباسی داناوە. باس لەشپرزەیی تووتنەوان و ڕەنجبەرو جووتیارو هەژارانی بێ دەسەڵات دەکا. چینێکی فراوانی کۆمەڵ لەم ڕەش و ڕووتانە کەوتۆتە ژێر باری قورسی ستەم و زۆرداری فەرمان بەدەست لەچینی دەرەبەگ و سەرمایەداری بۆرجوازی و دەسەڵاتی مووچەخۆری گەورەی دەوڵەتی مەلیکی، کە لەژێر چاودێری و بەڕێوەبەرایەتی ئەمپریالیستی بەریتانی بوو.

### شیعری ڕۆمانتیکی

لەدیوانی دڵدار ئەگەر بۆ ئەم جۆرە شیعرە بگەڕێین وەکو ڕێچکەیێکی ئەدەبی، ئەوەک، وەکو بۆچوون یا هێنانەوەی وێنەی خەیاڵی لەدوو پارچەی "خەندەکەیی بایی" و "گوڵی سوور"دا ئەم ڕێبازە ڕۆمانتیکییە دەبینین.

جارێ تەواوی "خەندەکەی بایی":

**لە ئافاقی ژیانی نائومێدیم خەندەکەی بایی**
**فریشتەی پاکی هیوامی نیشان دام وا کە بیدوێنم**
**پریشکی تیشکی ئەستێرەی جوان ئیمشەو بەئەسپایی**
**بەسۆزێ هاتە نێو کونجی دڵی تاریکی پڕ خوێنم**
**دەسا دەی مەسدەری هەستی**
**دە خێرا لادەری پەستی**
**وەرە! تا من بەڕازی تۆ ئەمامی شادی بڕوێنم**
**جوانی غونچەیێ بوو وا کە پەنجەی ڕازی ڕاکێشای**
**دەسەیری چەند بەوەسلی زولفی خاووت شادو مەسروورە**
**لەڕووی ڕاستی ئەتۆش وەک ئەو گوڵێکی چیمەنی دونیای**
**کەچی تاجی دڵی هێشتا دڵت لەم حاڵە ڕەنجوورە**
**بەخەندەی نەرمی دڵپاکیت**
**دەخۆم سوێندێ بەڕووناکیت**
**ئەگەر هەستێ بەژین وابێ لەجەرگی ڕاستییا دوورە**

* * *

**هەمووی نووری ژیانە فەیزو نووری ئاسمانی شین**
**هەموو چەپڵەی گوشادی لێ دەدەن هەرچی کە ئەیدینی**
**لەڕووی ئەم خاکە گەردێکین دە ئێمەش ڕوو لەشادی بین**
**فەرامۆشی بکەین جارێ چەژی تاڵاوی غەمگینی**
**بەدڵ ڕوونی و ڕوو خۆشی**
**بەخەندە، نەک بەخامۆشی**
**بنۆشین جامی دڵداری لەبەر کەین بەرگی نەمرینی**

* * *

**دەهەڵسە با بینا کەین ئایندەی پیرۆزی دڵداری**
**لەتیشکی ڕۆژ لەشەوقی مانگ لەڕەنگی پەلکەزێڕینە**
**کەهەر کامەی بڵێی پاکە لەکردەی قودرەتی باری**

**نیشانەی کردگارێک و بناغەی پەیڕەوی دینە**
**لەشوێنێ پڕ لەهەستی بێ**
**کەرەستەی خۆشەویستی بێ**
**لەنێو ئەم باغە بێ جێگەی کە تۆم لێ دی لەهاوینا**

***

**لەپەلکی تازە پشکوتووی نەژاکاوی گوڵی نەسرین**
**کراسێکی سپی بێ گەرد دروست کە شەنگ و دامەن شۆڕ**
**لەبەرکەو زولفی زێڕینت بەسەریا بێنە خوار چین چین**
**پەری تیم تیم بەڕازو ناز لەبۆت بێنن بنەوشەی مۆر**
**بە ئاواز و نەوای تەبجیل**
**بهۆنن پێچکەی ئیکلیل**
**ببەن کڕنووش بڵێن ئەی شۆخ پەریزادەی گزنگی خۆر**

***

**ئەوا ئیکلیلی دڵسۆزی و دلارامیت دەکەین پێشکێش**
**کەهەر چەپکەی خەمی ملکەچ لەجەستەی نەوجەوانێکە**
**نیگارێ بوو بەناکامی بەگریاوی بەئێش و نێش**
**لەژین ڕۆیی ئەوێستێکە هەوێنی داستانێکە**
**بە یادی ئەو دڵەی تینوو**
**کە چۆن هات و وەهاش دەرچوو**
**بڕۆ نێو ئاییندەو سەیری چ پیرۆز جاویدانێکە**

***

**وەرە نێو ئاییندەت تا من لەبەرپێتدا بدەم ئەژنۆ**
**لەبەروەی نا دلارامی لەبەروەی چونکە بالایی**
**پەری هیواو خودای شیعرو بلێسەی هەستی بەرزی تۆ**
**هەواڵی هاوڕەگ و خوێنی کچێکی شۆخی میدیایی**
**لە ڕووی چاکەو وەفاداری**
**بە نەشوەی جامی دڵدازی**
**لەمەستی خۆشی بهێڵێ دروشمی خەندەکەی بایی**

دڵداری لەم شیعرەدا وەستایەتییەکی یەکجار بەرزی نواندووە لەڕووی ڕوخسارەوە:

١- ناوی شیعرەکە کە "خەندەکەی بایی"یە کردوویەتییە ڕەمز بۆ دەست پێ کردن و کۆتایی پێ هێنان، بەم جۆرە ناوی شیعرەکە بووە بەقافیەی نیوە دێڕی یەکەم و نیوە دێڕی دوایی شیعرەکە دەست پێ دەکاو دواییشی هەر بەو دێنێ:

**لە ئافاقی ژیانی نائومێدیم "خەندەکەی بایی"**
**لە مەستی خۆشی بهێڵێ دروشمی "خەندەکەی بایی"**

٢- شیعرەکە لەحەوت بەند (کوپلێت) پێک هاتووە، هەر بەندی حەوت دێڕە شیعرە لەمان پێنج دێڕی یەکەم و دووەم و سێیەم و چوارەم و حەوتەم (١٦) کەرتییە، دوو دێڕ پێنجەم و شەشەمیش (٨) کەرتییە.

هەروەها دەکرێ ئەم شیعرە بە بەحری عەرووزیش بکێشرێ، لێرەشدا دڵدار داهێنانی بەدەستەوە هێناوە بەوەی لەسەر بەحری هەزەج "مفاعیلن" شیعرەکەی هۆنیوەتەوە لەدێڕە درێژەکاندا هەشت "مفاعیلن" و لەدێڕە کورتەکاندا چوار "مفاعیلن"ی بەکار هێناوە.

٣- قافیەی پێنج دێڕە درێژەکان بەم جۆرەیە (ا ب ا ب ب)، بەڵام قافیەی دوو دێڕە هەشت کەرتییەکان بەم جۆرەن (ا ا).

شاعیر توانیویەتی وەستایانە ئەم هەموو جەوهەرە جیاوازو ڕەنگ و وێنانەی، کە بەدروستکردنی ئەم پارچە شیعرە بەکاری هێناون، هارمۆنی و مۆسیقاییێکی ناوەوەی نەرم و ڕێکوپێک دروست بکا. دەستی هونەروەر لەم هەموو کێش و لەم هەموو قافیە جیاوازانە نەخشێکی ڕەنگین و بێ هاوتای کێشاوە.

ئینجا لەڕووی ناوەڕۆکەوە شاعیر بەرامبەر بەوێنەییێکی قووڵ دەمانوەستێنێ، مانای ئەم وێنەیە لەڕەنگ و سێبەرو هەتاو نییە، مەبەس لەو شتانە نییە کە تەنیا چاو دەیانبینێ و هەستیان پێ دەکا، بەڵکو ماناکانی لەپشت شتە دیارەکانەوەیە، ئەمە جیهانێکی خەیاڵی پاک و خاوێنە، بەهەشتێکە هیوای ئادەمیزاد دروستی کردووە، بەڵام دیارە لەناو ئەو بەهەشتەشدا، چونکە لەسەر زەوییەو پیاو ناتوانێ بادەی دڵداری لەدەستی حۆری و پەری وەربگرێ، ئەم جوانە لەبەر زێدە جوانی دەبێ لەخۆی بایی بێ و بەدڵدار ڕازی نەبێ، کە پێی ڕازی نەبێ دیارە نائومێدو ڕەنجەڕۆیە.

گومان لەوەدا نییە کە وێنەی سروشتی ئەوروپاو پێوەندی لەگەڵ ژندا، کە خۆی لەدڵدارییێکی گیانیی قورسدا دەنوێنێ کاریان لەدڵدار کردووە، لێرەدا ژن لەسروشت نزیکە، لەناو یەکتری تواونەتەوە، ئەمە وەکو پێوەندیی ژن و سروشتی شیعری ڕۆژهەڵات نییە، هەرچەندە وێنەکانیان جوانن و داهێنانیان تێدایە، بەڵام بەئاسانی لەیەکتری جودا دەکرێنەوە. دروستکردنی پەرستگای دڵداری لەتیشکی خۆرو شەوقی مانگ و

ڕەنگی پەلکەزێڕینەو دروونی کراسی لەپەلکی تازە پشکووتوو و نەژاکاوی گوڵی نەسرین، کە ڕەمزی پاک و خاوێنی و بێ گەردییە و هۆنینەوەی ئیکلیل، ئەمە هەمووی بۆ ئەو پەرییەیە، کە شاعیر ئەژنۆی بۆ دادەداتەوەو دەیپەرستێ.

بەڵام دیارە دڵدار مەبەستی تەنیا ئەمە نییە، بەڵکو شتێکی تریشە، ئەو شتە حۆری و فریشتەی بەنەتەوە میدیایی، واتە کورد دروستکردنە، ڕاستە حۆری و فریشتە نەتەوەیان نییە هەروەها لای دڵداریش نەتەوە نییە، بەڵام بۆ ئەوەی نەتەوەکەی خۆی ئەوەندە بەرز بکاتەوەو بگەیێنێتە (مطلق)ی حۆری و فریشتە، خۆشەویستەکەی دەکا بەمیدیایی، نەوەکو کورد بۆ ئەوەی کۆنەو قەدیم نەبێ، چونکە لەپێش ئەوەی کورد هەبێ لەباتی ئەو میدیا بووە، دیارە هەموو کوردێک میدیاییە، بەڵام هەموو میدیاییێک کورد نییە، چونکە لەسەردەمی میدیا کورد نەبووە، بەڵکو کورد لەباتی ئەوە.

## دڵدار و ئایین

لەوانەیە قەسیدەی "ئادەمیزادی و ئەدیان" لووتکەو ئەستووری بیروباوەڕی شاعیر بێ لەبارەی ئایینەوە، بەڵام ئێمە دەتوانین شیعری "ئەی خودایە" بە بەر کوڵی قەسیدەکە دابنێین، ئەم شیعرە لەساڵی ١٩٣٧ لەکەرکووک هۆنراوەتەوەو لەدیوانی دڵدار بڵاوکراوەتەوە، کەچی قەسیدەکە تائێستا ڕۆشنایی نەبینیوەو بڵاو نەکراوەتەوە.

لەشیعری "ئەی خودایە" شاعیر باس لەو ڕاستییە دەکا، کە ئەگەر خودا ئارەزوو بکا هەموو شتێک دروست و ڕێکوپێک دەبێ، چونکە خۆی لەسەر هەقە. جا ئەگەر لەکۆمەڵدا هەموو شتێک دروست نەبێ دیارە خودا ئارەزووی نەکردووە.

**ڕۆژێ فەرمووت: "لیس للانسان الا ما سعی"**
**هیچ کەسیش هێندی فەللاح ئیش و کێلانی نییە**
**ئیش دەکات و ڕەنج دەدات و ڕووت و قووت و زگ بەتاڵ**
**ئاخیری بێ سوود دەمێنێ ساڵ کە بارانی نییە**

لەدوا دێڕی شیعرەکەدا دەڵێ:

**ڕەنگەکەم دیدەو مەلایان هانی خەڵکی وا بدەن**
**کوشتنی (دڵدار) حەڵاڵە چونکە ئیمانی نییە**

بەڵام قەسیدەی "ئادەمیزادی و ئەدیان" قەسیدەیەکی (٢٩) دێرییە، لەبەغدا لەساڵی ١٩٤١ نووسیویەتییەوە. دڵدار لەم قەسیدەیەدا باس لەشتێکی تازە ناکا. ئەم مەسەلەیە لەدەوروبەری فەیلەسووفە کۆنە بەرایییەکانی گریکەوە لەناودەیە تائێستا، بەڵام ئەگەر ئەم بیروباوەڕە لەئەدەبی کوردیدا تازە بێ، لەبەر ئەوەیە زۆر کەم لەشاعیران بۆ ئەم باسە چوون. یاخود هیچ نەبێ لە بەر گەلێ هۆ، ئەگەر ئەم جۆرە شیعرە هەشبێ، بڵاونەکراوەتەوە، بەڵام ئێمە لێرەدا لە بەرئەوەی تەواوی ئەرشیفی دڵدارمان لەژێر دەستا بوو، دەتوانین خوێندەوار بەم قەسیدەیە بناسێنین، ئەگەرچی لەتواناادا نییە تەواوی تێکستی شیعرەکە بڵاو بکەینەوە.

دەبا گەشتێکی پێناسین بەناو قەسیدەکەدا بکەین:

**سەرم سوڕما لەمانای ئادەمیزادیی و ئەدیانی**
**کە غایە لەم قەراسانە دەبێ چی بووبێ نەمزانی**
**لە غەیبا هاتە گوێم دەنگێ کە داروین بوو وەهای فەرموو**
**لەدنیادا بەهێز دێت و زەعیف دەخوا لەبۆ مانی**
**چەکی ڕووحداری کێوی بێ ددان و یاخۆ چەنگێتی**
**چەکی ئینسان لەئەم جەنگە دوو ئەندێشیی و زۆرزانی**
**کە ئەندێشەی بەکار هێنا هەموو ڕوحداری ڕووی دنیا**
**ئەسیری دەست و تیغی بوون لەمێروو تا دڕوندانی**
**بەڵام ڕووحی تەماعی و قینە جۆیی و خود پەسندکردن**
**ئەوی خستە هەوای زەبت و سوپاه و تەخت و سوڵتانی**
**لەبۆ تەحقیقی ئەم غایە بەوردی کەوتە تێ فکرین**
**لەبیرو فەلسەفەی خۆیا (خوداو مەزهەبی) هانی**

ئەم پێشەکییە بریتییە لەبیروباوەڕێکی فەلسەفی و کۆمەڵایەتی لە کۆنەوە فەیلەسوف و زاناکانی کۆمەڵایەتی (بوون) یان پێ لێکداوەتەوەو پێوەندیی نێوان ئادەمیزادو هێزی تەبیعەت و بزووتنەوەیان پێ تەفسیر کردووە. ئەوەی گرنگ بێ بۆ دڵدار ئەوەیە، کە لەسەردەمێکی ژیانیدا باوەڕی بەم فەلسەفەیە بووە و ئەم بیرو ڕایانەی هێناوەتە ناو شیعری کوردییەوە. لەپاش ئەوەی باسی تیۆری گۆڕانی داروین دەکا، دێتە سەر ئەوەی چۆن "ئایین" کراوەتە دارەدەست بۆ چەوساندنەوەی ئادەمیزاد، کە لەئەنجامی ئەودا چەوساندنەوە بەر چینێکی دیاریکراو کەوتووە، کە چینی خواردووە، بەم جۆرە بووە بەدارەدەست بۆ چەوساندنەوەی

چینایەتی.

لەپاش ئەمە دڵدار دێتە سەر باسی ئایینەکان بەناو، لێرەدا تەنیا لایەنی ڕەشبینی ئەو کردەوانە دەبینێ، کە بەناوی ئایینەوە دەکران، لەم لایەنەوە دەڵێ:

**هەزاران تیرە بارانی کەناچەو ئافرەتی پیر کرد**
**هەزاران باغەوانیان نیشت لەسینگی باغ و بیستانی**
**هەزاران شاری مەعموورو قوسوور و شانەشینیان گرت**
**وەکو شێت کەوتنە تێکدان و ڕمان و یاخود سووتانی**

لەپاش ئەمە باس لەئایینە کۆنەکان دەکاو لەهۆی پەیدابوونی ئایینە تازەکان دەدوێ. جەوهەری ئابووری بۆ پەیدابوونی ئەم ئایینانە ناخاتە پشتگوێ، ئینجا دێتە سەر پەندو ئامۆژگاریی ئادەمیزادو دەڵێ:

**بەشەر خۆت کەر مەکە چیتر خورافاتی هەتاکەی بێ**
**حەقیقەت وەرگری سەهلە بزانی جەهل و نادانی**

### غەزەلی ئاسایی کلاسیکی

ڕەسەنی شاعیریەتی دڵدار لەوە دەردەکەوێ لەشیعری کلاسیکی لاسایی قوتابخانەی نالی بەتوانا بووە، لەوێوە دەستی پێ کردووەو هوشیارانە توانیویەتی ببێ بەشاعیری قۆناغی گواستنەوەو بە یەکێک لەدامەزرێنەرانی ڕێچکەو ڕێبازو بزووتنەوەی شیعری نوێ (ڕۆمانتیکی).

لەغەزەلێکیدا کە دوو دێڕی وەردەگرین، دڵدار دەڵێ:

**زەدەی تیری نیگاهی فیتنە پەردازی نیگارێکم**
**گیروودەی داوی زوڵفی موشکباری گوڵ عوزارێکم**
**ئەوەی نەیدیبێ نیشی دڵ وە یا ئازاری دڵداری**
**چوزانێ من لەئێشانی چ سووتان و فکارێکم**

ئەم غەزەلە نموونەی شیعری کلاسیکی کۆنە، واتە دڵدار وەکو مامۆستاو هاوشاری خۆی حاجی قادری کۆیی توانای شاعیرییەت و خەیاڵی هونەری خۆرسک بووە لەلای، لەهەر سەردەم و ڕۆژگارێک بژیایە دەبوو بەشاعیر.

### گاڵتەو گەپ و داشۆرین

دڵدار شیعرێکی داشۆرینی گاڵتەو گەپ ئامێزی هەیە لەگەڵ بورهان جاهیدی هەولێری پێکەوە هۆنیویانەتەوە، لەساڵی ١٩٤٤ لەڕانیەوە بۆ جەبار ئاغای کانییان ناردووە، لەشیعرەکەدا هەردوو شاعیر دەڵێن:

**ئەنفیەت کانی دەڵێن میسک و گوڵاوی تێکەڵە**
**دار وەکازیشت لەدارستانی گوندی هەرتەڵە**
**باش ئەکەی تەقلیدی لەنجەی قازی شابازە شەلە**
**مەیلی ئەشعارت وەکو جارانە ئایا ئەم حەلە!**

***

**بیستبووم ساحیب زەوق بووی سوحبەتت خۆش بوو تەمام**
**مەجلیست دایم بەمەی ئەرشاند شەوو ڕۆژ بێدەوام**
**خۆش قسەو خۆش ڕوو و خۆش موزجیک و شیرین کەلام**
**سەد مەعازەڵڵا کە ئێستا بووی بەسۆفی دەرگەلە**

***

**با ڕواندز جا لەمەولا قوڕ بپێوون سەر بەسەر**
**کانیێکی دوڕو گەوهەر وا لەنێوی چوویتە دەر**
**شاری هەولێرت مونیر کرد ئەی شەبستانی هونەر**
**(اغە گالدی چاغرن ئایشوکی وێرسن هەلهەلە)**

***

**جا لەنێو پاش هەرکە شەو دێ پاشی تەسبیح و سەلات**
**پڕ ئەدەیتە داستانی "قەیس و لەیلا" و عەسات**
**وا دەزانی چاوەدێرن مەجلیسی "پاشا" لەڕات**
**وشکە ڕۆ ڕۆیینت نەماوە ئێستا بوویتە هەروەلە**

***

**(ایشدن جانم) دەڵێی (من بعد) قاوەک فڕ ئەکەیت**
**عەینەکە نایابەکەت ئینجا لەنێو کیف دەرئەخەیت**
**(دون گیجە بز ئیر دە قالدق) پێت دەڵێن دەست پێ ئەکەیت**
**جا لە بەحری وشکی فیکرت دەست ئەکەیتە پێ مەلە**

***

**قوڕ بەسەر مەجنوون چ هەتکێکت بە لەیلا کردووە**
**قوڕ بەسەر لەیلا کە قەیست سووک و ڕیسوا کردووە**
**قوڕ بەسەر من تاکو ئێستا شاعیریت وا کردووە**
**تا (فضولی سویلیور کانی نەدر شو مەهزەلە)**

***

**(سن دخی ێغا بزی بیر بویلە مدح ایت شاعری)**
**تۆ لەکوێ ئینشا لەکوێ هەی کۆنە سۆفی قادری**
**کۆنە دەروێشی ئەزانم تەقلەبازی ماعیری**
**(شمدیلک بستر افندم یوقسە چوق قالمش هەلە)**

ئەوەی پێویستی بەڕوونکردنەوە هەبێ لەم شیعرەدا ئەوەیە: ئەنفیە بەمانای برنووتی هاتووە، هەرتەل ناوی گوندێکە لەناوچەی ڕانیە داروبارو دارستانی زۆرە. شابازە

شەل ناوی پاشملەی مەلا شابازی حەیدەری هەولێرییە ماوەیێک قازی بووە. دەرگەلە ناوی ئاواییە. جەبار ئاغای کانی ماوەیێک لەرواندز مووچەخۆر بووە لەپاشاندا گواستراوەتەوە هەولێر. (اغا گلدی..) رستەیێکی تورکییە بەمانای "ئاغا هاتەوە عەیشۆکی بانگ کەن با هەلهەلە لێ بدا". ئەم عەیشێیە لەپێشاندا کارەکەر بووە لەدواییدا بوو بەخێزانی ماڵ.

**پەخشانی دڵدار**

دڵدار کۆمەڵێک نووسینی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی لەپاش بەجێماوە، رەنگە لەو سەردەمەدا دەرچوونی گۆواری "گەلاوێژ" هاندەرێکی بەهێز بووبێ بۆ ئەو نووسینانە، هەر لەبەر ئەوەشە هەموو نووسینی لەسەر لاپەرەکانی ئەو گۆوارەدا بلاوکراوەتەوە، ئەوەی بلاو نەکرابێتەوەو ئێمە ئاگاداریمان بەسەرا هەبێ ئەو وتارەیەتی، کە لەبابەت زمانی کوردی و ئەدەبیاتی کوردییەوە نووسراوەتەوە. ئەمە هەوڵ و تەقەلاییەکە بۆ خستنە رووی ئەو بیرورایە کلاسیکیانەی لەبابەت زمان و ئەدەبەوە، کە بریتین لەتەعریفێکی ئەکادیمی بۆ ئەدەب، ئەدەب وەکو لقێک لەهونەرو پێوەندیی بەلقەکانی تری وەکو مۆسیقاو وێنەو نیگار کێشان و پەیکەرتاشی.

بەڵام وتارە بلاوکراوەکانی بریتین لە:

١- نامەیێک

ئەمە نامەیێکی کۆمەلایەتی و پەندو ئامۆژگارییە بۆ نەسرین، نەسرین رەمزی کچە کوردی تازە نەونەمامی پێگەیشتووە، دڵدار دەیەوێ ئەمە بەراستی ببێتە دایکێکی راستەقینەی دوارۆژ.

٢- عومەر خەیام

ئەمە وتارێکە بەهۆی بلاوکردنەوەی هەندێ لەچوارینەکانی خەیام، کە شێخ سەلام گۆڕیبوویە سەر کوردی و لەسەر لاپەرەکانی گەلاوێژدا بەزنجیرە بلاوی دەکردەوە، لەم وتارەدا دڵدار لەسەر خەیام دەکاتەوەو گفتوگۆ لەگەڵ هەموو ئەو کەسانە دەکا، کە لەدژی خەیامیان نووسیوەو بەرپەرچی قسەکانیان دەداتەوە.

٣- ناگزووری کۆمەلایەتیمان

وتارێکی کۆمەلایەتییە، وەکو دەردەکەوێ و دڵدار خۆشی دانی پێ دادەنێ، مەبەسی دەربڕینی بیروباوەڕ بووە نەوەکو شێوازو شێوەی داڕشتن و نووسینی کوردیی پەتی.

٤- نیشتمانپەروەری راست

وێنەیێکی رۆمانتیکییە بۆ پیشاندانی گیانی راستەقینەی نیشتمانپەروەری، لەپارچەیێکی نووسینەکەیدا، دەڵێ: (موهەندیسێکی نیشتمانپەروەر پێویستە کەئیبتیکار لەفەننی ئەو کارە بکاتەوە، کە پێی دەسپێرریێ بۆ ئەوەی نا کە قازانجی لێ بکات، بەڵکو بۆ ئەوەی چونکە کوردە. هەروەها شاعیرێکی کورد، کاتبێکی کورد پێویستە کەئیبتکار لەشیعرو نووسینیان بکەن بۆ ئەوەی نا کە ناوبانگ وەربگرن، بەڵکو بۆ ئەوەی کە ئەدەبی کورد لەپێش چاوی بێگانەدا بەرزیکەنەوە و بێگانە باوەڕو ئیمانێک بێنێ، کە کورد لەئەدەبیاتدا پێشکەوتوون).

٥- موزەککەراتی یوونس رەئووف دڵدار

ئەم یادداشتە لەدەفتەرێکی گەورەی قەوارە فولسکاب نووسراوەتەوە (٤٢) لاپەرەی دەفتەرەکەی داگیر کردووە، شاعیر باس لەژیانی خۆی و مێژووی بنەماڵەی خادیمولسەججادە دەکا لەسەرەتاوە تا ساڵی ١٩٣٦. تا ئێستاکە ئەم یادداشتە بلاو نەکراوەتەوە.

بێ گومان یادداشتی دڵدار کارێکی بەکەڵکە نەوەکو لەرووی زمان و شێوازەوە، بەڵکو لەرووی رووداویشەوە، بەڵام رەنگە بەبێ دەستکاری و لێ لادان و سڕینەوەو بژارکردن و چاککردنەوە رۆژێ لەرۆژان رووناکی نەبینێ.

ئێمە لەم ماوەیەدا هەندێ تێبینی لەبابەت یادداشتەکەوە تۆمار دەکەین:

١- دڵدار لەدەوری منداڵی ئەگەر شانازی بەوەوە کردبێ، کە لەنەوەی عوسمانی کوڕی عەففانە، چونکە خادیمولسەججادە لەنەوەی ئەون و بەم پێیە دەبێ عەرەبیش بێ، بەڵام لەدواییدا بیروباوەڕی پێچەوانەی ئەمە بووە.

٢- بەربەرەکانێی چاوچنۆکی دەرەبەگ و جادووگەری دەروێشی لەسەرانسەری یادداشتەکەی ئاشکرایە.

٣- لاپەرەیێکی گەشی خەباتی قوتابییان لەپێناوی

کوردایەتی لە قوتابخانەی ناوەندیی هەولێر لەسالانی ١٩٣٥-١٩٣٦ روون دەکاتەوە.

٦-"الطلاسم"ی ئیلیا ئەبوو مازی

دلدار (١٨) بەندی لەشیعرە بەناوبانگەکەی ئیلیا ئەبوو مازی (الطلاسم) بەپەخشان گۆڕیوەتە سەر زمانی کوردی، بەلام بێ تام و بۆیەو هەر لەئوسلووبی دلدار ناکاو تا ئێستاش بلاو نەکراوەتەوە.

هەروەها دلدار وردە وتارو گۆڕینی شیعرو وەرامدانەوەی رەخنەو شتی تریشی هەیە هەر لە "گەلاوێژ"دا بلاوکراونەتەوە.

جگە لەم نووسینە کوردییانە دلدار دوو نامەی تریشی هەیە بەزمانی عەرەبی. یەکەمیان بەناوی: (في طريقي الي معرفة الحقائق، انتقادات الى قلب البهائيين) ئەمە باسێکی ئایینی لاهووتییە وەرامی فەلسەفەی بەهائییەکانە، کە سەردەمێک شاعیر خۆی بەم باسەوە خەریک کردبوو. دووەمیان بەناوی: (اقتصادنا الوطني) باسێکی ئابوورییە لەتووتن دەدوێ. ئەم دوو نامەیە هەردووکیان لەرووی ناوەڕۆکەوە ئەگەر لەسەردەمی خۆیاندا بلاو بکرانایەوە بێ گومان کەلکیان دەبوو، بەلام بۆ سەردەمی ئێستا بەم شێوەیە دەست نادەن، وەکو هەموو بلاوکراوەییێکی ئەو کاتەو لەو باسانەدا بۆ ئێستا دەبێ بەچاوی رۆژگاری خۆی تەماشا بکرێن. بەلام لەرووی رەخسارەوە دیسانەوە دەبێ دەستکاری و بژارێکی باش بکرێن.

دلدارو دوو جوانەمەرگەکەی تر، وەزیری نادری و مارف بەرزنجی ئەگەرچی لەئەدەبی کوردیدا لاپەڕەی پیرۆزو پڕشنگداریان داگیر کردووە ئەگەر بە ئەونەمامی هەلئەوەرینایە.ئەو لاپەڕانە بەقەوارە فراوانترو بەرەخسار جوانتر دەبوون.

## کانی
## ١٨٩٧-١٩٥٧

### ژیانی

عەبدولجەبار کوری مەلا عەبدولرەحمان کوری تەها کوری عەبدوللای دۆغرەمەچییە. بنەچەیان دەچێتەوە سەر عەشرەتی جافی هەلەبجە. بەم دوو دێڕە شیعرە خۆی بەخەلکی دەناسێنێ:



**زاهیرم هەر مەردی مەیدانم وەکو شێری دلێر**
**گوێت لەبەیتم بێ دەکا ئیسپاتی نوتق و قووەتم**
**عاریفی عەسرم ئەدیبم حورو سەربەست و فەهیم**
**بێ موحابا شاعیرم مەشهوورە (کانی) شوهرەتم**

نازناوی شیعری (کانی) بووە، لەناو خەلکی بەجەبار ئاغای کانی ناسراوە، کانی لەسالی ١٨٩٧ لەهەولێر لەدایک بووە، هێشتا مندال بووە باوکی کۆچی دوایی کردووە، خوێندنی بەرایی لەحوجرەی مزگەوتی قەلای هەولێر بووە. مندالێکی هەراش بووە کەدەستی بەخوێندن کردووە. هەرچۆنێ بێ قۆناغەکانی خوێندنی تەواو نەکردووە، بەلام مەیلی بۆ خوێندنەوەی کتێب زۆر بووە، بەشداری لەکۆبوونەوەکانی ئێوەندی ئەدەبی و رۆشنبیری کردووە. ناسیاوی لەگەل هەندێ رۆشنبیرو مێژوونووس و شاعیراندا بووە، لەوانە حوزنی موکریانی و گیوی موکریانی و میهری شاعیری هەولێری و بێخودو زەکی هەناری و دلدارو سافی هیرانی و رەفیق حیلمی و هی دیکە.

یەکەم کاری مووچەخۆری میری لەسالی ١٩٢٨ لەکارگێری "هەلمەتی لەناوبردنی کولله" بووە. لەسالی ١٩٢٩ گوێزراوەتەوە بۆ کەندیناوەو گوێرو شەقلاوەو قوشتەپە. لەسالی ١٩٣٤ کراوە بەمووچەخۆری سەرژمێریی کۆیە تا سالی ١٩٤٣. ئینجا لەسالی ١٩٤٤ بووە بەمووچەخۆری ئازووقە (تەموین) لەهەولێر. لەدوای جەنگی دووەمی گیتی بووە بەمووچەخۆری دەسگای

زانیاری (مەعاریف) لەهەولێر، لەم کارەیدا بەردەوام بووە تا ڕۆژی ١٢ی مایسی ١٩٥٧ لەهەولێر کۆچی دوایی کردووە.

**شیعری**

شیعری کانی بەرهەمی ئەو نێوەندەیە کە لێی پەروەردە بووە. ناوچەی سۆران جێی جموجۆڵی شاعیر بووە لەنێوەندە گرنگەکانی بزووتنەوەی ئەدەبی کوردی و ڕۆشنبیری کۆمەڵی کورددەواری نەبووە لەسەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم لەو سەردەمانەدا ناوچەی کۆیە نوێنەری سۆران بووە. کانی لەڕۆژگارێکدا ژیاوە شوێنەواری ڕۆشنبیری و ئەدەب لەو ناوچەیەدا سەری هەڵدا. شاعیر ئاگاداری چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبی کوردی بوو لەڕواندز (١٩٢٦)، بڵاوکردنەوەی گۆواری رووناکی لەهەولێر (١٩٣٥). هەروەها نێوەندی ڕۆشنبیری لەماڵی خۆیان، باوکی مەلا بوو. لەسەرەتادا کانی بایەخی بەزمانی تورکی داوە، بەشەوقەوە لەیلاو مەجنوونی فزووڵی خوێندۆتەوە، لەپاشاندا هەندێکی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و چەند جارێکیش بڵاوکراوەتەوە. هەستی نەتەوەیی پاڵی بە کانییەوە ناوە بە تورکی شیعر نەنووسێ و بەکوردی بیهۆنێتەوە.

کانی شیعری بەحری عەرووزی لەسەر کێشەکانی هەزەج و ڕەمەل و سەریع داناوە. یەکێتی قافیەی بەکارهێناوە. لەبەر ئەوەی شیعری کەمە چەند دەنگێکی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی کردووە بەقافیە، هەرچی دەنگە تایبەتییەکانی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبییە پشتگوێی خستوون. بایەخی بەپاش قافیە نەداوە، تەنیا چەند نموونەیێکی پاش قافیەی هەیە، هەروەها شیعری سیلابی خۆماڵیشی داناوە. بەزۆری کێشی حەوت برگەیی و هەشت برگەیی بەکارهێناوە، قافیەیان مەسنەوییە.

لەبابەتی لیریک بەولاوە لەدیوانی کانی بابەتەکانی دیکە ناکەونە بەرچاو. هەندێ بەندی چوارین و تاکی هەیە، بەم پێیە بەرهەمی شیعری لەڕووی قەوارەو ژمارەی دێڕی شیعردوە کورتن. هەندێ لەشاعیرانی سەردەمی خۆی شیعریان کردووە بەپێنج خشتەکی، لەوانە میهری شاعیری هەولێرو جاهیدو محەممەد سائیب. زمانی شیعری کانی سەر بەقوتابخانەی نالییە، بەڵام ئەوە هەیە ئەدگاری دیالێکتی بچووکی سۆرانی پێوە دیارە، ڕاستتر دیالێکتی بچووکی ناو شاری هەولێر نەک کرمانجەتی دەوروبەری.

ناوەڕۆکی شیعری کانی سنوورکێشراوە، دڵداریی کلاسیکییانەی سەدەی نۆزدەمە. دەمی لەدانایی ڕۆژهەڵات داوە. هەندێ بیرو بۆچوونی هێناوەتە ناو شیعری کوردییەوە. بڕێکیش خەریکی داشۆرینی نەرمی کۆمیدیانە بووە، زیاتر شەقڵی گاڵتەو گەپیان پێوەیە. بابەتی هەڵهێن (مەتەڵ)ی هەیە.

**نموونەی شیعری**

**وەسف و دڵداری**

لەشیعرێکیدا دەڵێ:

**ساقی وەرە ئیمشۆکە لەبۆم تێکە پیاڵە**
**بۆ مەززە لەڕووت کافیە ئەم دانەیی خاڵە**
**هەر چەندە بەشەرع بادە حەرامیشە وەلێ من**
**بێ تەقیە دەخۆم جۆری لەدەستی تۆ حەلاڵە**

بەم شێوەیە کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

**(کانی) بەسە ئیتر چییە ئەم عیشق و هەوایە**
**پیر بووی بەخوادا عومری عەزیزت لەزەواڵە**

شاعیر بەلێکدانەوەی ڕۆژهەڵاتییانە دڵداری تەنیا لەپیاودا دەبینێ، بەشی ژنی تێدا نییە، ئەو پیاوەش دەبێ لاو بێ و نابێ پیر بێ. مەسەلەکە بەلایانەوە دڵداری هەوەسی سێکسەو دامرکاندنەوەی بەدەست پیاوەوەیە. شاعیر توانیویەتی وشە کۆبکاتەوەو مانای زانراوو بیستراوی تێ بخاو جۆرە مۆسیقاییێکی لێ دروست بکاو بێ بەئارامی گوێ و وەکو بەرهەمێکی هونەری بکەوێتە ناوەوە.

لەتاکێکیدا کانی ڕوو دەکاتە دلبەری و پێی دەڵێ:

**دووری لە نەزەر حازری دایم لە خەیاڵم**
**حەسرەت کەشی دیدارتم ئەی بەدری کەماڵم**

دلبەر بەلەش لەشاعیر دوورە، بەڵام ئەوەندە خۆشی دەوێ هەمیشە لەخەیاڵیدایە، لەبەر ئەوە داوای لێ دەکا لێی نزیک بێتەوە.

**کانی و کوردایەتی**

جارێکیان جاهیدی برازای کانی لێی دەپرسێ لەبەرچی زۆربەی شیعری دڵدارییەو شیعری نیشتمانپەروەری نییە.

کانی بەم شیعرە وەرامی جاهید دەداتەوە:

**وەتەن شیرینە لای من داخەکەم بەس کۆزی ساوایە**
**بەقیل و قالی من نامانجەکەی ناگاتە هیچ پایە**
**ئەبێ ڕۆستەم سیفەت لاوانی من گورج و بەغیرەت بن**
**هەتاکەی چاوەکەم هەر لایلایەوو باوەشی دایە**
**مەلێ بێ نیش و کارم بەختەکەم سەرنگوون دێنێ**
**ئەگاتە مەقسەدی کاسب، بە دوو سێ ئانە سەرمایە**
**بەشەر ئیللا بەکۆشش بەرز ئەکا بەیداغ و ڕەمزی خۆی**
**موحەققەق تەمبەڵی و سستی پەشیمانی لەگەڵدایە**
**هونەرمەندانی زۆرمان مرد بەڵام نامرێ قسەو ناویان**
**قسەی نالی قسەی سالم هەتا دنیایە هەر مایە**
**کورم بورهان قسەم بگری لەدنیا هیچ زەرەر ناکەی**
**بەمەردی هەر ئەژی بۆ خۆت مەگەر لەم تاڵە دنیایە**
**لە (کانی) گەر دەپرسی بۆچی ئەشعارت هەمووی عیشقە**
**لە منداڵی بەناکامی سەرم پڕ عیشق و سەودایە**

ئەم شیعرە لەلایەن کەسێکی ڕاستگۆوە وتراوە. شاعیر لەسەر ئەو باوەڕەیە کورد دواکەوتووە، بەئامۆژگاری دەردی تیمار ناکرێ، لەگەڵ ئەوەشدا بەپێچەوانەی قسەکەی خۆی ئەوە دەردەخاو دەڵێ کورد پێویستە ئازا بێ وەک ڕۆستەم و داوای مافی خۆی بکا، دەبێ کۆشش بکا بەوە نەبێ ناگاتە ئامانج. لەدوابیدا شانازی بەڕابردوو دەکاو ئەوە دێنێتەوە یادی خەڵکی، شاعیرانی وەکو نالی و سالم ئەگەرچی خۆیان وەک لەش لەناوچوون، بەڵام ناو و کردەوەیان واتە شیعریان ماوەو نەمرە. ئینجا ڕوو دەکاتە بورهان جاهیدی برازای و پێی دەڵێ، پێویستە بەمەردی بژی، لەبارەی پرسیارەکەیەوە بۆچ شیعری هەمووی دڵدارییە! شاعیر ڕاستییەکەی بۆ دەربڕیوە، کە وتوویەتی بۆ شیعری دڵداری خوڵقاوەو لەدەردەوەی ئەوە شیعری بۆ نایە.

### کەرەدێزە

کانی شیعرێکی کۆمیدی داناوە بەناوی "کەرەدێزە"وە، لەناوەڕۆکی شیعرەکە ئەوە دەردەکەوێ مەبەستی وەسفی کەرێک بێ، کەچی وا زان دەکرێ بۆ وەسفی کەسێکی دیاریکراو دانرابێ، ئەگەرچی هیچ ڕەمزێکی وای نەخستۆتە ناو شیعرەکەوە واهەست بکرێ بۆ کەسێکی دیاریکراو ڕێکخرا بێ. بەگشتی لە وەسفی ڕاستیی گوێدرێژیش نەچووەتە دەرەوە.

شیعرەکە لەسەر بنچینەی بەندی چوارین دانراوە (ااا ب)، نیوە دێڕی چوارەم لەهەموو بەندەکاندا بەنیوە دێڕێکی دیاریکراو کۆتاییان هاتووە. بەم جۆرە دەست بەشیعرەکەی دەکا:

**هەیتم کەرەکی دێزە چ عفریت و بەهێزە**
**وەک جووتی دەکا ڕاستە خەتی ڕێزی لەڕێزە**
**جۆی ناوێ بەرەڵڵای کە لەناو پووش و پەرێزە**
**قوربانی گونت بێ دەنی مەشرەب کەرەدێزە**

***

**ئەندامی گەلێ شیرینە زۆر دڵگیرە ڕەنگی**
**وەختی دەزەڕێ گوێ بدە وەک مەزرەحە دەنگی**
**ڕەهوانە سواری بە دەچێ میسلی خەدەنگی**
**قوربانی گونت بێ دەنی مەشرەب کەرەدێزە**

***

**گەر عومری دەپرسی کەمە چار وەختیە جاشە**
**وەستانی نیە جووتی ئەکا یانە لەئاشە**
**بیفرۆشم ئەگەر نیمرۆ بەسێ لیرە بەلاشە**
**قوربانی گونت بێ دەنی مەشرەب کەرەدێزە**

***

**وەک ئەسپە سەرو گەردەنی گوێ قیت و جوانە**
**باکی نیە هەر چەندی بکەی باری گرانە**
**ئەمسالی نیە قەتعی لەناو قەومی کەرانا**
**قوربانی گونت بێ دەنی مەشرەب کەرەدێزە**

لەم دێڕانەدا وەسفی سەرو سوکوت و ئەندامی کەرەکەی دەکا. گوێدرێژێکی بەهێزە، جووتی ڕێکوپێکە، ئەندامی جوانە، ڕەنگی دڵگیرە، خۆشڕەوە، تەمەنی لاویەتی هەیە، واتە جاشە. جگە لەجووت کردن باراشیش دەباتە ئاشی. نرخی گرانە. لەناو قەومی کەراندا یەکانەیە، لەئەسپ دەکا زیاتر لەوەی لەخێڵی گوێدرێژان.

ئەم شیعرە وێنەیێکی کۆمیدی جوانە لەئەدەبی کوردیدا، دەچێتە ناو "ئەدەبیاتی کەرنامە" بەناوی کۆمیدییەوە. هەرچی لایەنی فەلسەفی و دانایی کەرنامەیە، ئەمەیان لەوەسفی نالی بۆ کەرەکەی گەیشتۆتە لووتکە.

## ناسیح
## ١٨٩٨-١٩٨٦

### ژیانی

ناسیح کوڕی عەبدوڵلا کوڕی سەبغەتوڵلای حەیدەرییە. لەساڵی ١٨٩٨ لەهەولێر لەدایک بووە. لەشیعریدا ناوی ڕاستی خۆی وەک نازناو بەکارهێناوە، بڵاوکەرەوەکانی کۆمەڵە شیعری بەناوی "دیوانی حەیدەری"یەوە بڵاویان کردۆتەوە، ڕاستتر ئەوە بوو بەناوی "ناسیح"ەوە بێ.

خوێندنی سەرەتایی لەحوجرەی مزگەوت بووە. لەجەنگی یەکەمی گێتیی سەدەی بیستەمدا گەیشتۆتە پلەییێکی باش لەخوێندنیدا. لەماوەی پاش داگیرکردنی هەولێر لەلایەن ئینگلیزەوە (١٩١٨) لەڕووی خوێندەوارییەوە خۆی پێگەیاندووە. کتێب و چاپەمەنی ئەو سەردەمەی خوێندۆتەوە، بەتایبەتی دیوانی شاعیران و مێژووی ژیانی ناودارانی کورد. لەساڵی ١٩٢٥ بەمووچەخۆری میری دامەزراوە، ماوەی سی ساڵ لەدادگاکانی هەولێرو کەرکووک و سلێمانی فەرمانبەر بووە تا ساڵی ١٩٥٥ لەسەر داوای خۆی خانەنشین کراوە. لەو دەمەوە خەریکی حەسانەوەو خوێندنەوە بووەو لەنێوەندی ڕۆشنبیرییەوە نزیک بووەو پێوەندی بەخوێندەوارانەوە پێ خۆش بوو. تا ڕۆژی ٢ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٦ لەهەولێر کۆچی دوایی کردووە.

### شیعری

ناسیح شیعری بۆ خۆی و بۆ خەڵکە هەرە نزیکەکانی وتووە، تا چاپکردنی دیوانی لەساڵی ٢٠٠٠ لەنێوەندی ئەدەبی کوردی لەکوردستانی عێراق و لەناو شاری هەولێر بەگشتی بەشاعیر نەناسرابوو. شیعری کەمە، لەناویاندا هەست بەهەندێ ئاوڕدانەوەو داهێنانی هونەری دەکرێ.

لەبابەت ڕوخساری شیعرییەوە زانیاری لەم تێبینیانەدا دەست دەکەوێ:

١- لەبەحری عەرووزیدا تەنیا کێشی ڕەمەل و هەزەجی بەکارهێناوە.
٢- لەقافیەدا ئەم دەنگانەی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی دەکەونە بەرچاو: ا ب ت ر م ن (ە-ە) و ێ.
٣- لەپاش قافیەدا ئەم وشەو ڕستانەی بەکارهێناوە: یا ڕەسوولەڵلا، دەکا، شەو، مەکە.
٤- شیعری لەبابەتی لیریکە، ژمارەی دێڕەکانیان لەدوازدە دێڕ کەمترن. بابەتی قەسیدە لەبەرهەمیدا بەرچاو ناکەوێ.
٥- لەدیوانی شیعریدا قەسیدەی بەندی پێنجین (ااااب) و قەسیدەی بەندی شەشین (اااااب ب) دەبینرێن.
٦- هەندێ شیعری درێژی بابەتی داستان (بەیت)ی نووسیوە، بەڵام هیچ یەکێکیان لەڕووی هونەرییەوە لەپلەی لیریکەکانی نین.
٧- ناسیح شیعری بەشێک لەشاعیرانی کوردی کردووە بەپێنج خشتەکی، لەوانە: نالی، سالم، حاجی، مەحوی، شێخ ڕەزا، وەفایی، حەمدی، سافی، زێوەر، کەمالی، نووری شێخ ساڵح، دڵدار.

لەشیعری بابەتی وەسف و دڵداری ناسیح دەتوانرێ دەستەیێکی لێ هەڵبژێررێ، ئەوانی دیکەی لەو پلەیەدا نین. لەم تێبینیانەی لای خوارەوە هەندێ لایەنی شیعری لەڕووی ناوەڕۆکەوە ڕوون دەبێتەوە.

١- شیعری ئایینی (موناجات و نەعتی پێغەمبەر) جێگەی دیاری هەیە لەشیعریدا.
٢- شیعری وەسف و دڵداری.
٣- ستایش و پێداهەڵدان.
٤- پەندو ئامۆژگاری، ئەمەیان بەبیری شەریعەتی ئایینی ئیسلامەوە پیشانی دەدا.
٥- شیوەن و ماتەمنامەی زۆرە، جێگەیێکی دیاری لەدیوانیدا داگیر کردووە. لەبنجدا شیوەنەکانی بۆ کەسوکاری نزیکی خۆی بووە وەکو باپیرو باوک و دایک و کوڕو براو هەندێ لەژن و پیاوانی خزمی خۆی و برادەرو دەوڵەمەندو ناودارانی شاری هەولێر. لەناو ئەو کەسانەی ماتەمنامەی بۆ نووسیوون ئەو ڕاستییە دەردەکەوێ کەسێکی شاعیرو نووسەرو ڕۆشنبیریان تێدا نییە خزمەتی کولتووری کوردی کردبێ.

### نموونەی شیعری
### وەسف و دڵداری

لەشیعرێکیدا دەڵێ:

**هەردوو زوڵفی چەند جوان هاتوونە خوار**
**بۆ سەری کوڵمی لەڕەنگی گوڵهەنار**

**شـــــــادیێکم مـن نـەدی لـەم ژینـەدا**
**هەر لەپێش دەرگـایی عـیشـقـا خـاکـسـار**

دواتر دەڵێ:

**جێ نەهێـڵن بەربوت و قـانوون و عـوود**
**تاکـو لێـتـان تێک نەچێت بەکـیـبـار**
**وا دڵی (ناســیح) دەناڵێ چەشنی نەی**
**چونکە دڵ یێکەو غـەمـیشی سـەد هەزار**

لەم شیعرەدا ناسیح دەیەوێ هەموو جوانان کۆ بکاتەوە بۆ بەزمی شـەوێکی پڕ لەئاوازو مـۆسـیـقـا، لەوانەی شاعیرانی کلاسیک لەشیعرەکانیاندا وێنەیان کێشاوە. دلبەرەکەی خۆشی تەنیا لەدێڕی یەکەمدا ئەوەی بەرکەوتووە باس لەدوو زولفی بکا چۆن دەوری کوڵمی سووریان داوە. هەرچی شاعیر خۆشیەتی لەم بەزمەدا هیچی بەرنەکەوتووە، چونکە دڵ یەکێکەو خەفەت سەد هەزارە.

**شین بۆ سالمی کوری**

سالم حەیدەری (١٩٢٦-١٩٧٧) کوری شاعیر یەکێ بوو لەڕۆشنبیرو نیشتمانپەروەرانی کورد. خوێندنی باڵای لەزانستی کشتوکاڵدا تەواو کردبوو، لەمیسر کۆچی دوایی کردبوو، بەم هۆیەوە ناسیح دەڵێ:

**گــوڵی باغی ئەمــەلم تاقــەت و هێــزی لەتەنم**
**هەوینی ژین و حـەیاتم کـورەکـەی شـەنگ و شـەنم**
**ڕۆژو شـەو فـیکرو خـەیاڵم بوو کـەوا من دەمـرم**
**پاشی من سالم دەکا تەجهـیزی لەحدو کـەفـەنم**

* * *

**پاشی تۆ دنیــــــایی روونم لێ بووە داروززەلام**
**وەعی و ئیحـساسم نەماوە وا لەخۆم بێ خەبەرم**
**بۆچی بڕیاری جــودایت لەگــەڵ مندا وا بەزوو**
**ئاگـرت بەردا لەجـەرگم قـەت نەمـا هۆش لەسـەرم**

ئەمـە ناڵەی باوکـێکی پشت شکاوە لەدەروونێکی پڕ لەسۆزدوە بۆ جگەرگۆشـەکەی بووە بەشیعر. ئەوە ڕاسـتـە دایک و باوک نایانەوێ مەرگی منداڵیان ببینن، ئارەزووی ناسیح نەهاتە دی، بەوەی خۆی پێش کوڕە گەورەی بمرێ.

لەشیعرێکی دیکەیدا دەڵێ:

**رەفیقان توخودا گەر بوو سەفەرتان ئێوە لای یارم**
**بڵـێن پێی گـەر بزانێ ئەو لەژینم چەندە بێـزارم**
**نییە حاجەت بەخەنجەر گەر موورادی کوشتنی من بێ**
**بەنەبرۆ گــەر بکا ئیــمـا منم کـوژراوی دڵدارم**

لەکۆتاییدا دەڵێ:

**لەبۆ گـوڵ بۆ فـیغـان و زاری بولبـول هەر سـەحـەر خـێـزە**
**ئەتۆش (ناسیح) سەحەر خێز بی دەبینی کوڵمی گوڵنارم**

لەم شـیـعرەدا ناسیح لەیار دووره، لەباتی ئەوەی وەکو شاعیرانی دیکە بەخەیاڵ لەیار نزیک بێتەوە، هاوڕێیانی ڕادەسـپـێـرێ دەردی دڵی بۆ باس بکەن. حـەز بەوە دەکـا ئەوانیش خۆشیان بوێ، چونکە ئەمە دەبێتە بەڵگەی چێژی بەرزی ئەو جوانەی لەناو کیژە شەنگانەدا هەڵیبژاردووە.

لەتاکێکیدا ناسیح دەڵێ:

**چاوەکـەم پڕ ئاوە چاوم ڕۆژو شـەو بۆ چاوەکـەت**
**چاری چاوم کـەس نییـە بێـزانێ غـەیری چاوەکەت**

لەم دێڕە شیعرە جوانەدا شاعیر وشەی "چاو"ی چەند جارێک دووبارە کردۆتەوە. جگە لەپێشاندانی وێنەیێکی هونەری بۆ چاوی خـۆی، چاوی دلبـەر، جـۆرە داهێنانێکی ڕیتمی مۆسیـقی داوەتە شیـعـرەکـە بەدووبارەو سێـبـارە کردنەوەی وشەی "چاو".

**لوتفی**
**١٩٠٥-١٩٨٩**

**ژیانی**



لوتفی کوڕی شێخ ڕەزا شێتەی کوڕی مارفی قوولەیە، لەنەوەی شێخ حەسەنی گلەزەردەی بەرزنجییە. لەساڵی ١٩٠٥ لەگوندی پەلکانەی ناوچەی قەرەحەسەنی کەرکووک لەدایک بووە. "لوتفی" کـردووە بەنازناوی شـیـعـری.

لەتەمەنی شەش ساڵیدا لەحوجرەی مزگەوتی گوندی قۆین پەلک لەناوچەی دووز (تووزخورماتوو) خوێندوویەتی، لە پاشان چووە بۆ کەرکووک و لە مزگەوتی نائب ئۆغلی ماوەیەک بووە بەفەقێ. ئینجا شێخ عەبدولکەریمی دارەخورمای خاڵی ناردوویەتی بۆ گوندی دیبەگەی ناوچەی مەخموور. دوو ساڵ لەوێ خوێندوویەتی و گەڕاوەتەوە ئاوایی لەیلان لەکەرکووک، ماوەیێک لەوێ خوێندوویەتی و ئەوجا رووی کردۆتە گوندی خاڵۆبازیانی. لێرەدا زۆر نەماوەتەوە گەڕاوەتەوە کەرکووک و لەمزگەوتی ئیمام قاسم نیشتۆتەوە. دوا قۆناغی خوێندنی حوجرەی لەخانەقای سەید ئەحمەد بووە، لای مەلایانی گەورەی ئەو سەردەمە خوێندوویەتی. لەکاتێکدا ئامادە بووە خوێندنی تەواو بکا ئیجازەی مەلایەتی وەرنەگرتووە.

زۆربەی ژیانی لەناوچەکانی ساڵەیی و شوان بردۆتە سەر، خەریکی کشتوکاڵ بووە، بەزۆری بۆی نەهاتووەو دەستکورت بووە.

لەساڵی ١٩٣٩ لەکاتی کردنەوەی رێگای ئۆتۆمبێل لەنێوان هەولێرو رواندز بووە بەچاودێری کرێکارانی کارگێری رێگاوبان. بۆ دابینکردنی گوزەرانی لەکارکردن نەوەستاوە، هەندێ جار کاری میری پێ سپێردراوە، بۆ ماوەی دوو ساڵ لە ١٩٥٩ مووچەخۆر بووە لەشارەوانی کەرکووک. هەندێ جاریش لەگوندەکانی ناوچەی ساڵەیی مەلایی کردووە. لەسەرەتای هەشتاکانی سەدەی بیستەمەوە، کە دوا قۆناغی سەردەمی پیربوونی بوو لەگەڕەکی رەحیماوە لەکەرکووک نیشتەجێ بووە. لەڕۆژی ٢٣ی مایسی ١٩٨٩ لەکەرکووک کۆچی دوایی کردووە.

### شیعری

لوتفی وەک شاعیرێکی ئاسایی و لاسایی شیعری کلاسیکی و میللیی کوردی دەکەوێتە روو. بەرهەمی شیعری لەم لایەنەوە لەبەرچاوە. بایەخی بەهەردوو بابەت داوە بەقەوارە شیعری عەرووزی و کێشی میللی هێندەی یەکترین. لەشیعری عەرووزیدا تەنیا بەحرەکانی رەمەل و هەزەج و مەدیدی بەکارهێناوە. لەیەکێتیی قافیەدا دەنگەکانی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی: "ا ب د ر غ م ن (ە-ـە)ی ێ"ی بەکارهێناوە. لەپاش قافیە ئەم وشانە لەشیعریدا بەرچاو دەکەون: ئەکا، کرد، منم، خۆم، ئەکەم، نییە، هەیە، ئەبێ، ئەوی، بم (بیم).

شیعرە خۆماڵییەکانی لەڕووی کێشەوە زۆرن، لەمانەدا کێشی دە برگەیی و کەمتریش حەوت برگەیی بەکارهێناوە، قافیەی ئەم جۆرە شیعرەی مەسنەوییە، کەچی لوتفی یەکێتیی قافیەی بۆ ئەم جۆرە شیعرە بەکارهێناوە. ئەمە دیاردەیێکی دەگمەنەو کەم شاعیری کورد ئەم دەستوورەیان بەکارهێناوە. قەسیدەی بەندی چوارینی هەیە (اااب). زمانی شیعری ئاسانە، وێنەی رەوانبێژی زۆر نییە. لەناوەڕۆکدا مەبەستەکانی ئایینی و دڵداری و وەسف و نیشتمانپەروەری و کوردایەتی و ستایش و ماتەمنامەی هەیە. جار جارە دەم لەکۆمەڵایەتی و سیاسەتیش دەدا. لەسەرانسەری دیوانیدا هەست بەرەشبینییێک دەکرێ لەبیری شاعیردا. ئەمە لەپێشانیش لەئەنجامی هەڵسوکەوتی پەرێشانی و هەژاری خۆی و لەپاشان لەهەڵسوکەوتی نالەباری کۆمەڵایەتی و مەسەلەی نەتەوەیی کورد هەڵقوڵاوە.

### نموونەی شیعری دڵداری

لوتفی لە شیعرێکیدا دەڵێ:

**چاوەکانت بۆتە باعیس ئەشکی روونی چاوەکەم**
**تیغی ئەبرۆت باعیسە بۆ مەنعی خوردو خاوەکەم**
**غەمزەکانت هەروەکو تیرە لەدڵ تەئسیری کرد**
**بۆتە مەنعی خواردن و خەو ژین و نان و ئاوەکەم**
**دڵ وەکو راوچی ئەویش وا بۆتە کار ئاسکی خەتا**
**من خەتاکارم لەبۆیە بۆتە مانیع راوەکەم**

لەکۆتاییدا دەڵێ:

**بەس تەمەع (لوتفی) بکە دونیایی دوون باقی نییە**
**غەم بخۆ بۆ مردنی خۆت کوانێ تۆیی چاوەکەم**

ئەم گێتییە دڵدارییە شاعیر خۆی دروستی کردووە بۆ وەسفی برۆو غەمزەی دلبەر و راوکردنی دەشتی خەتاو ختەنی ئەفسانەی چین و باسکردنی قەیسی بێ چارە. لەناو هەموو ئەو گێتییە دڵدارییەدا شاعیر شپرزەیی ژیانی خۆی لەبیر نەچۆتەوە. راستە وێڵ و سەرگەردانە لەدەشت و چۆڵ لە لەیلا دەگەڕێ، بەڵام لەباوک و دایکیشی دوورن. شیعری ئەو لەهەر بابەتێک بێ لەواقیعی ژیانی تاڵی خۆی و رەشبینی دووری ناخاتەوە.

**کوردایەتی**

مەسەلەی نەتەوەیی کورد هەمیشە لەهەڵبەزین و دابەزیندا بووە. ئەمڕۆ لەخۆشی، سبەینێ لەناخۆشیدا بووە. لوتفیش وەکو شاعیرانی دیکە ئاوڕی لەم دیاردەیە داوەتەوە.

لەشیعرێکیدا لوتفی دڵشادەو دەڵێ:

**کوردستان مژدە بەیانی داوە!**
**خۆر لەسەر شاخت گوێچکەی کێشاوە**
**سەیری دنیا کە لە خوارو و لە ژوور**
**هەمووی بەیەکجار لەخەو هەڵساوە**
**هەر کەس لەم ڕۆژە سست بێ بزانە**
**ئەو لەکاروانی میللەت جێماوە**
**ڕۆژ ڕووناک شەوقی دا لە کوردستان**
**دووکەڵی غەم و غەدری پێچاوە**
**چەن ساڵە کە تۆ وا خەبات ئەکەی**
**بەجەورو خەفەت دەردو سزاوە**
**داری بەختەکەت وا هاتۆتە بەر**
**شنە شنێتی بەدەم سەباوە**
**زۆر ئاگاداربە دوژمنی ناکەس**
**تێکی بشکێنێ و بیخاتە لاوە**
**پشتی یەک بگرن ئەی میللەتی کورد**
**لەهەر کوێیێ بێ هەن لەڕووی دنیاوە**
**لەبیرتان نەچێ دەستم بەدامان**
**لەو غەدرەی کەوا لەکورد کراوە**
**خزمەت بێگانە زۆر بێ بەقایە**
**مەعلووم خزمەتکار هەر دەرکراوە**
**(لوتفی) بێنە یاد کردەوەی پێشوو**
**دەرحەق بەکوردان کەچی کراوە**

ئەم شیعرە بۆ پێشوازی بەیانە گرنگەکەی ١١ی مارتی ١٩٧٠ دانراوە. لەئەنجامی ڕاپەڕینی کوردی عێراق لەشەستەکانی سەدەی بیستەمدا ئەتۆنۆمی بەناوی هەرێمی کوردستانی عێراق دامەزرا. کەچی فێڵ و فەنەری کاربەدەستانی بەغدا لەبنەڕەتدا بەڕاستیان نەبوو، تەکتیکێک بوو بەکاریان هێنا بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەی کورد لەداهاتوویێکی نزیکدا. هەڵەی کورد خۆی و ڕێگادان بەوەی جڵەوی ئەسپەکەی بکەوێتە دەست هاوسێی بێگانەی دوژمن بووە هۆی تێکشکانی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ی کوردستانی عێراق و ئەڤتۆنۆمی سەر نەگرێ و کورد بکەوێتەوە دابەزین و ناخۆشییەوە.

لوتفی ئەم تێکشکانەی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ بەم جۆرە وەسف دەکا:

**کوردە نازانی کە چی ڕووی داوە!**
**دنیا بەجاری چۆن شڵەژاوە**
**گەورە تا بچووک گشت دەردەدارە**
**هەریەک بەجۆرێ بەغەم دووچارە**
**عەقڵ و شوعوورت داخوا چۆن ماوە**
**فرمێسکی چاوت وەکو خوێناوە**
**لەهەندێ جێگە خوێن وەک لافاوە**
**چەند نەوجەوانان بەبێ گیان ماوە**
**ئەوەی هەزارە یەکجار خوراوە**
**بنیادی بێ ڕووح بەپاوە ماوە**
**چەپۆکی دوژمن وەک تەرزەی بەهار**
**لە هەموو لاوە بۆ کوردی هەژار**
**دەخیل بەدەرگات ئەی خودای گەورە**
**پەنامان بدەی لەم چەرخ و دەورە**

بەم شێوەیە شاعیر کۆتایی بەشیعرەکە دێنێ:

**(لوتفی) با بەس بێ گریانی بێ سوود**
**ڕازی بەتەقدیر خالیقی مەعبوود**

ئەمە وەسفێکی میللییانەو شاعیرانەی کوردە لەدوای تێکشکانی بەیانی ١١ی مارتی ١٩٧٠ لە ١١ی مارتی ١٩٧٥. لێرەدا لوتفی مێژوونووس نییە ڕووداوەکان تۆمار بکا، بەڵکو بەگشتی وێنەی هەست و نەستی ناوەوەی کەسی کورد دەکێشی. فرمێسکیان بۆ دەڕێژێ و لەکردگار دەپاڕێتەوە لەکارەساتی دیکە بیانپارێزێ.

لە شیعرێکی دیکەیدا لوتفی لەباسی کۆماری کوردستاندا دەڵێ:

**دڵ لەدووریت وا دیارە مەیلی گریانی هەیە**
**هەورەکەی میحنەت ئەهات و تاوی بارانی هەیە**
**وا لەشاخ و چۆڵا خەوتوو چاو بەنەشک و دڵ بەغەم**
**ئیمرۆ ڕۆژی شادی کوردە کەیفی شارانی هەیە**
**زۆر لەمێژە تینەکوشێ کاکە بۆ تۆ خاکەکەت**

**دڵ ئومێدداره کە ئەمجار فیکری جارانی هەیە**
**رووم نەبوو من دابنیشم تێکەڵی وەجبەی رەفیق**
**وا ئەزانم ئیمرۆکە دڵ مەیلی خەندانی هەیە**
**داری بەختم روو لەوشکی رۆژ بەرۆژ هەر کز ئەبوو**
**ئیمرۆ چووزەرەی دیارە رۆژی نیسانی هەیە**
**خادیم و جاگیر مەبە ئەی کاکی خۆم بۆ هیچ کەسێ**
**عالەمیش وەک تۆ بۆ ئەمرۆ گشت گریبانی هەیە**
**(لوتفی) باغی ئەمەلی تۆ هاتە بەر چاو هەڵبرە**
**هەر لەسایەی حەمدی خواوە تەیری خۆشخوانی هەیە**

لەسەرەتادا ئەم شیعرە ئەوە دەگەیەنێ شاعیر لەبەر دووری لەیار هەمیشە شین و شەپۆڕ و واوەیلایەتی، لەپاشان دڵشادو گوشاد دەبێ، کە بەدیداری ئەو یارە شاد دەبێ، وەک لیریکێکی دڵداری دەکەوێتە بەرچاو. ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەم شیعرە لەساڵی ١٩٤٦ هۆنراوەتەوە لەو کاتەی کۆماری کوردستان لەمەهاباد دامەزرا بوو. پێش ئەوە شاعیر پەشۆکا بوو بۆ کورد، لەدواییدا کە لەکوردستانی ئێران سەربەستی دەست خست، بوو بەڕۆژی شادی بۆ شاعیر. چونکە سەربەستی کورد ڕەمزی دلبەرەکەی شاعیر بوو. لەخوێندنەوەی ئەم لیریکە لەڕووی کێش و قافیەو پاش قافیەو وشەو دامەزراندنی ڕستەوە شێوازی نالی دێتەوە یادی خوێنەر.

### ستایشی عەشرەتی شوان

لەستایشی عەشرەتی شواندا، لوتفی شیعرێکی هەیەو ئێمە کەمێکی لێ وەردەگرین:

**ئەوەندە گەڕام لەسەر ڕووی جیهان**
**داوودەو بەیات چوار کۆمەی شێخان**
**زەنگنەو جەبباری هەمەوەند تەواو**
**جاف گەڵباغی گەلاڵی گۆران**
**پشدەرو مەنگوڕ هەم دەشتی بیتوێن**
**شارەزوور هەموو هەتا بازیان**
**نەمدی خاکێکی وەک خاکی شوان**
**هەوای دڵگیر بێ بۆ دانیشتووان**
**دەک ئاوەدان بی بەهەشتی کوردان**
**ئەرازی بێ عەیب جێگەی دەغڵ و دان**

لەم شیعرەدا لوتفی لەعەشرەتی شوان و ناوچەی شوان لەکەرکووک دەدوێ. لەشیعری پەروەردەیی (دیداکتیکی) دەکا بۆ قوتابیان هۆنرابێتەوە، لەبارەی جێگەو شوێن و جوگرافیای ئەو خاکەی عەشرەتی شوانی لێ دەژی. یادی داوودەو بەیات و زەنگنەو جەباری، هەمەوەندو جافی گەڵباغی و گەلاڵی و پشدەرو مەنگوڕ دەکاتەوە. باسی هەرێم و ناوچەکانی شێخان و بیتوێن و شارەزوورو بازیان دەکا. هەموو ئەمانەی بۆ ئەوەیە بڵێ ناوچەی شوان لەمانە جوانترو ڕەنگینترە. هەروەها یادی چیای سەگرمەی ناوچەی سەنگاو دەکاتەوە. چیای خاڵخالانیشی لەیاد نەکردووە، چونکە بەڵگەی جوانی ناوچەی شوانە. شاعیر بە وتەیێکی کۆمیدی جوان کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ، کە بەخۆی دەڵێ بۆچ ئەم جوانییەت بەجێ هێشت و لەناو ئەم خەڵکە چوویتە دەرەوە!

## دەشتی
## ١٩٠٩-١٩٥٧



### ژیانی

خدر کوڕی ئەحمەد کوڕی عەلی لەبنەماڵەو عەشرەتی نانەکەلییە. لەساڵی ١٩٠٩ لەگوندی مەلاکاغەی بناری چیای قەرەچووغ لەدایک بووە. لەخێزانێکی جووتیاری دەستکورت پەروەردە کراوە، لەو کاتەی هەستی بەوە کردووە دەتوانێ شیعر بنووسێ نازناوی "دەشتی" لەخۆی ناوە بۆ تۆماری شیعری.

دەشتی منداڵ بووە، کە ماڵیان گوێزراوەتەوە هەولێر،

لەو سەردەمەدا خراوەتە بەر خوێندن لەحوجرەی مزگەوت. وەکو نەریتی خوێندنی ئایینی ئەو کاتە دەشتی رووی کردۆتە هەندێ لەو گوندانەی حوجرەی خوێندنی مەلایەتییان تێدا بووە لەشارو دەشتی هەولێرو ناوچەی خۆشناوەتی، بەتایبەتی شەقلاوەو بێتواتە. ماوەیەکی زۆر لەو ئاواییانە ماوەتەوە، قۆناغێکی زۆری خوێندنی ئایینی بڕیوە، ئینجا گەڕاوەتەوە هەولێرو لەمزگەوتی حاجی قادری دەباغ خەریکی خوێندن بۆتەوەو دوا قۆناغی خوێندنی بردۆتە سەرو لەسەر دەستی مەلا عەبدوڵلای بێتواتەیی ئیجازەی دوازدە زانستییەکەی وەرگرتووە. ئینجا ژنی هێناوە، خەریکی مەلایەتی بووە. بۆ یەکەم جار بە مەلای گوندی دارەبەن لەلای باکووری رۆژئاوای نزیک هەولێر دامەزراوە. ماوەی هەڤدە ساڵ لەوێ ماوەتەوە. لەدواییدا کردەوەی ئاغای گوند بۆتە هۆی ئەوەی دڵی لێ بشکێ و ناچار بێ لەوێ بار بکا بۆ گوندی گردەچاڵ (١٩٥٣) و ماوەییێکی کەم مەلایەتی لێ دەکاو دەگەڕێتەوە هەولێر. بۆ دواجار هەر بەپیشەی مەلایەتی لەساڵی ١٩٥٥ ڕوو دەکاتە گوندی خەرابەدراو لەنزیک هەولێر.

دەشتی ئازاری هەبوو لەدەست نەخۆشی دڵ، ئەم دەردە تەمەنی درێژی پێ ڕەوا نەبینی، لەساڵی ١٩٥٧ لەگوندی خەرابەدراو کۆچی دوایی کردو لەگۆڕستانی ئەوێ بەخاک سپێررا.

**شیعری**

تەمەنی دەشتی درێژ نەبوو، هەمووی بەپیشەی مەلایەتی و شیعر وتن بردۆتە سەر. شیعری کەمە، بەڵام بابەتە گرنگەکانی سەردەمی خۆی لەرووی ڕوخسارو ناوەرۆکەوە نوێیە.

**شیعری لەرووی ڕوخسارەوە**

دەشتی لەدەستوورو نەریتی قوتابخانەی شیعری کرمانجیی باشووری نالی نەچۆتە دەرەوە. ئاوڕی لەشیعری کێشی سیلابی خۆماڵی و جووت قافیە (مەسنەوی) نەداوەتەوە.

بۆ روونکردنەوەی شیعری دەشتی لەرووی ڕوخسارەوە دەکرێ سرنجی ئەم تێبینیانە بدرێ:

١- شیعری کەم بووە، کەچی زۆرترین بەحری عەرووزی لەکێشەکانیدا بەکار هێناون: هەزەج، ڕەمەل، موزاریع، موتەقاریب، بەسیت، ڕەجەز، سەریع.

٢- لەقافیەدا ئەم دەنگانەی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی بەکارهێناوە: ا ب ت د ز م ن (ە-ە) وو ۆ ی ێ.

٣- لەپاش قافیەدا ئەم وشەو رستانەی بەکارهێناوە: تۆ، محەممەد، یارەسوولەڵڵا، کردین، ئیمرۆ، دەکا، چبکەم، دڵی من، باغی گوڵان، یارەب، بوو، کوردانم، بەسەرداهات، چوو، بم (ببم)، دێ (دێت)، ناکەوێ، بێ (ببێ).

٤- بەشی هەرە زۆری شیعری دەچنە ناو خانەی غەزەلەوە (لیریک) ئەوانەی ژمارەی دێڕە شیعریان لەدوازدە کەمترە.

٥- چەند قەسیدەیێکی هەیە لەوانەی لەدوازدە دێڕ زیاترن، لەناو ئەمانەدا قەسیدەی دەوروبەری سی دێڕی بەرچاو دەکەوێ.

٦- دوو سێ قەسیدەی بەندی پێنجی هەیە (ا ا ا ا ب).

٧- یەک دوو قەسیدەی بەندی چوارینیش (ا ا ا ب) لەدیوانیدا دەبینرێن.

٨- مەولوودنامەی دەشتی بەزمانی کوردی لە زیاتر لەچوارسەد دێڕە شیعری مەسنەوی عەرووزی پێک هاتووە، لەساڵی ١٩٨٨ چاپ کراوە. ئەم بەرهەمە لەشاری هەولێرو دەوروبەری ناوی هەیە، لەهەندێ ئاهەنگی مەولوودی پێغەمبەر دەخوێنرێ.

٩- زمانی شیعری دەشتی ساکارە، مانا لەرووە. وشەی فەرهەنگی شیعری کرمانجیی باشوور بەکاردێنێ، واتە هەندێ لەوشەکانی بێگانەن، کەچی لەماناادا قورس نین. لەڕەوانبێژی گەمەی هونەری داهێنراوی هەیە، وەک لاساییکردنەوەی شیعری کلاسیکی شاعیرە کۆنەکان دەکەوێتە بەرچاو.

**شیعری لەرووی ناوەرۆکەوە**

دەشتی لەهەموو مەبەست و بابەتەکانی شیعری کلاسیکی نەوتووە. لەکۆنەکە بایەخی بەشیعری دڵداری و وەسفی دلبەر داوە، ئەگەر سروشتی بەکارهێنانی بۆ مەبەستی دڵداری بووە. تخوونی مەبەستەکانی دیکە نەکەوتووە، ئەوە نەبێ شیوەنی بۆ کۆچی دوایی شێخ

مەحموود کردووەو ماتەمنامەی بۆ نووسیوە.

ناوەڕۆکی تازەی سەردەم لەلای دەشتی وەکو شاعیرانی دیکە مەبەستەکانی نیشتمانپەروەری و سیاسی و کوردایەتییە ئەمەی خستۆتە ناو قالبی شیعرە عەرووزییەکانییەوە. لەم لایەنەوە داهێنانی هەیەو ئەم بابەتە بەرهەمەی دەچێتە ناو ئەو دیوانە شیعرییە کوردییەی بەناوەڕۆک تازەیەو بەروخسار کێش و قافیە کۆنە.

**نموونەی شیعری**

**وسف و دلداری**

لەشیعرێکیدا کە چەند دێڕێکی وەردەگرین دەشتی دەڵێ:

**سوبحەینەیی هیجرانی تۆ ئەمڕۆ کە دەری بوو**
**وەک ڕەوزەیی سینەی سەدەفی تۆ خەبەری بوو**
**بولبول لە فیغان و دڵی بێکەس لە جەفادا**
**فەسڵێ کە ئیرەم غونچەیی بێ خەندە دەری بوو**
**هەر چەندە کە پارامەوە لەم زولفەیی چینت**
**بێ فائیدە ئاخر ئەمەلم دەردەسەری بوو**
**چاوم ئەتەکێنێتەوە ڕەنگی سەری کوڵمت**
**لەم ڕۆژەوە ئەبرۆیی کەچی تۆ شەرەری بوو**

لەم شیعرەدا دەشتی گفتوگۆ لەگەڵ دلبەردا دەکا، بەڵام لەگەڵی نییە، لێی دوورە. شپرزەیی خۆی لەبەر دووری لەخۆشەویست بەراورد دەکا لەگەڵ ناڵەی بلبل بۆ گوڵ. وێنەی جوانی ڕەوانبێژی تێدایە، وەکو فرمێسکی چاوی شاعیر لەڕەنگی سەر کوڵمی بیارە، هەردووکیان سوورن، یەکەمیان بەڵگەی ناخۆشییەو دووەمیان ڕەمزی خۆشییە، واتە جوانی.

**گەمەی ڕەوانبێژی**

لەگەمەیێکی ڕەوانبێژیدا دەشتی دەڵێ:

**دلبەرا فەوتا لەسەر ئەم ڕێگا عەین و میم و ڕێ**
**عەمرەکەم چوو یەک هەناسەم ماوە دەرچێ ڕێ و حێ**
**ڕووحە تۆزی گەردو ژێرپایی ویساڵت یەک قەدەم**
**گەر هەڵێنێ بۆ عیبادەت بێ بەنوون و ئەلف و زێ**
**نازی چاوت شوبهی داوت چێن بەچێن ئاشق کوژن**
**قەت نەبوو جارێ بترسی تۆ لە حێ و شێن و ڕێ**
**حەشری زولفی تۆ لەگەڵ کافر یەقین هەمتا دەبێ**
**چونکە پۆشیی لە عالەم ڕێ و واو و میم و تێ**

لەم شیعرەدا دەشتی نیو دێری یەکەم و هەموو نیوە دێڕە دووەمەکانی بەچەند تیپێک کۆتایی پێ هێناوە. ئەو وشەیەی لەئەنجامی یەکگرتنی تیپەکان دروست دەبێ لەسەرەتای هەموو نیوە دێڕە یەکەمەکان بەکاری هێناوە. وشەکان ئەمانەن: عومر، ڕووح، ناز، حەشر، ڕوومەت، جەننەت، ئۆف.

لەگەمەیێکی ڕەوانبێژی لەفزیدا دەڵێ:

**یاری عەلەمدارەکەم هاتەوە سەر شارەکەم**
**هاتەوە سەر شارەکەم یاری عەلەمدارەکەم**
**لازمە سەرچاوەکەم تاکو ڕەقیب دێتەوە**
**تاکو ڕەقیب دێتەوە لازمە سەرچاوەکەم**

لە کۆتاییدا دەڵێ

**قیمەتی ئەشعارەکەم حەیفە بە (دەشتی) نەدەی**
**حەیفە بە (دەشتی) نەدەی قیمەتی ئەشعارەکەم**

ئەگەر هەر نیوە دێڕی لەم لیریکە بکرێ بەدوو کەرتەوە، بۆ بەڵگە "یاری عەلەمدارەکەم" لەبەحری عەرووز بەسیتی مەتوییە (مفتعلن فاعلن)ن بەکێشی سیلابی خۆماڵی حەوت بڕگەیە. شاعیر هاتووە دوو کەرتی نیوە دێڕی یەکەمی شیعرەکەی ئاڵوگۆڕ کردووە لەنیوە دێڕی دووەمدا. بەم پێیە ئەم لیریکە نۆ دێڕییە ئەگەر دووبارەکردنەوەی تێدا نەبێ دەبێتە نیو ئەوەندەی کە هەیە. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمە دەتوانرێ شیعرەکە لەڕووی ئەندازیارییەوە بەم شێوەیە بنووسرێتەوە:

**یاری عەلەمدارەکەم**
**هاتەوە سەر شارەکەم**
**هاتەوە سەر شارەکەم**
**یاری عەلەمدارەکەم**

**نیشتمانپەروەری و کوردایەتی**

لەشیعرێکیدا دەشتی دەڵێ:

**ئەی عێراقی بێکەس و دڵ پڕ لەئێش و دەردو غەم**
**وەی ئەسیری حەربی نارێکی لە مەیدانی بە تەم**
**حەیفە پاشی تۆ بمێنێ کوردەکانی بێ حەشەم**
**چوو لەدەستیان مەعدەنی عیزز و شەرەف بەینەلکەرەم**
**ئەی گەلی ئەشرافی کوردان بۆ غەریقی زیللەتن**

**بۆچی وا داتیم خەریکی قووتی مولک و میللەتن**
**بۆچی وا دەعیەو تەکەببور لێئەدەن پڕ حیددەتن**
**چاکە شەرمێ کەن لە عالەم بەخۆ کاکەن لە دەم**

لە کۆتاییدا دەڵێ:

**چاکە فکرێکەن لە ئیستیقبالی خۆ زوو چارەکەن**
**تەرکی وەحشەت کەن سیلاحی یەکدی کوشتن پارەکەن**
**ڕوو لە پەیداکردنی ئالاتی وەک تەییارەکەن**
**تاوەکو (دەشتی) نەبێ مەشغوولی قال و قیلی غەم**

لەم شیعرەدا دەشتی پەنجە بۆ هەندێ مەسەلەی سیاسی ئەو سەردەمە درێژ دەکا. لەکاتێکدا ئەم شیعرەی وتووە ڕاپەڕینەکانی کورد هەندێ کپ بووە. ئیتر شاعیر ویستوویەتی ئامانجی کورد لەگەڵ بوونی عێراق بگونجێنێ. بێ گومان ئەوەی لەبیر نەچووە کورد دواکەوتووە، بۆیە ئامۆژگاریان دەکا بۆ پێشکەوتن. شاعیر باباگوڕگوڕی کەرکووکی کردووە بەرەمز، تەنیا لەبەر نەوت نا، بەڵکو لەبەر کوردستان. عەرەب و تورک و عەجەم بەشیان کردووە. ئینجا کورد هان دەداو پێیان دەڵێ بەپیشەسازی و تەکنیک و هونەر نەبێ پێش ناکەون.

پیشەی دەشتی بیرکردنەوەیە لەدواکەوتوویی کورد:

**بۆ نیگبەتی ئەم میللەتە بێ جانە دڵی من**
**بۆ میللەتی ئازوردە لەزەلیلانە دڵی من**
**بۆ حیددەتی ئەم کوردە لەترسانە دڵی من**
**بۆ زیللەتی ئەم کوردە لەگریانە دڵی من**
**کوردینە وەرن شەریەتی ڕێکی بەدەما کەن**
**ئەم مولکە لەدەست عالەمی بێگانە ڕەها کەن**
**یەکدی مەکوژن ڕوویی سەنایع لەهەوا کەن**
**بەم ئاووری ڕووناکییە سووتاوە دڵی من**
**خاکی وەتەنی ئێوەیە هەردەم کە دەناڵێ**
**سەد حەیفە کە ئەم مەعدەنە ئەڕوا بە بەتاڵی**
**ئەمڕۆکە سبەی دێتەوە بۆ حەربی شیمالی**
**بۆ سەنعەتی تەییارە لەهاوارە دڵی من**
**لۆکەی وەتەنی ئێوەیە ئەمڕۆ بووە دینار**
**ڕووحی وەتەنی ئێوەیە ئەم فلسی خەریدار**
**بەم حاڵەیە (دەشتی) کە دەبێ عاجزو بیمار**
**هەردەم کە خەفەتخان و برینداره دڵی من**

دڵی شاعیر هەمیشە لەگریان و شین و شەپۆڕو واوەیلا دایە، چونکە نەتەوەکەی تووشی نەگبەتی بووە، هۆی ئەمە نەبوونی یەکێتییە، لەبەر ئەوە ژێر دەستن. نیشتمانی کورد دەوڵەمەندە هەمووی کانی مەعدەنە، کشتوکاڵی لۆکەیە، ئەمانەن سەرچاوەی پێشکەوتنی پیشەسازی و بەتایبەتی دروستکردنی فڕۆکە.

بەناوی "کەرکووکی زەلیلم" لەشیعرێکیدا دەشتی باس لەکەرکووکی کوردان دەکا:

**زاڵم وەرە ئەم فیتنەیەوو ئەم حاڵە هەتاکەی**
**واچاکە لەڕوومەت لەمن و ڕوو لەخودا کەی**
**بێ فائیدە ئەم خوێنە هەتاکەی بڕژێنم**
**وا چاکە کە ڕەحمی بەدڵی پڕ لەجەفاکەی**
**قوللابەیی زوڵفی تۆ وەکو لەشکری کوردن**
**بۆجەوری دڵی عاشقە زنجیری جەفاکە**
**تالیب بەعیراقی تووە دڵ هەر دەمە ئەمما**
**شێواوە لەگێژی عەرەبا زێڕو قەڵاکەی**

شاعیر بەردەوام دەبێ و دەڵێ:

**ڕووحی منە گازی دەمە ئەم گازە کە ئەڕوا**
**کەرکووکی زەلیلم چییە ئەم زیللەتە تاکەی**
**بەم داغە ئەسەف دەستم و هەردەم کە لەشینم**
**بۆ بیدعەتی لبنانیی و هەم سەیرو سەفاکەی**
**مەعلومە قوبایی غەزەلت دوو شتە ئیمڕۆ**
**(دەشتی) وەرە وا چاترە دوو باسی تیاکەی**

لەو ڕۆژەوە دەوڵەتی عێراق دامەزراوە داگیرکەری ئینگلیزو قەومییە شۆڤێنییەکانی عەرەب لەپێناوی بەرژەوەندی خۆیان کەرکووکیان بەکوردستان نەزانیوە. کوردیش لەو ڕۆژەوە ئەو شارەی بەکوردستان زانیوە، بەمەڵبەندی هەموو دانیشتوانی لە کەمە نەتەوایەتییەکان حسێب کردووە. شاعیر ڕۆمانتیکییانە کەرکووکی کردووە بەدلبەرە جوانەکە. دڵدارانی کوردن و عێراقین، بەڵام عەرەب بۆچ زێڕو قەڵای ئەم بووکە جوانە داگیر بکا! زێڕی بووک نەوتەکەیە، قەڵاکەش کۆشک و باڵەخانەیەتی. لەلایێکی دیکەوە دەشتی پەنجە بۆ ئینگلیز درێژ دەکا، ئەوەی تەنیا لەچاکەی خۆی دەگەڕێ و گوێی لەخەڵکی عێراق نییە. ئینگلیز مەعدەن و ئامێری پیشەسازی لەشاری عەدەنی جزیرەی عەرەبەوە دێنێ بۆ ئەوەی نەوتی

لێ دەربێنێ. لەم شیعرەدا دەشتی بەشێوازێکی سیمبۆلییانە باس لەهەندێ دیاردەی زانستی و پیشەسازی دەکا، کەچی لەڕووی جوانکارییەوە داهێنانی دەست خستووە.

## موخلیس
١٩٨٥-١٩١٠



### ژیانی

خەلیل کوڕی ڕەسوڵ کوڕی مستەفا لە عەشرەتی سنجاوییە، لەبابەت خۆیەوە دەڵێ:

**کوردم و سنجاوی تیرەم هەم لە سەنعەتدا مەلام**
**نیشتمانمانە عێراق و شاری هەولێرە لیوام**

خەلیل لەساڵی ١٩١٠ لەهەواری گوندی شۆڕەزەرتکەی ناوچەی دەشتی کەندێناوەی هەولێر لەدایک بووە. لەتەمەنی پێنج ساڵیدا باوکی مردووە. دایکی پەروەردەی کردووە. سەرەتای خوێندنی لای مامی بووە لە گوندی دووسەرد، لەپاشان قۆناغی فەقێیەتی لە زۆر جێگە بردۆتە سەر. لەساڵانی ١٩٣٢-١٩٤٣ لەگوندی کەنداڵ نزیک مەخموورو گوندی سووریژەی سەر بەقوشتەپەو گوندی پیرداود خوێندوویەتی. لەدواییدا لەقۆناغی موستەعیدیدا لای مەلا شێخ جەلالی بەرزنجی کانی کوردەیی لەگوندی ترپەسپیان خوێندنی بردۆتە سەر، ماوەییێکیش لەگوندی چەغەمیرەی ناوچەی کەندێناوە بووە، ئەوجا خۆی گەیاندۆتە لای مەلا سالحی کۆزەپانکە لەهەولێرو لەساڵانی ١٩٤٣-١٩٤٤ لای ئەو خوێندوویەتی و ئیجازەی مەلایەتی لێ وەرگرتووە.

لەسەرەتای شیعر نووسینیدا نازناوی "وافی" بووە، لەهەندێ بەرهەمیدا بەکاری هێناوە تا ساڵی ١٩٤٣. لەساڵی ١٩٤٤ نازناوی "موخلیس"ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە و بووە بەسۆفیی نەقشبەندی و تەریقەتی لەسەر دەستی شێخ مستەفای هەرشەمی نەقشبەندی وەرگرتووە، تا مردنی دڵسۆزی ئەو تەریقەتە بووە.

لەدوای ئیجازە وەرگرتنی مەلایەتی لەهەولێر گەڕاوەتەوە گوندی دووسەردو لەجێی مامی بووە بەمەلای گوند، فەتاح ئاغای دزەیی چاودێری باشی موخلیس و حوجرەو قوتابییانی مەدرەسەی کردووە. شاعیر لەهەستی دەروونی ناوەوەی ناسک بووە، پەیوەندی لەگەڵ ماڵ و منداڵی ڕێک نەبووە، لەبەر ئەوە هەندێ کردەوەی نائاسایی لێی ڕووی داوە. لەساڵی ١٩٥٢ لەماڵ زویر دەبێ، بەبێ ئەوەی کەس بزانێ لەگوند دەچێتە دەرەوەو چەند مانگێک لەقزرابات و کفری دەمێنێتەوە، لەدواییدا دەگەڕێتەوە زێدی خۆی.

لەسەر ڕەوشتە تایبەتییەکەی خۆی لەساڵی ١٩٦٤ گوندی دووسەرە بەجێ دێڵێ و ڕوو دەکاتە هەولێر، ماوەییێک مەلایەتی دەکا، زۆری پێ ناچێ بار دەکاتە فەلووجەو دەبێتە مەلا لەمزگەوتی گەورەی شارو زانستی مەنتیق (لۆجیک) دەڵێتەوە. لەو ماوەیەدا هەوەسی گەشتی سووریاو حیجاز دەکەوێتە سەری، بەڵام پەشیمان دەبێتەوە. ئیتر ناچار دەبێ ڕوو دەکاتە هەولێرو لەوێوە دەگەڕێتەوە دووسەردو خەریکی مەلایەتی دەبێ تا ساڵی ١٩٧٥. لەو ساڵەدا بەیەکجاری ئەو ئاواییە بەجێ دێڵێ و ڕوو دەکاتە شەقڵاوەو لەخانەقای شێخ مستەفای هەرشەمی نەقشبەندیدا ژیانی داهاتووی دەباتە سەر. بەشێکی زۆری ژیانی شەقڵاوەی بەنەخۆشی دەگەیەنێتە ئەنجام، کە نەخۆشی تەنگی پێ هەڵدەچنێ و دەیگوێزنەوە نەخۆشخانەی هەولێر. مەرگ بەهێزتر دەبێ و لەڕۆژی ٥ی حوزەیرانی ١٩٨٥ کۆچی دوایی دەکا، تەرمەکەی دەبەنە گوندی پیرداودو لەگۆڕستانی ئەوێ بەخاکی دەسپێرن.

## شیعری

ئیلهامی شیعری و هەوەسی نووسین لەم مەیدانەدا لەساڵی ١٩٣٠ لای موخلیس دروست بووە، دیوانی شاعیرانی کلاسیکی خوێندۆتەوە، چێژی لە بەرهەمی گەورە شاعیرانی کۆن و نوێ وەرگرتووە. کاری هەندێکیان بەسەر شیعرییەوە دیارە، هی دیکەیان خۆی سەر بەو شێوازەیە، کە ئەوان لەشیعر داناندا لەسەری ڕۆیشتوون. تارمایی نالی و حاجی و حەمدی و سافی و بێخود لەشیعریدا دەکەوێتە بەرچاو. لەنێوەندی ئەدەبی سەردەمی خۆی نزیک بووە. خزمایەتی لەگەڵ شاعیری هەولێری "دەشتی"دا بووە.

دیوانی شیعری موخلیس تائێستا چاپ نەکراوە. دەسنووسی دیوانەکە لای کەسوکاری و ئیبراهیم ئەحمەد شوانی پارێزراوە، هەروەها نامەی ماجستێری ئەو لەبابەت ژیان و شیعری ئەو شاعیرە بوو (١٩٨٩)، ئەمەش تائێستا چاپ نەکراوە. جگە لەشیعر، موخلیس نامەی شیعری هەیە وەکو "مەولوودنامەی کوردی" لەساڵی ١٩٦٨ لەهەولێر چاپ کراوە. نامەیێکی شیعری دیکەی هەیە بەناوی "هیجرەتنامەی کوردی" ئەمەیان هێشتا هەر دەسنووسە.

## شیعری لەڕووی ڕوخسارەوە

هەندێ لایەنی شیعری لەڕووی ڕوخسارەوە بەپێی زانیاریی ئەم خاڵانە روون دەبێتەوە:

١- بەگشتی بابەتی شیعری غەزەل (لیریک) و قەسیدەیە، لەڕووی کورتی و درێژی شیعرەوە.
٢- بایەخی بەپێنجین داوە، هەروەها قەسیدەی چوارینیش لەدیوانیدا بەرچاو دەکەوێ،
٣- کۆمەڵێک چوارین و تاکی داناوە. هەندێ بیری دانایی و کۆمەڵایەتی و دڵداری و ئایینی تیایاندا کۆکردۆتەوە.
٤- بەهۆی ئاگاداری شاعیر لەزمانی هاوسێیانی کورد لەهەندێ شیعریدا ئەو زمانانەی لەگەڵ کوردی بەکارهێناوە، ئیتر بابەتی مولەممەع دروست بووە.
٥- هەموو شیعری موخلیس لەڕووی کێشەوە دەچنەوە سەر بەحری عەرووز. زۆربەی شیعری لەسەر بەحری ڕەمەلن، لەو کەمتر لەسەر بەحری هەزەج دایناون. لەسەر بەحری موزاریعیشی هەیە، لەو کەمتر ڕەجەزی بەکارهێناوە. لەقافیە لەسیستێمی یەکێتیی قافیە لای نەداوە، چونکە سروشتی کێشە عەرووزییەکانی ئەو جۆرە قافیەیە دەخوازن.
٦- بەشێکی زۆری دەنگەکانی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی لەقافیەی شیعریدا بەکارهێناوە، ئەم دەنگانە دەکەونە بەرچاو: ا ب ت ج خ د ر س ف ل م ن (ە-ـە) و وو ی ێ.
٧- لەپاش قافیە دەوڵەمەندە، ئەم وشەو ڕستانەی بەکارهێناوە: تووە (تۆیە)، تەیە (تۆیە- کرمانجیی باکوور)، نایێ، دەکەی، دەکەم، دەکرد، ناکەوێ، مەکە، دەکا، خودا، هەبێ، دزەیی، ئەو شەو، بکەم، ئەوە، دۆست، منە، بۆچییە، نییە، ڕۆیی، دەبیێ، چوو، تێ بگا، ئەورۆکە، دەگەڕا، هێشتا، چەند، لەمێژە، هەموو، نەدا، مەبە، نەبا (نەبوایە)، دەوێ، بی، مەکە، چبکەم، دەکەم، نەماوە، ما (ئێمە)، بووە، مەکە، بەقسە، دەڕوا، بێتێ (ببیێ)، دەکا، منە، ئەمن، بابێ، دڵم، ڕۆخ، لێم، نادا، ببێ، (ببیستە).
٨- زمانی شیعری ئاسان و ڕەوانە. بەزەقی شەقڵی دیالێکتی ناوچەیی هەولێر (سۆرانی) بەشیعرییەوە دیارە. لەو کاتەی شاعیر سوورە لەسەر بەجێهێنانی هەموو مەرجەکانی شیعری کلاسیکی لەڕووی ڕوخسارو ناوەڕۆکەوە، ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە ناوی بۆ شیعرەکان داناوە، بەپێچەوانەی شاعیرە کۆنە کلاسیکییەکان.
٩- بایەخی بەڕەوانبێژی کلاسیکی داوە بەهەموو بابەتەکانییەوە، نەک تەنیا بەڕستەی کورتی وێنەی شیعری، بەڵکو شیعری بەتایبەتی داناوە بۆ گەمەکردنی هونەری لە ڕیتم و مۆسیقاوە، هەروەها کەرت کردنی تەفعیلە عەرووزییەکان بۆ ئەوەی لەکێشە سیلابییە خۆماڵییەکان نزیک بینەوە.

## شیعری لەڕووی ناوەڕۆکەوە

موخلیس هەوەسی لەگەڵ "شیعری نوێ"دا نەبووە، پێی خۆش نەبووەو چێژی لێ وەرنەگرتووە، لەگەڵ ئەوەشدا بەهۆی شارەزایی لەنەریت و ڕەوشتی کۆمەڵایەتی، بەتایبەتی فۆلکلۆری و ئەتنۆگرافی ئەوەی پێوەندی بەژیانی دەشتی هەولێرەوە هەیە، سەرانسەری شیعری ئەدگاری

وێنەی ژیانی کوردەواری پێوەیە. بەلای ئەوەوە هەموو گیان لەبەرو بێ گیانی ئەو دەشتە لەناو بۆدقەی کوردەواری تواوەتەوە لەکورد زیاتر هیچی دیکە نییە. ڕاستییەکەش هەر ئەمەیە.

لەشیعری موخلیس لەڕووی ناوەڕۆکەوە ئەم هونەرو بابەتانە دەکەوێتە بەرچاو:

١- شیعری ئایینی: شیعری ئایینی لای شاعیر تێکەڵاوە، بەگشتی هەموو ڕەمزەکانی ئایینی ئیسلام لەخوداو پێغەمبەرو ئەولیاو شێخانی تەریقەتی سۆفیزم دەگرێتەوە. هەندێ جار مەبەستی کۆمەڵایەتیش دەئاخنێتە ئەم جۆرە شیعرانەیەوە.

٢- شیعری دڵداری: لەدڵداریدا شاعیر دلبەری تایبەتی نییە، ئەو جوانەی وا دەزانی خۆشی دەوێ لەناو جوانانی شیعری نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات تواوەتەوە.

٣- شیعری وەسف: شاعیر لە وەسفیدا سەرکەوتووە، شیعری لەم بابەتەی زۆرە، بەهەردوو بەشەوە، وەسفی کچی جوانی دەشتی هەولێرو وەسفی سروشتی ڕەنگینی ئەو دەشتە، بەتایبەتی کەژی بەهار.

٤- شیعری نیشتمانی و کۆمەڵایەتی: شاعیر بیری لەژیانی ئازادی کوردو گوزەرانی کورد کردۆتەوە. ئازادی و سەربەستی بۆ خواستووە و داوای لە ناوبردنی هەژاری و زوڵم و زۆری کردووە. هەندێ جار ئەم دوو مەبەستەی تێکەڵ بەیەکتری کردووە، لەجاری دیکەدا بەتەنیا باسی لێیانەوە کردووە.

٥- شیعری لاواندنەوە: شاعیر بایەخی بەشیوەن و ماتەمنامە داوە، لەشێوازی کلاسیکی ئەم جۆرە شیعرە نەچۆتە دەرەوە. لەم بابەتە شیعرەدا ستایش و پێداهەڵدان دەوری گرنگی دەبێ، چونکە شیعر، کە بۆ مردوو دەوترێ شاعیر تەنیا لایەنی چاکەی دەگرێ و سیفەتە باشەکانی ئادەمیزادی بۆ بەکار دەهێنێ.

٦-شیعری پێداهەڵدان و داشۆرین: شیعری پێداهەڵدان لەبەرهەمی شاعیردا دەبینرێ. وەکو مەرجێک هەندێ جار لەگەڵ وەسف تێکەڵ دەبێ. هەرچی شیعری داشۆرینیشە، ئەو سەرچاوانەی لەبەردەست دان ئەوە دەگەیەنن موخلیس لەم جۆرە شیعرەی هۆنیوەتەوە، لەبەر هەر هۆیێک بێ لەدواییدا لەناوی بردوون.

موخلیس یەکێکە لەشاعیرە دیارەکانی ناوەڕاست و نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم لەناوچەی سۆرانی کوردستانی باشوور.

**نموونەی شیعری دڵداری**

لەلیریکێکیدا بەناوی "سێوو خۆخ" موخلیس دەڵێ:

**گەر گوڵی من بولبولم وەر ئاتەشی پەروانەمە**
**خۆ ئەگەر لەیلای منیش مەجنوونی ئەو چاوانەمە**
**لێم گەرێ بابێم تەماشای باغەکەت کەم پڕ بەچاو**
**چەند دەمێکە ئارەزووی ئەو سێو وو ئەو خۆخانەمە**
**ڕۆژی ئیحسان و خەڵات بەخشینە ئەورۆ جەژنەیە**
**وەک هەتیو هاتوومە دەرگا چاوەڕێی جەژنانەمە**
**شار بەشارو دێ بەدێ و کووچە بەکووچە دەربەدەر**
**ڕۆژو شەو دێم و دەچم وەک تەیری بێ هێلانەمە**
**(موخلیس)ی بێکەس شەهیدی عیشقە دەستی لێ مەدەن**
**خوونی گەش بۆ ڕۆژی دەعوا شاهێدو نیشانەمە**

لەم وەسفە دڵدارییەدا موخلیس چەند وێنەیێکی ئامادەکراوی شیعری کلاسیکی کۆ دەکاتەوە، وەکو گوڵ و بلبل، ئاگرو پەپوولە، لەیلاو مەجنوون، خۆی و دلبەرەکەی لەگەڵ ئەواندا بەراورد دەکا. مەمکەکانی خۆشەویست بەسێوو خۆخ دەچوێنێ، تکا دەکا ڕێگای بدرێ تەماشایان بکا. لێی دەپاڕێتەوە وەک هەتیوێکی بێ باوکی دەرۆزەکەر مامەڵەی لەگەڵدا بکاو جەژنانەی بداتێ، دیارە جەژنانەکەش پووڵ و پارە نییەو ماچی دەمیەتی.

لەلیریکێکی دیکەیدا بە "کۆخە کۆخ"دوە موخلیس دەڵێ:

**کەی دەگا دەستم بەباڵای بەرزی یاری شەنگ و شۆخ**
**دەفعەیێ لەو باغە نەمدیوە هەنارو سێوو خۆخ**
**هەر کەسێکی بوو بەعاشق یاری دڵ نەرمی نەبێ**
**عومری گەنجی و عومری پیری هەر دەبێتە ئاخ و ئۆخ**

لەکۆتاییدا دەڵێ:

**(موخلیس) دانیشە تازە تۆ دزیت پێ ناکرێ**
**باغەوان دائیم بەهۆش و تۆش پیرو ساحیب کۆخە کۆخ**

وێنەیێکی ئاساییە لەوەسفی لاساییکردنەوەی شیعری کلاسیکی. ئەوەی لێرەدا سەرنج ڕادەکێشێ شاعیر سێوو خۆخ بۆ مەمکی دلبەر بەکار دێنێ، ئەگەر تا پلەیێک سێو بیسترا بێ بۆ ئەم مەبەستە خۆخ بەکار نەهاتووە، دەکرێ

بەداهێنان بۆ شاعیر حسێب بکرێ، بەتایبەتی سوورە لەسەر ئەم کارەی و لەلیریکەکەی پێشووشدا خۆخی لەگەڵ مەمکی دلبەر بەراورد کردووە. ئەمە و ئاوڕدانەوەیێکی دیکە لەم شیعرەدا هەیە، لەو کاتەی شاعیر دەیەوێ دەمی بۆ ببا و ماچی بکا پێی دەڵێ "یوّخ"، ئەم وشەیە تورکییە بەمانای (نا) هاتووە! ئیتر نازانرێ مەبەستی شاعیر لەمەدا چییە! دەیەوێ وا لەخەڵکی بگەیەنی خۆی زمانی تورکی دەزانێ، یا شانازی بەوەوە دەکا دلبەری کچە تورکێکی جوانە!؟ دیارە وشەی "تورک" جگە لەمانای فەرهەنگی خۆی بەمانای کچی جوانیش هاتووە.

**خدری زیندە**

بەم ناوەوە موخلیس لەلیریکێکیدا دەڵێ:

**مەی ئەگەر ئاوی حەیات و ساقی خدری زیندە بێ**
**چۆن ئەقڵ بڕوا دەکا دڵ ئارەزووی تەوبەی هەبێ**
**بەر لە خەڵوەت زاهیدا سەیرێکی مەیخانە بکە**
**گوڵ لەباغا ناڕوێ تا خاکەکەی تێر ئاو نەبێ**
**بۆ خەریک نابی بەڕاو ئەی تازە لاوی کەچ کولاە**
**تۆ کە بازێکی وەها سووک و لەڕاو خۆشت هەبێ**

بەم شێوەیە کۆتایی بەشیعرەکە دێنێ:

**(موخلیس) تۆ لەویساڵ و لەفیراق وەک دەدوێی**
**هەر بە ئاداب بدوێ سوودی نییە بێ ئەدەبی**

ئەم شیعرە بەرووکەش لەغەزەلێکی دڵداری دەکا، شاعیر هەوڵی داوە بە وتەی دانایی و تیۆریی لۆجیکی قانگی بدا. شیعرەکە بەم لێکدانەوەیە جوانی دەگەیەنێ، بەڵام جوانییەکەی زیاتر دەبێ ئەگەر بەلێکدانەوەیێکی سیمبۆلییانە تەماشا بکرێ، ئەوەی ڕاستی بێ شاعیریش مەبەستی ئەم لایەنەی شیعرەکەیە، لەبەر ئەوە بەکۆمەڵێک زاراوەی سۆفیزم ڕازاندوویەتییەوە، ئەو زاراوانە پێویستە لەفەرهەنگی سۆفیزم دەربهێنرێن، نەک لەفەرهەنگی گشتیی هەر زمانێک. هەندێ لەم زاراوانە لەم شیعرەدا بەم مانایانە هاتوون: خەڵوەت: گۆشەگیری، مەیخانە: پەرستگا، باز: شێخ و پیری تەریقەت: جەلال، سیفەتی خودایە، یار: خودایە، ئەم لیریکە بەگشتی لەو شیعرانەیە وەسفی دڵداری دەنوێنێ بەهەردوو مانایەوە حەقیقی و مەجازی، بەوێنەی هونەری وا ڕازاوەتەوە لەدانایی و لۆجیک وەرگیراوە.

**گەمەی ڕەوانبێژی**

لەشیعرێکیدا موخلیس دەڵێ:

**قوربان لەغەما فەوتام لەغەما قوربان**
**زیندان بووەتە قەسرم قەسرم بووەتە زیندان**
**تاکەی وەکو نەی ناڵێن ناڵێن وەکو نەی تاکەی**
**هیجران بەخودا بەسیە بەسیە بەخودا هیجران**
**بێ دەر لەدەرت کەوتووم کەوتووم لەدەرت بێ دەر**
**ئیحسان چییە سا بیکە بیکە سا چییە ئیحسان**
**چارم کە بکا وەسڵە وەسڵە کە بکا چارم**
**دەرمان بەچ کڵ نابێ نابێ بەچ کڵ دەرمان**
**گەورەی کە بڵێی هەر چەند هەر چەند کە بڵێی گەورەی**
**سوڵتان لەدەرت بەندە بەندە لەدەرت سوڵتان**
**موخلیس غەرەزی وەسڵە وەسڵە غەرەزی موخلیس**
**نیشان بدە پێی ڕووی خۆت ڕووی خۆت بدە پێی نیشان**

بەروخسار ئەم شیعرە گەمەیێکی ڕەوانبێژییە، موخلیس هەموو نیوە دێڕە شیعرەکانی بەپێی سیستمێک، کەرت کردووە وشەی دوایی کەرتی یەکەم، دەبێتە وشەی یەکەمی کەرتی دووەم، وشەی دوایی ئەم کەرتەش لەگەڵ وشەی کەرتی یەکەم یەک وشەیە. شیعرەکەش وەک دیارە لەسەر بەحری هەزەج ڕێک خراوە، کە نیوە دێڕەکانی کەرت کردووە، هەر کەرتێک لەم تازانە بەکێشی سیلابی خۆماڵی حەوت بڕگەییش دەکێشرێ. قافیەی شیعرەکەش بەگشتی یەکێتیی قافیەی ئاساییە لەسەر دەنگی "ان" دامەزراوە.

**کوردایەتی**

لەشیعرێکیدا بەناوی "کورد" موخلیس دەڵێ:

**قەومی کورد بۆچ ئێوە قەت نابنە برا**
**بەسیەتی پشتتان لەدونیادا برا**
**کوردی ئێران و عێراق و تورک و شام**
**بۆ لەوەختی خۆی وەها جێ جێ کرا**
**بۆچی یەک ناگرنەوە یەک پارچە بن**
**چەنگەباز بن بۆ هەموو لا ئاشکرا**

**بێ سیاسەت کەس نییە هەر ئێوەنە**
**وا لەتاریکی دەسوورێن بێ چرا**
**چاوەڕێم ئالایی کوردان هەلکرێ**
**هەرچی هات پێشکەوت و ئالای هەلکرا**
**نا تەبایی پشتی کوردانی شکاند**
**بۆ سەرۆکی کەس بەکەس نایێتە ڕا**
**هەر دەیانوێ باری خەلکی هەلگرن**
**تا وەها بن نابنە خاوەن سەرا**
**قەت مەلێ بێ دینە کوردی وا نەزان**
**کورد لەبێ دینیشەوە هەر پاش خرا**
**چۆن سەرۆکی کورد دەبێ بێگانە بێ**
**بۆ پشیلە قەت بەزی پێ نەسپێرا**
**با سەرۆک کورد بێت خوێنت هەلمژێ**
**نەک بەبێگانە بلێن کورد لێی درا**
**(موخلیس) نێزیک بووە گوێت لێ ببێ**
**سەربەخۆیی وا بەکوردستان درا**

لەم شیعرە ئاسان و ساکارو پڕ لەسۆزەدا شاعیر ئامۆژگاری کورد دەکا، قسەو گازاندەی ڕۆژانەیە، ئەگەر مانای ڕستەکانی نەخرابانایە ناو چوارچێوەی شیعرەوە قسەییەکی ڕووتیان لێ دەردەچوو، بەڵام هەمووی لەسۆزەوە هەڵقوڵاوە، چونکە شاعیر ئەو هۆیانە بەرەو رووی کورد دەکاتەوە، کە بوون بەلەت و پەتکردنی خاک، ئەمەش دیارە لەئەنجامی کردەوەی کاربەدەستانە، ئەوانەی لەبەرژەوەندی خۆیان بەولاوە هیچی دیکە لە گۆڕێ نەبووە. شاعیر ئەوەندە دڵسۆزە بەخەونیش بێ و هەڵسوکەوت هەر چۆنێک بووبێ کوردستانەو سەربەخۆ بووە.لەم شیعرەدا بۆچوونێک سەرنج ڕادەکێشێ، شاعیر دەڵێ سەرۆکی کورد نابێ بێگانە بێ، ئەگەر خوێنیشت هەڵمژێ کورد بێ باشترە. هەر چەندە بۆ کەس نییە تێبینی لەسەر کاری هونەری داهێنراو هەبێ لەجوانکاری بەولاوە، بەڵام بۆ ڕوونکردنەوە لەڕێ ڕاستی لۆجیکەوە سەرۆکی کورد نابێ خوێنمژ بێ، شاعیر ڕاستە کە دەڵێ سەرۆک نابێ بێگانە بێ، بەڵام ڕاست نییە کە دەڵێ، خوێنمژیش بێ لەبێگانە باشترە، بەپێچەوانەوە لەرووی سایکۆلۆجییەوە ئەگەر دوژمن خراپەت لەگەڵدا بکا ئێشی دەروونی کەمترە لەوەی هاوخوێنت دوژمنایەتیت لەگەڵدا بکا.

**شەنگەبێری**

پێنجینە جوانەکەی وەفایی "شیرین تەشی دەڕێسێ" ئیلهامی داوەتە هەندێ لەشاعیرانی کورد، یەکێک لەوان موخلیسە، لەسەر کێش و قافیەی شیعرەکەی وەفایی نۆ بەند پێنجینی هۆنیوەتەوە لەمەبەستی وەسف و دلداری. بەم جۆرە دەست بەشیعرەکەی دەکا:

**کە قارە قاڕی مەڕ هات وەکو هەوری بەهاری**
**هێنایە خوار لەسەر سەر ئەو شۆخە کۆفی لاری**
**بەهەوری سۆری پۆشی زولف و کەزی ڕەشماری**
**پشت بەستی بەستە پشتی لەژێر مەمکی هەناری**
**ناوی خوای خستە زاری دەچتە بێر شەنگەبێری**
**لەسەر قۆڵی کە لابرد کلەنگوچکی کەتانی**
**پارچە زیوێ وەدەرکەوت لەژێر بەفری بەیانی**
**لەدونیادا حەرامە لەپاش ئەو نەوجەوانی**
**خودا حیفزی بکاتن لەچاوی دوژمنانی** .
**دەڕوا بەخان و مانی دەچتە بێر شەنگەبێری**

وەفایی شیرینی هەڵبژاردووە بۆ وەسفی لەنجەو لاری لەکاتی تەشی ڕستندا، وەسفی بزووتنەوەی ئەندامە جوانەکانی لەدەست و پەنجەو مەمک و زگ و ناو ڕانی دەکا. بەڵام موخلیس کچێکی شۆخ و شەنگی دەشتی هەولێری هەڵبژاردووە لەبەهارو سەرەتای هاویندا خۆی ئامادە دەکا بۆ مەڕ دۆشین. ڕستەی "دەچتە بێر شەنگەبێری" لەدوایی نیوە دێڕی پێنجەمی هەموو بەندێک دووبارە دەکاتەوە.

لەو دێڕانەدا شاعیر وەسفی بەهارو هەندێ لەئەندامە جوانەکانی ئەو کچە مەڕدۆشەی دەکا لەو کاتەی بەرەو جێگەی مەڕدۆشین دەچێ، واتە بێرێ. باس لەشەدەو پشتێندی جوان و فەقێیانەی کەتان و خەزیمەو گوارەی زێڕین دەکا، کە کولمی سووری لەنێوانیاندا دەدرەوشێتەوە.

شاعیر لەسەر شیعرەکەی دەڕواو دەڵێ:

**بەقەددی شەنگ و شۆخی سولتانی نەونەمامان**
**وا کەوتە ڕێ بەلەنجە وەک کەبکی پڕ خەرامان**
**لەتافەتی لێ دەچکا لەسەر هەتاکو دامان**
**کەس نەبوو کاس نەبێتن لەبەر بۆنی شەمامان**
**کەی خوایە دێتە لامان دەچتە بێر شەنگەبێری**

لەگەڵ وەسفی بزووتنەوەو لەنجەو لاری کچە جوانی مەرِدۆش، شاعیر خەریکی سروشتی بەهاری دەشتی هەولێرە، ناوی ئەو گوڵ و گوڵاڵانە دەبا، کە لەو دەشتەدا شین دەبن، هەموویان سەر دادەنوێنن لەژێر پێی ئەو جوانەی دەچێتە بێرێ. شاعیر ئاماژەی بۆ ئەو دەوەنە باڵا بەرزانە هەیەو لەگەڵ باڵای لەیلای مەجنوون بەراوردیان دەکا. ئەو کچە جوانەی دەچێتە بێرێ دیارە لەو بەهارەدا لەهەواری رەشماڵان لەگەڵ کەسوکاری دەژی. شاعیر، کە دەڵێ ئەو کاتەی لەرەشماڵ هاتە دەرێ بەرەو بێر بچێ، وەکو رۆژ وا بوو لەهەور بێتە دەرێ، ئەم وێنە هونەرییەی لەئەدەبی میللی نەتەوە کۆچەرەکان وەرگرتووە.

موخلیس قەسیدە پێنجینەکەی بەم بەندانە کۆتایی پێ دێنێ:

**(موخلیس) ئەگەرچی پیرە قامەتی وا چەماوە**
**ئەممان لەدڵ جەوان و لاوچاک و تازە لاوە**
**بۆ گرتنی غەزالان کەیفی لەسەیرو راوە**
**بەتیری کچە کوردێک جەرگ و دڵی پساوە**
**یەقین کاری کراوە دەچێتە بێر شەنگەبێری**

لەم دێرانەدا موخلیس وێنەی جوانی رۆمانتیکیانە دروست دەکا بۆ رێزگرتن لەو کچە جوانە مەرِدۆشە. دەیکا بەحۆری، کە ئەو حۆری بێ دەشتی قەراج لەخوارووی رۆژئاوای هەولێر دەبێتە بەهەشت. لەچاوو برۆو برژانگی کچە جوانی شەنگەبێری لەشکرێک دروست دەکا بۆ پاراستنی جوانی ئەو بەهەشتە. باڵندەو فرِندەو قازو قولینگ و مامزە چاو رەشەکانی دەشتی قەراج هەموویان لەخزمەت شەنگەبێری حۆرین. دیارە شاعیریش هەر چەندە پیر بێ، هەر دڵدارەو لەدڵداری ناکەوێ، دلبەری یا شەنگەبێرییە، یا هەر کچێکی دیکەی کورد، چونکە لەناو کورداندا کچی جوان زۆرە.

## عەونی
## ١٩٩٢-١٩١٤

### ژیانی

عوسمان کوڕی حەبیب کوڕی عەبدوڵڵا لەساڵی ١٩١٤ لەشاری کۆیە لەدایک بووە. لەتەمەنی مێردمنداڵی بووە لەساڵی ١٩٢٧ لەقوتابخانەی سەرەتایی تا پۆلی پێنجەمی خوێندووە. لەو کاتەدا باوکی کۆچی دوایی کردووە ناچار



بووە قوتابخانە بەجێ بێڵێ و خەریکی بەرێوەبردنی دوکانی باوکی و خێزانەکەی بێ. ئەمە بەهیچ جۆرێ رێگای لێ نەگرتووە هاتووچۆی حوجرەی خوێندنی فەقێیان لەمزگەوت بکا. لەمزگەوتی حەتک لەکۆیە لای مەلا محەمەدی مەلا برایمی عەودالانی هەندێ وانەی ئایینی ئیسلامی وەرگرتووە. عەودالانی شاعیر بووە، بەنازناوی شیعری "دلاوەر" ناسراوە. جگە لەمە لەدەرەوەی قوتابخانەی کتێبەکانی پرۆگرامی پۆلی شەشەمی سەرەتایی خوێندووە. لەسەردەمی لاوەتیدا ناوی "عەونی" وەک نازناو هەڵبژاردووەو لەشیعریدا بەکاری هێناوە. هەر لەو رۆژگارەدا گیانی نیشتمانپەروەری و کوردایەتی لەدڵ و مێشکیدا رسکاوە، وەک هەندێ لەلاوانی ئەو دەمە لەپارتی هیوا نزیک بووە. بەم رەنگە کەوتۆتە ناو بزووتنەوەی نەتەوەیی لەکوردستانی عێراقدا. بەم هۆیەوە چەند جارێک زیندانی کراوەو خۆی لەگرتووخانەو بەندیخانەکانی کۆیەو هەولێرو کەرکووک و بەغدا و کووت و نوگرەت سەلمانی باشووری عێراق دیوە. لەشوباتی ١٩٦٣ عەونی وەکو زۆربەی خوێندەوارو رۆشنبیری کورد تووشی بەندیخانە بوو، هەروەها لەساڵی ١٩٦٥ ماوەی حەوت مانگ لەگرتووخانەی هەولێر دەستبەسەر بوو.

عەونی بەدرێژایی ژیانی مووچەخۆری میری نەکردووە، لەسەر رەنج و کۆششی خۆی ژیاوە، دوکانی هەبووەو ئالوێری کردووە. دوا ساڵانی ژیانی بەنەخۆشی بردۆتە

سەرو تا لەڕۆژی ٢٠ی تەمووزی ١٩٩٢ لەکۆیە کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی باسکی عارەبیان بەخاک سپێرراوە.

## شیعری

عەونی لەناوەڕاستی سییەکانی سەدەی بیستەم دەستی کردووە بەشیعر وتن، لەژیانیدا پێوەندی بەشاعیرانی کوردەوە بووە، بەتایبەتی ئەوانەی لەکۆیە زیندەگانیان کردووە، هەروەها لەڕۆژنامەگەری کوردییەوە نزیک بووە،وەک ڕۆژنامەو کۆوارەکانی گەلاوێژو بەیان و هەولێرو کاروان و هاوکاری و برایەتی.

شاعیرییەتی عەونی خۆڕسک بووە، بەگشتی مەسەلە لای ئەو بیر نەبووە، بەڵکو جوانکاری بووە، خەیاڵی ئامادە بووە ئیلهام لەهەموو جۆرە بزووتنەوەیێک وەربگرێ و بەرهەمێکی داهێنراوی ئیستێتیکی دروست بکا.

## شیعری لەڕووی ڕوخسارەوە

عەونی بەسەلیقە لەهەردوو جۆرە شیعری کوردی عەرووزی و سیلابی میللی خۆماڵی وتووە.

١- لەشیعری عەرووزیدا بەزۆری بەحرەکانی هەزەج و ڕەمەلی بەکارهێناوە، کەچی لەموزاریعدا سێ چوار شیعرو لەبەسیتدا تاقە شیعرێکی هەیە. لەیەکێتی قافیە ئەم دەنگانەی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی بەکارهێناوە: ا ت ج د ر ش غ ق ک م ن (ە-ـە) و وو ی ێ. لەپاش قافیە ئەم وشانەی بەکارهێناوە: (چبکا، دەکا، گرت، نەگرت، کرد، تر (دیکە)، عەشق، بم (ببم)، دەیزانم، چین، من، بوو (هەموو)، گەرەکە، لەکێیە، چی، دەوێ، دەکەم، کەم (بکەم)، ناکەم، کردم، بوو، نییە، بێ (ببێ)، دەوێ، نەبێ، نەدا، تۆ، ئیمڕۆ.

٢- لەشیعری کێشی خۆماڵی بەرهەمی زۆرە، هەموو کێشەکانی بەکارهێناوە. لەدە برگەیی و حەوت برگەیی شیعری فرە زۆرە. قافیەی مەسنەوی لەم جۆرە شیعرەدا بەکارهێناوە، لەگەڵ ئەوەشدا قافیەی ڕەنگاو ڕەنگیش لەشیعریدا بەرچاو دەکەوێ، لەپارچە شیعرێکدا قافیەی وەکو (ا ب ا ب ج د ج د) و هی دیکە دەبینرێ.

لەبنجدا شیعرە عەرووزییەکانی لەبابەتی لیریکن، ژمارەی دێڕیان کەمە، لەسەر بنچینەی یەکێتی قافیە دامەزراون، کەچی چیرۆکە شیعرییەکانی بەزۆری درێژن، ئەمانە دەکرێ قەسیدە یا پۆێمیان پێ بووترێ. کۆمەڵێک بەرهەمی لەم بابەتەی هەیە، ناوەڕۆکیان لەئەدەبی میللی سەرزار (فۆلکلۆر) و حیکایەتی بەرگوێی ئاگردان وەرگیراون. لەم لایەنەوە جێی خۆیەتی هەندێکیان دەستنیشان بکرێن: سەر گوزەشتەی مام ڕێوی و ورچ، ڕێوی و دەهۆڵ، سەرگوزەشتەی ورچ و مەیموون، پیرێک، مامەی لادێ، مارو باغەوان، گوڵ و بلبل، بازرگان و تووتی.

لەپێنجیندا عەونی چەند پارچە شیعرێکی بەندی پێنجینی هەیە (ا ا ا ا ب) هەریەکەی لەحەوت بەند پێک هاتووە. جگە لەمانە کۆمەڵێک تاک و چوارین و هەڵهێن (مەتەڵ)ی هەیە. هەروەها بەشێک لەچوارینی خەیامی کردووە بەکوردی.

عەونی شیعری چەند شاعیرێکی کردووە بەپێنج خشتەکی، وەکو نالی، وەفایی، مەیلی (نازناوی شیعری مەلا سابیری مەلا حەبیبە لەساڵی ١٩١٤ لەشاری کۆیە لەدایک بووە)، لەشیعری هێمن حەوت غەزەلی کردووە بەپێنج خشتەکی.

## شیعری لەڕووی ناوەڕۆکەوە

عەونی لەنێوەندێکی ئەدەبیدا ژیاوە، لەشاعیرو نووسەرانەوە نزیک بووە. کەسێکی خودا پێداو بووە، کە زوو ئاشنایەتی لەگەڵ دیوانی نالیدا پەیدا کردووە. نالی خۆش ویستووە ئەوەندە شیعری ئەوی خوێندۆتەوە بووە بەیەکێ لەقوتابییە زیرەکەکانی قوتابخانەی شیعری کوردستانی باشوور. جگە لەنالی لەکۆنەکان کاریگەری مەحوی و وەفایی بەسەریەوە هەیە. لەتازەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم شیعری ئەحمەد موختارو هێمن ئاسۆی خەیاڵیان فراوان کردووە. ئەمانە هەموویان بوون بەسەرچاوە بۆ شیعری عەونی. هەندێ جار بەدەسکارییەوە لێیان وەردەگرێ، هەندێ جاری دیکە ئیلهامی دەدەنێ بۆ وتنی شیعرێک دەبێتە زادەی خەیاڵی شیعری هەردوو لایان.

لەڕووی ناوەڕۆکەوە عەونی وەستای غەزەلی کلاسیکیی ئاساییە لەوەسف و دڵداریدا، لەکوردایەتی دەستێکی درێژی هەیە. ناوەڕۆکی نیشتمانپەروەری تێکەڵ بەدانایی و دڵداری کردووە، دەکرێ "غەزەلی نیشتمانی"

پێ بوترێ. لەناوەڕۆکی شیعرە نیشتمانییەکانیدا بەئاشکرا دیارە بیـــر بەســـەر خـــەیاڵدا زاڵە، لەبەر ئەوە لەڕووی جـوانکارییـەوە ئەم شـیـعـرانە ناگـەنە پلەی شـیـعـرە دڵدارییـەکـانی، بەڵام ئەگـەر لەژێر ڕۆشنایی شـیـعـری پەروەردە (دیداکـتـیکی)یەوە تەماشـا بکرێ ئەم شـیـعـرە نیشتمانییانەش وەک بەرهەمێکی هونەری داهێنراو خۆیان دەنوێنن.

عەونی لەناسیۆنالیزمی کوردی (کوردایەتییەوە) دەرباز بووە بۆ ئەنتەرناسیۆنالیزم. پشتی ڤێتنامی باکووری گرتووەو دژی دەستدرێژی ئەمەریکا وەستاوە، هەروەها لەسەر مافی فەلەستینییانی کردۆتەوە.

**نموونەی شیعری**

**دڵداری و وەسف**

لەشیعرێکیدا عەونی دەڵێ:

**گـەلاوێژ کـاتێ هەڵهـات نیـوەشـەو بوو**
**کە چاوی مەستی ئەو شۆخە لەخەو بوو**
**بەیان بوو غـونچـە پشکووت و هەزاریش**
**خـەوالوو کـفت و کـۆی بێـداری شـەو بوو**

لەکۆتاییدا دەڵێ:

**لەڕێی هاتا نەهات ئەمـجـارە (عـەونی)**
**لە مـەیدانی گـرەو ئەسـپی جـەدەو بوو**

لەم شیعرەدا عەونی ئیلهامی لەنالی وەرگرتووە، هەندێ وێنەی داهێنراوی وێنەکـانی نالی دێنەوە یادی خـوێنەر، بەڵام وەستایی تێدا نواندووە، بەڵگەکانی بریتییە لەچەند ئەندامێکی وردی دلبـەر لەگـەڵ هەندێ لەدیاردەکـانی سروشت بەراوردیانی کردووە. شاعیر هێلانە لەسەر کوڵمی دلبەر دروست دەکا:

**دڵ لەمن تۆراوە دیســان هەمـدەمی یاری دەوێ**
**ئارەزووی گـەشت و گـوزارە باغ و گـوڵزاری دەوێ**
**بولبـول ئاسـا وا خـەریکی ئاشیـان هەڵبـەستنە**
**غـونچـەیێکی ناسکی وێنەی دەمی یاری دەوێ**
**پەرچەمی چین چین بەڕێز هێنایە دەوری ڕوومـەتی**
**گەنجی ڕوخساری هەمیشە جووتێ پاسداری دەوێ**

شاعیر ئارەزووی ئەوە دەکا لەسەر کوڵمی دلبەر وەکو بلبل هێلانەیێک دروست بکا. کەرەستەی ئەو هێلانەیە پەرچەمی دلبـەرە لەدەوری ڕوومـەتی ئالاوە. دەمی دلبـەر غـونچـەییێکە لەوانەی بلبل گـرفـتـاری بووە، دوو کەزییەکانیشی پاسەوانی هێلانەکەن. ئەمە وێنەیێکی هونەری داهێنراوی شاعیرانەیە.

لەشیعرێکیدا عەونی ملوانکە لەشیعر دروست دەکا:

**ملوانکەییێکی لە هەڵبـەستی جـوان**
**بۆی دەهـۆنمەوە وێنـەی مـــرواری**
**بەکـێـشـان سـووک بێ بەنرخ گـران**
**پێـشکێـشی دەکـەم بەناوی دیاری**
**کـە کـوردیە ملی گـەردانەی هونەر**
**وەک لەعلی سـوورە شین وەک پیـرۆزە**
**زۆر بەنرخـتـر لەدانەی گـەوهەر**
**ئەوە جـەژنانەی جـەژنی نەورۆزە**

نەورۆز لەلای شاعیر ئەوەندە پیرۆزە، دلبەر ئەوەندە خـۆشـەویـسـتـە، دەبێ چی شـایانی دیاری بێ بۆ ئەو خۆشەویستە بەهۆی ئەو جەژنە پیرۆزەوە! هەموو گەنجینەی سەر ڕووی زەوی کەمە، ئەو کیژە شایانی دیارییێکە وێنەی نەبێ، ئەو دیارییە ئەم شیـعـرە جـوانەیە کـە شـاعـیـر دایهێناوە.

**نیشتمانپەروەری و کوردایەتی**

لەلیـریکێکیـدا عـەونی بەناوی "بەرەو هەواری سەرکەوتن" دەڵێ:

**کـۆچبـار کـۆچی کـورد بەرەو کـۆسـاران**
**بنەوبارگـەیان خـست لەنزاران**
**بەرەو هەورازی سـەرکـەوتن دەڕۆن**
**مـژدەی سـەربەسـتی دەدەن بەیاران**
**دوا حـەشـارگـەم بێ لانەی خـوێناویم**
**دەگـەڕێمـەوە لای گـیـان سـپـاران**
**بەخـوێنی سـووری زامی ناسـۆرم**
**دەبێ ڕەنگین بێ مـەکـۆگـای جـاران**

کـاروانی خـەباتی میللەتی کـورد کـەوتۆتە ڕێ بەرەو ژوور، بەرەو لووتکە. لەوێ کـاروان دەگـاتە ئەنجـام. ئەم

کۆششە بۆ گەیشتن بەهیوا بەبێ خوێن ڕشتن و شۆڕش سەرناگرێ. ئەمە تیۆریی ڕۆشنبیری کورد بوو لەو سەردەمەدا. ئەو کاتە ڕاست بوو لەبەرئەوە ئەو شیعرە بەهۆی هەوێنی جوانکارییەوە بۆ هەموو کاتێک دەست دەداو کۆن نابێ. کاروانی خەباتی کورد ئەگەرچی تائێستاش نەگەیشتۆتە ئەنجام، بەڵام خوێن ڕشتن باوی نەماوە. ئەگەر شاعیرێک یا ڕۆشنبیرێک هەر چەندە ڕۆمانتیکیش بێ لەسەدەی بیست و یەکەمدا خوێن ڕشتن ناکاتە مەرج بۆ گەیشتن بەئامانج.

عەونی گفتوگۆی لەگەڵ کچێکی کوردا هەیە، ئەو کچە ڕەمزی کچی دایکی نیشتمانە، بەم دێڕانە پرسیاری لێ دەکا:

**گوتم ئەی کچ لە گەشتی**
**شارستانی یا دەشتی**
**وا جوان و پاک ڕەوشتی**
**مەسیحی یا زەردەشتی!**

***

**ئەو کچە کوردە نازدارە**
**ڕەنگ زەردو لێو بەبارە**
**بەرگی ڕەشی پۆشیوە**
**وا مەلوول و غەمبارە**

عەونی کچێکی جوان و نازداری کردووە بەڕەمزی کچی دایکی نیشتمان، جلی ڕەشی پۆشیوەو لێو بەبارە، لێی دەپرسێ بۆ وا پەشۆکاوە! فرمێسکی کچ دێتە خوارێ، هەنسکە هەنسکییەتی، شاعیر لێی دەپاڕێتەوە، سوێندی دەدا باس لەکارەساتی خۆی بکا، کچی دایکی نیشتمان دەبێتە وەدرام و دەڵێ:

**گوتی ئەی برای کوردی من**
**گەر بزانی دەردی من**
**هیچ جاری تر ناپرسی**
**مەلوولی و ڕەنگ زەردی من**

***

لەکۆتاییدا دەڵێ:

**حەیفم لە کوردەواری**
**بۆ لاوانی هوشیاری**
**خۆزایی ڕەنجەڕۆ بن**
**زۆرن تێکدەری کاری**

شاعیر دواکەوتن و بەجێمانی خەڵکی کورد لەکاروانی میللەتان و ئەو کارەساتانەی بەسەریان هاتووە دەگەڕێنێتەوە بۆ کردەوەی خۆپەرستی و چاوچنۆکی ناو میللەتی خۆی. خیانەتی میللەت فرۆشان و زەبرو زەنگی سەرداران هێندەی سیاسەتی ناهەمواری هاوسێیانی کوردو بەرژەوەندی ئەمپریالیستەکانی ئەورووپاو ئەمەریکا، بەڵکو زیاتریش بۆتە هۆی هەموو ئەو گیروگرفتانەی کورد تیایاندا دەژی. شاعیر ناهەقی نییە بەزمانی ئەو کچەوە جنێو بەو سەرۆکانە دەدا.

عەونی لەشیعرێکیدا باس لەکاوەی ئاسنگەری مێژووی دێرینی ڕۆژگارانی ئەرکیۆلۆجی ئەفسانەیی دەکا. ئەوجا کاوەیێکی دیکە دەدۆزێتەوە لەسەدەی بیستەمدا لەمستەفا بارزانی بەرجەستەی دەکا:

**دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر**
**هەستا کاوەی ئاسنگەر**
**بوو بەپێشڕەوو ڕابەر**
**دەستی کرد بەشۆڕو شەڕ**
**بەهێزی بازوو و مەچەک**
**نایە سەر شانی کوتەک**
**دژی زۆردار ڕاوەستا**
**سوێندی خوارد بەئاڤێستا**

شاعیر دەڵێ لەمێژووی دێرینی کورد لەناو هۆزەکانی باپیرانی کوردی ئێستاکە، یەکێکیان مادەکان بوون قارەمانێکیان لێ هەڵکەوت، ناوی کاوەی ئاسنگەر بوو، شۆڕشی هەڵگیرساندو میللەتی خۆی لەزۆرداری ئەژدەهاک (زەحاک) ڕزگار کرد. لەنەوەی کاوە و میدیاییەکانی کۆن لەسەدەی بیستەمدا مستەفا بارزانی پەیدا بوو:

**لەوسا ئاگر یەکجاری**
**دروشمە بۆ ڕزگاری**
**پشت بەپشت هەر مایەوە**
**بەهیچ هێز نەکوژایەوە**
**تاکو سەدەی بیستەم هات**
**پاش هەزاران کارەسات**
**لەکوردستانی بەرین**
**کاوەی سەدەی بیستەمین**
**ئاڵای خستە سەرشانی**

**شـــۆڕشـــێکی بەرپاکـــرد**
**مـــافی کـــوردی داواکـــرد**

لەرۆژگارانی مێژووی ئەفسانەیی کۆنەوە ئەو ئالآیەی کاوە هەڵی کردبوو هەر دەشەکێتەوەو پشتاوپشت قارەمانانی مێژوو لەیەکتریان وەرگرتووە، تا گەیشتە سەدەی بیستەم و کەوتە دەست مستەفا بارزانی. مەبەسی شاعیر هەڵگیرسانی ڕاپەڕینی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦١ە لەکوردستانی عێراقدا.

### دانایی و مێژوو

عەونی لەڕاستی دوور نەکەوتۆتەوە، کە دەڵێ مێژوو درۆیە:

**ئەگەر ڕاستت دەوێ مێژوو درۆیە**
**هەمــــوو ڕووداو و ڕابردوو درۆیە**
**بەچاوی خۆت دەبینی کارەساتێک**
**دەگۆڕێ پێچەوانەی هەر لە کاتێک**
**ئەوەی مێژوو دەنووسێ وەک بەڕۆژە**
**گوڵێکە تابیعی سووڕانی ڕۆژە**

لەم دێڕانەدا شاعیر کە هێرش دەباتە سەر زانستی مێژوو ناهەقی نییە، چونکە بەسەرهاتی ڕووداوێک وەکو بووە نانووسرێتەوە، بەڵکو وەکو ئەوەی مێژوونووس یا دەسەڵات بەدەست دەیەوێ دەنووسرێتەوە. لەبەر ئەوە بۆ دوارۆژ وەکو سامانێکی ڕۆشنبیری و بەرهەمی ئەدەبی و هونەری داهێنراو (شیعرو پەخشان) سوودی بۆ کۆمەڵی مرۆڤایەتی هەمیشەییە، بەڵام زۆربەی مێژووەکە لەکەڵک دەکەوێ و کەمی دەبێتە سەرچاوەی ڕاستەقینە. بەتایبەتی مێژووی سیاسی کوردی سەردەم.

## جاهید
## ١٩٩١-١٩١٨

### ژیانی

بورهان کوڕی محەمەد کوڕی عەبدولڕەحمان دۆغرەمەچییە. لەساڵی ١٩١٨ لەهەولێر لەدایک بووە. وشەی "جاهید"ی هەڵبژاردووە وەک نازناوی شیعر. قۆناغی خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی ئوولای



(یەکەمی) هەولێر تەواو کردووە. لەتەمەنی منداڵیدا باوکی کۆچی دوایی کردووە. دایکی شووی بەشوبرای خۆی کردۆتەوە، کە جەبار ئاغای کانی شاعیرە، واتە مامی جاهید، لەبەر ئەوە لەماڵی مامی گەورە بووە. لەدوای خوێندنی سەرەتایی لەقوتابخانەی ناوەندی هەولێر خوێندوویەتی. لەپۆلی دووەم لەساڵی ١٩٣٤ لەقوتابخانە دوورکەوتۆتەوە، لەو سەردەمەدا دایکی کۆچی دوایی کردووە بێ دالدە ماوەتەوە، تووشی دەست کورتی و ئاوارەیی بووە. کە ناوی بۆ خزمەتی سوپا هاتووە خۆی نەدزیوەتەوە، لەساڵی ١٩٣٧ تا ١٩٤٠ سەرباز بووە لەئۆردووگاکانی کەرکووک و سلێمانی و کۆیەو ڕواندز. هەر لەو کاتەی لەعەسکەری ڕزگاری بووە خووی داوەتە سەرخۆشی و ژیانێکی بێ سەروبەری بردۆتە سەر. وەکو خۆی دەیگێڕێتەوە بێ جێگاو ڕێگا بووە. بەئاوارەیی هەر شەوێ لەجێیێک نوستووەو شەوانی بێگاری لەخان و مزگەوت و ماڵی برادەران بردۆتە سەر. زۆربەی ژیانی ڕۆژانەی بەسەرخۆشی بەئەنجام گەیاندووە، بەڵام مەستێکی بێ وەی بووەو زیانی بۆ خۆی نەبێ بۆ کەسی دیکەی نەبووە.

لەساڵی ١٩٤٥ جاهید یەکێک بوو لەوانەی بەر لێشاوی هێرشی حکومەتی کۆنەپەرستی عێراق کەوتن بەهۆی بزووتنەوەی ئەو سەردەمەی بارزانییان و ماوەیێک لەگرتووخانە مایەوە. لەپەنجاکانی سەدەی بیستەم ژنی هێنا، ماوەی سەرخۆشی و ئاوارەیی لەژیانیدا تا پلەیێک

بەسەرچوو و هەندێ ئۆقرەی گرت. لەو کاتەدا بوو بەمووچەخۆر لەبەڕێوەبەرایەتی کاروباری ڕێگاوبان و هاتووچۆ لەهەولێر. لەپاشان کارگێڕی نامەخانەی ناوچەی عەنکاوەی پێ سپێررا لەهەولێر. لەدوای ماوەیێک خانەنشین کرا. ئەم مرۆڤە بەدبەختە خێر نەدیوە لەڕۆژی ٢١ی کانوونی دووەمی ١٩٩١ لەهەولێر کۆچی دوایی کردو هەندێ شیعری جوان و بەپێزی لەدوای خۆی بۆ نەتەوەی بەجێ هێشت.

**شیعری جاهید**

ژیانی جاهید لەماڵی جەبار ئاغای کانی مامی بەمنداڵی چێژی شیعری لەلای دروست کردووە، لەتەمەنی پازدە ساڵیدا هەوڵی داوە شیعر دابنێ. کە مامی مووچەخۆر بووە لەڕواندزو بێخود گەشتی ئەو ناوەی بووە لەماڵی مامی ئەو شاعیرەی ناسیوەو شیعری بۆ خوێندۆتەوە. سافی هیرانی دیوە، لەڕانیە دڵداری ناسیوەو بووە بەهاوڕێ لەگەڵی. لەو سەردەمەدا سەعدی مەلا رەئووفی برا گەورەی دڵدار مووچەخۆر بووە لەڕانیە. لەپاشان لەساڵی ١٩٤٠ شیعرێکی داشۆرین ئامێزی سووکی داناوە لەگەڵ دڵدار شەڕ بە کانی شاعیر دەفرۆشن. لەشاعیرە لاوەکانی سەردەمی ژیانی خۆی ناسیاوی لەگەڵ ئەحمەد دڵزارو مەسعوود بێبەش و مەدحەت بێخەو و جەلال مەدحەت و پیربال مەحموود هەبووە.

ئەم نێوەندە شیعرییە دەورێکی گرنگی بووە لەمشتوماڵ کردنی هەستی شیعری لای جاهید، شیعرێکی زۆری کلاسیکی و نوێی لەبەر بووە، کۆمەڵێک وێنەی داهێنانی شیعری لەخەیاڵیدا دروست بووە. گوێی مۆسیقی دووبارە وێنەکانی دارشتۆتەوە بەزمانێک هەندێ جیا لەو شیعرانەی لەبەری بووە. مەبەس لەو زمانە شێوە زارەکەی هەولێر یا سۆرانییە لەدیالێکتی کرمانجیی باشوور، لەهەندێ لەتەعبیرەکانیدا ئەدگاری ئەم شێوازە بەرچاو دەکەون.

شیعری جاهید لەڕووی ڕوخساردوە، بەتایبەتی لەکێش و قافیەدا، هەردوو کێشی بەحری عەرووزی و خۆماڵی بەکارهێناوە. هەروەها لەقافیەدا یەکێتیی قافیەی عەرووزی و جووت قافیەی خۆماڵی (مەسنەوی) بەکارهێناوە. زمانی شیعری ئاسانە، مانا لەڕووە، لەشیعری میللیی سەرزارەوە (فۆلکلۆرەوە) نزیکە.

بەگشتی هەموو شیعری جاهید دەچێتە ناو بابەتی لیکریکەوە. شیعری بەقەوارە کورتە، چەند پارچەیێکی درێژی هەیە دەتوانرێ بەقەسیدە بژمێررێن. جگە لەوە شاعیر بایەخێکی زۆری بەچوارین داوە. زیاتر لە ١٦٠ چوارین لەدیوانیدا بەرچاو دەکەون. زۆربەیان لەزادەی بیرو خەیاڵی خۆی دەژمێررێن. لەهەندێکیاندا هەست بەتارمایی شێوازی عومەر خەیام دەکرێ.

شیعری جاهید لەڕووی ناوەڕۆکەوە بەشێک لەمەبەستەکانی شیعری کوردی گرتۆتە خۆی، لەوانە وەسف و دڵداری و ستایش و کوردایەتی و نیشتمانپەروەری و داشۆرین و کۆمەڵایەتی و هی دیکە بەشی زۆری شیعری دەچێتە خانەی ئامۆژگاری سەرو سەربردە کۆنینەو پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و بیری فەلسەفی، بەتایبەتی لەچوارینەکانیدا.

**نموونەی شیعری جاهید**

**یەکەم شیعری جاهید**

لەو شیعرەدا دەڵێ:

**لەبۆ دەفعی غەمی دنیا**
**لە دەستم بادە بوو پەیدا**
**عەقڵ فەوتا جیگەر سووتا**
**بەجارێ کەوتمە سەحرا**
**غەمم یەک بوو هەزاری کرد**
**دەخیلی گوڵعوزاری کرد**
**خەریکی ئاه و زاری کرد**
**بەشەو تا ڕۆژ نەبێ بیللا**

لەکۆتاییدا دەنووسێ:

**بەحاڵی (جاهید)ی مەعسووم**
**ئەگەر ڕەحمێ نەکەن مەعلووم**
**حیسابی من چ بێ مەفهووم**
**نەپرسن لێم لە مەحشەردا**

ئەم لیریکە جوانەی جاهید تیۆریی هەندێ لەڕەخنەگرانی ئەدەبی گێتی ڕەت دەکاتەوە، ئەوانەی لەسەر ئەو باوەڕەن بەرهەمی شاعیر لەڕووی جوانکارییەوە لەگۆڕان و پەرەسەندندا دەبێ بەپێی گۆڕانی فیکری و وەرگرتنی زانیاریی تازە بەدرێژایی ژیانی. ئەم بەرهەمە یەکەمین شیعری جاهیدە، کەچی بەکاملی لەدایک بووە، ئەمە سیفەتی هەمیشەیی داهێنانی ئەدەبی و هونەرییە.

**پیری نەكردووە دەردی سەر**
**هەموو رۆژێكی بەهاران**
**كە تاو تاو دەباریّ باران**
**دەیەویّ وەک جاری جاران**
**راكات و تەری كا باران**

خوو و رەوشتی مرۆڤ بەسەر ناچیّ، چێژو خەیاڵ پیر نابیّ، یادگارو بیر كۆن نابیّ و لەبیر ناچێتەوە، لەسەرووی هەموویانەوە دڵداری بەروخسار دەگۆریّ و بەناوەرۆک نەمرو هەمیشەییە. هەندیّ وێنەی جوانی عەلی لەم شیعردا لەپەراوێزی ئەم بیروباوەرەدا خۆیان دەنوێنن.

لەشیعرێكیدا بەناوی "خەونێكی خۆش"ەوە لەساڵی ١٩٥٧ لەدیمەشق هۆنیویەتییەوە دەڵیّ:

**ماچێک لەم دوو لێوەی پرت**
**بۆنێک لەم بن مەمكەی خرت**
**بە ناز برۆ**
**وەک ئاوازەی فۆكسترۆ**
**وەک شنەی با**
**پیّ دانیّ سەر باری رۆمبا**
**خێرا وەرە نێو باوەشم**
**ئەی ئاواتم بەختم بەشم**
**دەستەكانت بكە ملم**
**مەمكۆڵەت دانیّ سەر دڵم**
**سا دەی ئۆخەی ئۆخەی**
**ئوخەخەخەخەی**

***

**نە بێهۆشی**
**نە سەرخۆشی**
**خەونێكی خۆش و شیرین بوو**
**بووكی خەونەكەش هێلین بوو**

رەشبینی شاعیر لەشیعری پێشوو، لەهەڵوێستێكدا دروست بوو، ئەم شیعرە لە هەڵوێستێكی دیكەی پڕ لەگەشبینی دروست بووە. جێگە هۆڵی سەماو مۆسیقاو گۆرانییە، بەتایبەتی ئەو سەمایانەی ژن و پیاوێک پێكەوە دەیكەن. عەلی كچێكی جوانی دیوە ناوی هێلین بووە، خۆی دەیزانیّ خەڵكی سووریاو لبنان یا ئەوروپایی بووە، دوور نییە عەلی سەمای لەگەڵ هێلیندا كردبیّ، چونكە كچی ئەم جۆرە شوێنانە ئارەزووی پیاو رەت ناكەنەوە. هەر چۆنیّ بیّ ئەم هەڵوێستە بۆتە مایەی داهێنانی ئەم شیعرە لیریكییە جوانەی سیمای مرۆڤایەتی و گێتی پێوەیە.

عەلی لەساڵی ١٩٥٦ شیعری "چرای سوكرات"ی داناوە:

**برای من**
**وەرە پێش چرای من**
**نەوەک چرایانە**
**بیّ ژمار پەروانە**
**بەدەوریدا دەفرن**
**شەوقی لیّ وەردەگرن**
**دەبن بەتروسكە**
**بەگڵپەو برووسكە**
**وەک خۆرەتاوی پاک**
**جیهان دەكەن رۆناک**

***

**ئەی شەمشەمەكوێرە**
**بەدووركەوە لێرە**
**برۆ بەدووركەوە**
**بۆت ناكوژێتەوە**
**چرای من راستییە**
**شەوقی سەربەستییە**
**بەخوێنە سووتانی**
**شەهیدە زمانی**
**برای من**
**وەرە پێش چرای من**

عەلی لەساڵی ١٩٥٦ ئەم شیعرەی بەزمانی باوكی فەیلەسووفانی گریگ سوكرات وتووە. ئەم دانا گەورەیە خاوەنی وتەی "خۆت بناسە"یە. دادگای پیرەكانی ئەتینا بریاری خنكاندنی بۆ دەركردبوو، بەژەهراو خواردنەوە كۆتایی بەژیانی هێنا.

شاعیر بەسەر بیری سەربەستیخوازی سوكرات هەڵدەڵیّ، كرینی سەربەستی بەخوێن كارێكی ئاساییە وەكو سوكرات خۆی دەیڵیّ.

## عاجز
## ١٩٢٩-١٩٦٧



### ژیانی

عەبدوڵلا کوڕی مەلا محەمەدی حوسێنی بەرزنجی، وشەی "عاجز"ی وەک نازناو هەڵبژاردووەو لەشیعریدا بەکاری هێناوە. لەساڵی ١٩٢٩ لەگوندی چل هەوێزە لەنزیک دیبەگە لەپارێزگای هەولێر لەدایک بووە. قۆناغەکانی خوێندنی لەحوجرەی مزگەوت بووە، بایەخی بەتەجویدی قورئان داوە. زۆربەی ماوەی خوێندنی لەگوندی زیخان لەناوچەی خۆشناوەتی بووە، ماوەیێکیش لەزێوەی خۆشناوەتی خوێندوویەتی، ئینجا هەر لەو ناوە لەگوندی خەتە بەشێکی دیکەی خوێندنی بردۆتە سەر. لەپاشان هەر بۆ ئەم مەبەسە ڕووی کردۆتە ڕواندزو لەدواییدا گەڕاوەتەوە هەولێرو لەمزگەوتی حاجی قادری دەباغ ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە. لەدوای ئیجازە وەرگرتن لەهەندێ لەناوچەکانی کوردستان لەمزگەوت مەلایەتی و پێشنوێژی کردووە. لەگوندەکانی هەرمەک و دەراش لەخۆشناوەتی مەلا بووە. ئینجا بووە بەمەلای گوندی گۆمەشین لەدەشتی قەراجی هەولێر. لەپاشان گەڕاوەتەوە گوندی کۆتەی خۆشناوەتی، ئەوجا گوندی شاوێس لەنزیک هەولێر. لەدوای ئەمە لەلایەن کارگێڕی ئەوقافەوە بووە بەمەلا لەخورماڵ، لەپاشان لەچەمچەماڵ. لەدوا جاردا گەڕاوەتەوە هەولێرو بووە بەماموستای قوتابخانەی ئەوقاف و لەمزگەوتی حاجی بەکریش بووە بەئیمام و خەتیب.

لەپڕ عاجز تووشی نەخۆشییەکی دژوار بووە، بردوویانە بۆ نەخۆشخانەی هەولێر، بەڵام بێ ئەنجام بووە، ناچار بردوویانە بۆ مووسڵ لەوێش چاری نەکراوە، بەم جۆرە لە ٢ی مایسی ١٩٦٧ لە مووسڵ کۆچی دوایی کردووەو تەرمەکەیان هێناوەتەوە هەولێرو لەنزیک مزگەوتەکەیەوە بەخاکیان سپاردووە.

### شیعری

عاجز حەزی لەخوێندنەوەی شیعری کلاسیکی کوردی بووە، هەروەها بایەخی زۆری بەئەدەبی میللیی سەرزار (فۆلکلۆر) داوە. لەئەنجامی ئەمە گوێیەکی نەرمی مۆسیقی لەلا دروست بووە، بەگشتی بۆ بابەتی شیعری ئایینی و دڵداری بەکاری هێناوە.

شیعری عاجز لەڕووی ڕوخسارەوە بریتییە لەپارچە غەزەلی کورت (لیریک) لەسەر بەحری عەرووزو یەکێتیی قافیەو پاش قافیە دامەزراوە. شیعری زۆر نییە، بۆیە بەشێکی کەمی لەدەنگەکانی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی بەکارهێناوە، بەم پێیە پاش قافیەشی زۆر نییە. جگە لەغەزەل شیعری بەندی چوارینی و پێنجینی عەرووزی هەیە (ااا ب) و (اااا ب).

لەشیعری سیلابی خۆماڵیدا بەزۆری بابەتی بەندی چوارینی (ااا ب) بەکارهێناوە، لەڕووی کێشەوە بەگشتی لەسەر کێشی حەوت بڕگەیی و هەشت بڕگەیی ڕۆیشتووە. لەڕووی ناوەڕۆکەوە شیعری عاجز لەچوارچێوەی دڵداری شێوەی کلاسیکی و ئایینی (موناجات و نەعتی پێغەمبەر "د.خ") نەچۆتە دەرەوە. ئەوەی تازە بێ لەلای ئەم شاعیرە ئەوەیە قاڵبی کێشی شیعری خۆماڵی میللی لەگەڵ شیعری ئایینی گونجاندووە. بەشێکی زۆر لەشیعرە ئایینییەکانی لەڕووی کێش و قافیەو زمانی شیعرییەوە لەسەر بنچینەی بەیتی ئەدەبی میللیی فۆلکلۆری هۆنراونەتەوە. ئەمەی بۆ ئەوە بووە لەئاهەنگی مەولوودی پێغەمبەر ئەم شیعرانە لەسەر ئاوازی گۆرانییە میللییەکان بخوێنرێنەوە، بەتایبەتی لەناو کۆمەڵی خەڵکی هەولێر.

عاجز شیعری هەندێ شاعیرانی کوردی کردووە بەپێنج خشتەکی، لەوانە: عاسی، مەلا شێخ عومەری بالیسانی، راجی، تاهیر بەگ، وافی.

**نموونەی شیعری**

**وەسف و دڵداری**

لە شیعرێکیدا عاجز دەڵێ:

**شۆخەکەی بێ رەحم و ئینساف قاتیلی جانم وەرە**
**باعیسی گومراهی رووح و شێخی سەنعانم وەرە**
**دڵ هەمیشە ئینتیزاری لوتف و ئینعامی تووە**
**دەردمەندی قامەتی تۆم چاو بەگریانم وەرە**

لەکۆتایی شیعرەکەدا دەنووسێ:

**(عاجز)م رووحی رەوانم پڕ لەئێشە جەرگ و دڵ**
**تۆی تەبیبم زوو لەبۆ دەرمانی دەردانم وەرە**

شیعرێکی ئاسایی دڵدارییە. شاعیر گفتوگۆ لەگەڵ دلبەری خۆشەویستی دەکا، لێی دەپارێتەوە. وشەی "وەرە"ی کردووە بەپاش قافیە بۆ ئەوەی لەهەموو دێڕە شیعرێکیدا بڵێ "وەرە تیماری دەردم بکە" لەلیریکەکەدا هەست بەرەوانییێک دەکرێ. ئەگەر شاعیر وشەی "تووە"ی لەباتی "تۆیە" و هەندێ وشە و تەعبری دیکەی لەم بابەتەی بەکارنەهێنایە کەس نەیدەزانی شاعیر هەولێرییەو دیالێکتی بچووکی شار یا سۆرانی کرمانجی باشووری زمانی کوردی بەکارهێناوە.

لەشیعرێکی دیکەیدا عاجز دەڵێ:

**ئەی سەنەم تاکەی بناڵم من لەدووری رێ و خێ**
**بەس بەناحەق پێم پیشان دە غەین و رێ وو بێ وو تێ**
**غوربەتیش یەک جار وەها زوڵمە لەعاشق چاوەکەم**
**مروەتت بێ پێم بفەرموو رێ وو حێ وو میم و تێ**

بەم شێوەیە کۆتایی بەشیعرەکە دێنێ:

**بۆ زەکاتی باغ و بێستانی جەمالت هاتووم**
**نامەوێ زیاتر لە حەققی شێن و رێ وو عەین و بێ**
**پڕ خرۆشە دڵ وەکو بولبول لەدەوری غونچە گوڵ**
**جارێ دڵ خۆش کە حەبیبم عەین و ئەلف و جیم و زێ (عاجز)**

عاجز لەم لیریکەدا خۆی خەریکی گەمەیێکی رەوانبێژی کردووە لەسەر دەستووری هەندێ لەشیعری کلاسیکی کۆن. لەنیوە دێڕی دووەمی هەموو دێڕەکان دەنگ و وێنەی هەندێ لەتیپی ئەلفوبێی نووسیوە، لەنیوە دێڕی یەکەمی هەموو دێڕەکاندا تیپەکانی کۆکردۆتەوەو بوون بەوشەی یەکەمی دێڕی دوای ئەو، واتە دەنگەکانی غەین و رێ و بێ و تێ دەبن بە "غربت" (غوربەت)، رێ و حێ و میم و تێ دەبن بە "رحمت" (رەحمەت)..

شیعرێکی میللییانەی عاجز بەم دێڕانە دەست پێ دەکا:

**ئەی گوڵروخی زیبایی من**
**قەد سەرووی دڵ روبایی من**
**مەلحەمی جان شیفایی من**
**جارێ نەزەرکە لایی من**

بەم دێڕانەش کۆتایی پێ دێنێ:

**جەفا بەسە وەفا بکە**
**(عاجز) بەوەسڵت شا بکە**
**لەغەمخۆری رەها بکە**
**ئەو دڵی مویتەلایی من**

ئەم شیعرە هەشت بڕگەییە لەئەدەبی میللی سەرزاری کوردی یەکێکە لەکێشەکانی شیعری گۆرانی. عاجز ئەم جۆرە شیعرەی تەنیا لەرووی روخسارەوە دەستنیشان نەکردووە، بەڵکو لەرووی ناوەرۆکیش بۆ بابەتی شیعری ئایینی بەکاری هێناوە. ئەم جۆرە شیعرانە ئەوەندە لەئەدەبی میللییەوە نزیکن ئەگەر ناوی شاعیریان تێدا نەبێ بەگۆرانییێک لەگۆرانییە تازەکان دەژمێررێن، کە لەناو میللەت دروست دەبن و کەس نازانێ خاوەنیان کێیە!

**شیعری ئایینی (موناجات و نەعت)**

عاجز قەسیدەییێکی (بەیتێکی) ئایینی درێژ بەم دێڕانە دەست پێ دەکا:

**ئەی سەییدی سەرداری من**
**ئەی مەحرەمی ئەسراری من**
**ئەی ئەحمەدی موختاری من**
**سەلات لەسەر توو یاری من**

بەم دێڕانەش کۆتایی پێ دێنێ:

**(عاجز) فەقیری ئوممەتە**
**سائیلی بابی رەحمەتە**
**هەر چاوەنۆڕی هیممەتە**
**بۆ دەفعی نالەو زاری من**

عاجز ئەم شیعرەی بۆ ستایشی پێغەمبەر داناوە، بەسەرهاتی دەگێڕێتەوە بەپێی سەرچاوەكانی ئایینی ئیسلام و حیكایەتەكانی ئەدەبی میللی سەرزاری عەرەبی و كوردی. بەناوی هەمزەی كوڕی عەبدولموتەلیبی مامی پێغەمبەرو خەلیفەكانی ڕاشیدی كۆتایی بەشیعرەكەی دێنێ.

شاعیر لەقەسیدەییەكی ئایینی دیكەیدا لەستایشی پێغەمبەر بەم دێڕانە دەست پێ دەكا:

**تو ئەحــمــەدی مــوخــتــاری**
**مــوقــەڕڕەبی غــەفــفــاری**
**شــافــیــعی توڕڕەداری**
**لــێت بــێ ســـەلامی باری**

بەم دێڕانەش كۆتایی بەشیعرەكە دێنێ:

**(عــاجــز) ئەگــەرچی خــواری**
**لەدەرگــەی شــەرمــەزاری**
**مــەئیــووس مــەبە لەیاری**
**شــافــیــعــتــە لای غــەفــفــاری**

لەم شیعرەدا عاجز باس لەهەندێ شەعائیرەكانی حەج و كۆچی پێغەمبەر لەمەككەوە بۆ مەدینە دەكاو لەپێشوازی خەڵكی ئەو شارە دەدوێ و چۆن بەخۆشییەوە پێشوازی ئەو میوانە گەورەیان كردووە.

## بێبەش
## ١٩٣٢-١٩٩٨

### ژیانی

**مەرد بە نامەرد ئیشی كەوێ گەر بۆی نەكا پێی مەردییە**
**مەردیش بەمەرد ئیشی كەوێ گەر بۆی نەكا نامەردییە**

مەسعوود كوڕی مەلا عەبدوڵلای شەنەغەیی لەساڵی ١٩٣٢ لەهەولێر لەدایك بووە. شەنەغە گوندێكە لەدەشتی كەندێناوەی هەولێر خەڵكی عەشرەتی سیانی لێ دەژی. لەو كاتەی خۆی بە شاعیر ناسیوە نازناوی "بێبەش"ی هەڵبژاردووە، لەهەندێ شیعریدا بەكاری هێناوە. باوكی مەلای مزگەوتی ناو بازاڕی هەولێر بوو (لەهەولێر مزگەفتی ناوەندی بازێڕی پێ دەڵێن). سەرەتای خوێندن و هەموو قۆناغەكانی زانستی ئیسلامی و زمانی عەرەبی لای باوكی بووە.



بێبەش دەنگی خۆش بووە، بایەخی زۆری بەتەجویدی قورئان داوە. شارەزایی لەو هونەرەدا لەڕووی تیۆری و پراكتیكەوە پەیدا كردووە. لەساڵی ١٩٥٦ هەندێ لە هونەری تەجویدی قورئانی گۆڕیوەتە سەر زمانی كوردی و بەكتێب بڵاوی كردۆتەوە. بەشێك لەخوێندنەكانی بەدەنگی خۆی تۆمار كراون.

گوزەران و بەڕێوەچوونی ژیانی لەڕووی داراییەوە لەسەر مەلایەتی بووە. لەمزگەوتێكی بچووكی گەڕەكی خۆیان مەلایەتی كردووە، بەڵام بەگشتی بەپێچەوانەی ژیانی مەلایان لەكۆمەڵی كوردەواریدا ئەوەندە لێیانەوە نزیك نەبووە، زیاتر پێوەندی لەگەڵ ڕۆشنبیرو شاعیرو نووسەرو مووچەخۆران بووە. جوببەو عەمامەی لەبەر نەكردووە، لەپێشاندا شەرواڵ و مرادخانی و لەپاشان ڕانك و چۆغەی لەبەر كردووە.

بێبەش كەسێكی قسە خۆش و گیان سووك بوو، نوكتە لەدەمی نەدەكەوت، لەهیچ پرس و هەڵوێستێكدا دانەدەما، هەولێری زۆر خۆش دەویست، بەدرێژایی ژیانی لێی دوور نەكەوتەوە. تا لەڕۆژی ٢٥ی مایسی ١٩٩٨ لەهەولێر كۆچی دوایی كرد.

### شیعری

بەهەری دەنگ خۆشی بێبەش هانی داوە گۆرانی و

مەقام بچڕێ و قورئان بەتەجوید بخوێنێ. ئەم دیاردەیە گوێییەکی مۆسیقی هوشیاری لا دروست کردووەو بەرەو گێتیی شیعری کلاسیکی پاڵی پێوە ناوە، چونکە ئەمەش لەسەر ئاوازو ڕیتم دامەزراوە. لەتەمەنی مێردمنداڵییەوە پێوەندی لەگەڵ شاعیرانی دەوروبەری خۆی بووە لەهەولێر، بەتایبەتی لەگەڵ جاهیدو پیربال مەحموود. لەگەڵ جاهید هەولی داوە پێکەوە شیعر دابنێن. حەزی لەشیعر خوێندنەوە بووە، شیعری زۆری لەبەر کردووە، شانازی بەشێخ ڕەزاوە کردووەو بەمامۆستای خۆی داناوە.

**شیعری لەڕووی ڕوخسارەوە**

بێبەش پێڕەوی هەموو مەرجەکانی شیعری کلاسیکی کردووە. بەگشتی شیعری دەچێتە ناو خانەی شیعری کلاسیکییەوە. لەکێشدا بەزۆری بەحرەکانی ڕەمەل و هەزەجی بەکارهێناوە، لەقافیەدا لەسەر یەکێتیی قافیە دەڕوا. زۆرینەی شیعری بەقەوارە کورتن لەبابەتی لیریکن، قەسیدەی درێژی کەمە. بایەخی زۆری بەچوارین داوە، بەشێک لەدیوانی لەم بابەتەیە، هەروەها تاکیش بەرچاو دەکەوێ. لەسیستێمی بەندا (کوپلە) بەندی پێنجین و شەشینی هەیە. لەو کاتەی پێنجین لەدیوانی بێبەشدا بەرچاو دەکەوێ، لەو زیاتر هۆگری پێنج خشتەکی بووە، شیعری کۆمەڵێک لەشاعیرانی کوردی کردووە بەپێنج خشتەکی، لەوانە: نالی، حاجی، سانی، وەفایی، حەمدی، سابیری، سافی، بێکەس، کەمالی، مەلا ئەسعەدی مەحوی، جاهید، هێمن، هەردی و هی دیکە.

**شیعری لەڕووی ناوەڕۆکەوە**

جگە لەدڵداری کە مەبەستی سەرەکی شیعری بێبەشە، ناوەڕۆکی شیعری کوردایەتی ڕەنگدانەوەی بیروباوەڕی لاوانی هەولێری پەنجاو شەستەکانی سەدەی بیستەمە. لەو شیعرانەدا هەستی گیانی نەتەوەیی و سۆزی خۆشەویستی کوردستان لەدڵ و دەروونی گەنجاندا دەجوولێنێ. ئەو شیعرانە لەهەندێ ماوەی فەرمانڕەوایی دیکتاتۆری لەڕەشبگیری حوکمی عورفی، هەرچەندە قەدەغەبوون و بڵاوکردنەوەیان ئاسان نەبوو، بەڵام لەناو خەڵکی بەئەزبەر دەخوێنران و لەبەردەکران.

مەبەستی هەرە گرنگ لەشیعری بێبەشدا ئەو شیعرانەیە لەهونەری بابەتی داشۆرین و شیعری کراوە (ئیرۆتیک). بێبەش شێخ ڕەزایانە ئەم دوو بابەتەی تێکەڵ بەیەکتری کردووە. بەرهەمی لەم ڕەنگەی زۆرە، بەڵام ئەوە هەیە تا ئێستا بڵاونەکراوەتەوە. بەناوی ئەوەی ئەو شیعرانەی بۆ کەسانی دیارکراو وتراون. بنەماڵەی شاعیر لەسەر ئەو باوەڕەن ئەو شیعرانە ئەگەر بڵاو بکرێنەوە ناوی خاوەنەکانیان پێ دەزرێ.

**نموونەی شیعری**

**دڵداری**

لەشیعرێکیدا بێبەش هەستی دەروونی دەردەبڕێ بۆ ئەو خانمەی خۆشی دەوێ، لەساڵی ١٩٤٩ هۆنیویەتییەوە:

**لە عەشقی تۆ ئەزانم من نەجاتم**
**مەحاڵە تاوەکو مابێ حەیاتم**
**بەداوی زولفی هارووتت بەقوربان**
**دڵم بەندە هەتا وەختی مەماتم**

لەکۆتاییدا دەنووسێ:

**لەتاریکی فیراقت دامە (بێبەش)**
**هەموو دەم ئینتیزاری ڕۆژهەڵاتم**

شاعیر لەسەر دەستووری دڵداریی شاعیرانی کلاسیک هەرچەندە بەکردەوە دلبەر لەگەڵی خراپ بێ و لێی دوور بکەوێتەوە، ئەو هەر خۆشی دەوێ. هەوڵ دەدا ئەوە بخاتە ڕوو مەسەلەکە بەدەست خۆی نییە. ئاگری دڵداری نهێنی لەناو دڵیدا نەخشی کێشاوە، چارەسەری بەدەست خۆی نییە، لەتاریکی دووریدا دەژی، بۆیە چاوەنۆڕی ڕووناکیی ڕۆژهەڵاتە، چاوەنۆڕی ئەوەیە ماچێک وەک زەکات لەدلبەر وەربگرێ، ئەمە هەموو ئاواتێکی بۆ دەهێنێتە دی.

**کوردایەتی و نیشتمانپەروەری**

بێبەش ڕوو دەکاتە ئەو کوردانەی خۆیان بەکورد نازانن و پێیان دەڵێ:

**کوردی بۆ حاشا ئەکەی دایم لەقەوم و خوێش و کار**
**کوردی بۆ کورد نیم ئەڵێی ئەگریت و ڕێگای چەوت و خوار**

**کوردی بۆ کەم تێ ئەگەی کەم خۆتی جارێ نا هەزار**
**کوردی وەک تۆ دەک نەمێنێ کوردی وا بێ شەرم و عار**
**لاڵ و کەڕ بێ پڕ کەدەر بێ هەر بکێشێ ئاه و زار**
**سووک و ڕیسوا بێ هەموو دەم نەیبێ قەدرو ئیعتیبار**

ئەم پارچە شیعرە بەندێکە لەقەسیدەیێکی شەشین، بێبەش لەساڵی ١٩٥٠ هۆنیویەتیەوە. قسە لەگەڵ هەندێک لەخەڵکی شار دەکا، ئەمانە بەنەژاد کوردن و بەکوردی پەروەردە بوون، بەڵام خۆیان بەکورد نازانن و هەندێکیان دوژمنایەتی کوردیش دەکەن بەیادی دەسەڵاتی عوسمانی پێشوو و بیری کەمالییەکانی تورکیا لەمەسەلەی نەتەوەیی کورددا.

شاعیر بەهۆی گەڕانەوەی مستەفا بارزانی و بارزانییە پەنابەرەکان لەساڵی ١٩٥٨ لەڕووسیاوە بۆ نیشتمان دەڵێ:

**لەهەر لا وەک بەهەشت ڕازا جیهانی کوردو کوردستان**
**کە ژەنراڵ مستەفا دەرچوو لەغوربەت بوو بەرەو بارزان**
**بە دەرکەوت ڕۆژی ڕووناکی لەژێر هەوری خەفەت باران**
**فەرەح کەوتە دڵی مەردم نەما لاچوو هەموو غەمان**
**سوپاس بۆ خوا بکەن ئیتر لەهەر لا ئەی گەلی کوردان**
**گەیینە ڕۆژی ئازادی نەما ئازارو تێهەڵدان**

بێبەش ئەم پارچە شیعرەی وەک بروسکەیێک نووسیوە، پیرۆزبایی لەبارزانی دەکا بەهۆی گەڕانەوەی لەئاوارەیی ڕووسیایەوە بۆ نیشتمان. بارزانی و کۆمەڵێک لەجەنگاوەرانی بارزانییان لەدوای جەنگی دووەمی گیتی ئاوارەی ڕووسیا بوون ماوەی دە دوازدە ساڵ لەوێ مانەوە. گەڕانەوەیان جێی خۆشی و گوشادی بوو بۆ بێبەشی شاعیرو بۆ هەموو کورد.

بێبەش لەشیعرێکیدا باس لەڕۆژانێکی ڕەشی کورد دەکا، لەمێژووی کورددا ئەم ڕۆژە ڕەشانە زۆرن:

**بەختی بەدی ئێمەی کورد تاکەی لەبەدی دابێ**
**هەستێ لەخەوی غەفڵەت هەستا ئەوی هەستا بێ**
**هەر میللەتێ ئەیبینی ئێستا هەموو سەربەستێ**
**هەر کوردە هەتا ئێستا بێبەش کە وەها مابێ**
**هەر کوردە لەژێر دەست ماو هەر کوردە کە بێ هەست ماو**
**هەر کوردە کە چاوبەست ماو هەر کوردە بەتەنیا بێ**
**هەر کوردە کە ئەیبینی یێکی کە دووسەد دێنێ**
**وەختی کە لەجەنگ دابێ وەک ئەو نییە ئازا بێ**
**گەر یەکێتی بنوێنێ ئەو مافە زوو دەستێنێ**
**زۆر حەیفە لەجەنگدا بێ دوژمن لەتەماشا بێ**
**(بێبەش) کە ئەڵێن کوردە گەر ورد بێ ئەوی مەردە**
**لەم خاکە کە هەیتی کورد بێ مەلجەئو مەئوا بێ**

ئەم شیعرە لەساڵی ١٩٦٦ نووسراوەتەوە، ئەو کاتە کورد لەکارەساتدا بوو، شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ی کوردستانی عێراق دەوری گرنگی هەبوو لەداواکردنی مافی کورد، بەڵام سیاسەتی ناوەوەی عێراق و دەست تێوەردانی دەرەوە لەئەمپریالیستی ئەورووپاو ئەمەریکاو دەوڵەتە هاوسێکانی عێراق لەبار نەبوو بۆ سەرکەوتنی شۆڕشەکە. لەم شیعرەدا شاعیر سیمبۆلییانە ئاماژەی هەیە بۆ ئەو دووبەرەکییەی لەناو ڕیزی شۆڕش پەیدا بوو لەساڵی ١٩٦٦ـ و کورد کەوتنە کوشتنی یەکتری و دوژمن بەخۆشییەوە تەماشای دەکردو سوودی لێ وەردەگرت، لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕی بەئازایی و لاوچاکی کورد هەبوو، ئەگەر یەکێتییان هەبێ دەتوانن بگەنە ئامانجی خۆیان.

لەم شیعرەدا بێبەش دێرە شیعرێکی بێکەس شی دەکاتەوە، بەوەی کورد جەژنی زۆرە، دەتوانێ هەموویان پیرۆز بکا، بەڵام جەژنی ڕاستی لەو کاتەدا دەبێ کە لەدیلی ڕزگاری دەبێ و بەئازادی دەژی.

ئەستووری بیروباوەڕی شاعیرو زۆربەی ڕۆشنبیری کورد لەم دێرە شیعرەی بێبەش ڕەنگی داوەتەوە:

**کەس بەکورد ناوەستێ تەنیا خائینانی کورد نەبێ**
**لێکی ناکا دۆست و دوژمن تاکو ئەستۆی ورد نەبێ**

وەک تیۆرییێکی ڕاست لەزانستی کۆمەڵایەتیدا مەسەلەی ڕزگاری نەتەوەیی کورد لەناوەوە دەست پێ دەکا. دوو کردەوە دژی مەسەلەکەن. یەکێکیان ئەو تاوانبارانەی دوژمنایەتی لەگەڵ کورددا دەکەن، ئەوی دیکەیان بەناوی کوردایەتییەوە دووبەرەکی دەنێنەوە، کردەوەی هەردوو لایان بەخراپە دەگەڕێتەوە. جا با یەکەمیان دوژمنایەتی ڕووت بێ و دووەمیان بەناو سۆزی نیشتمانی و کوردایەتی تێدا بێ!

**داشۆرین و شیعری کراوە (ئیرۆتیک)**

بێبەش مەبەستەکانی داشۆرین و شیعری کراوەی (سێکسی) تێکەڵ بەیەکتری کردووە. شیعرێکی زۆری لەم بابەتەی هەیە، هەندێ نەریتی کۆمەڵایەتی بوونەتە هۆی بڵاونەکردنەوەیان. بۆ نموونەی ئەم بەشەی لەسەر بێبەش نووسراوەتەوە لەم کتێبەدا توانرا هەندێ لەو جۆرە شیعرانە دەست بخرێن. بنەماڵەی شاعیر بەتایبەتی مەحموود زامداری برای جێگەی سوپاسن بۆ پێشکێش کردنی ئەو شیعرانە.

لەشیعرێکیدا بێبەش بەم جۆرە کەسێک دادەشۆرێنێ:

**حەمەی وەستا سەوری راستە سەورییە**
**سەورییە هەر بۆ جیناس و تەورییە**
**وا ئەویش خۆی خستە داوم تێپەری**
**ئیفتیرام با پێ بکاتن دەورییە**
**دەورە دەورە دەوری ویش تێپەڕ دەبێ**
**لێی ئەسێنێ ئەم کڵاوو هەورییە**
**ئەحمەقە حەققە بڵێم پێی ئەم کەرە**
**وەک کەری کەوری کەرە نەک کەورییە**
**موستەحەققی هەجوە شیعری هەجوی من**
**وەک جەنابی شێخ رەزایە فەورییە**

بەم شێوەیە کۆتایی بەشیعرەکە دێنێ:

**زۆر سوارە شیعرەکانم وەک رەزا**
**بۆ پەلاماردان دەڵێی وەک بەورییە**

لەم شیعرەدا حەمەی وەستا رەمزێکە بۆ کەسێکی دیاریکراو، گرنگ ئەوە نییە کەسەکە بناسرێ، بەڵکو نرخی هونەری و جوانکاری شیعرەکەیە. لەرووی رەوانبێژییەوە شاعیر سەرکەوتووە، بەتایبەتی کە وشەی "سەوری" (شۆڕشگێڕ) دووبارە و سێبارە دەکاتەوە. ئەو کەسە بەخۆپەرست و هەلپەرست دەخاتە روو. کەسێکی بێ بارە، بۆیە بوو بەمووچەخۆرێکی گەورەی دەسەڵاتی میری. شاعیر ئەوە دەردەبڕێ ئەو کەسە شایانی ئەم مەقامە نییە. لەدواییدا شانازی بەشاعیرییەتی خۆی دەکاو شێخ رەزا بەمامۆستای گەورەی خۆی دەژمێرێ.

لەچوارینێکیدا بێبەش بە "حاجی"یێک دەڵێ:

**حاجی حیز بابی تەرس گەووادی کۆنی دوودەکی**
**حاجی راستم پێ بڵێ حیزی لەکی یا ماڵەکی**

**بۆم بەدەرکەوت مەزهەب و ئایین و دینت پارەیە**
**لازمە بتکەن بەتەمسیل کاحەمەو حاجی مەکی**

شاعیر حاجیێکی کردۆتە نموونەی ئەو دەوڵەمەندانەی پارە لەلایان هەموو شتێکە. بەناوی حەج کردنەوە هەموو جۆرە فێڵ و فەنەرێک بەکار دێنن بۆ دەوڵەمەند بوون. لەکۆمەڵی کوردەواری ئێمەدا بەتایبەتی لەشاران کەسانی لەم بابەتە زۆرن. شاعیر پێشنیاز بۆ کاکە حەمەو حاجی مەکی دەکا ئەو حاجییە بکەن بەقارەمانی چیرۆکێکی شانۆ یا سینەما. ئەوەی پێویستە لێرەدا روون بکرێتەوە ئەوەیە مەبەستی لە "کاکە حەمە" محەممەد سدیقی محامییە لەگەڵ حاجی مەکی ئەکتەری شانۆو سینەمای کوردی لەهەشتاکانی سەدەی بیستەم. هەردووکیان لەهەولێر دەژیان و دۆستایەتییان لەگەڵ بێبەشدا هەبوو. بەتایبەتی محەممەد سدیق لەبەهرەی دانانی شیعر بێ بەش نەبوو، لەگەڵ بێبەشدا شەڕە شیعری زۆرە.

## پیربال مەحموود
## ١٩٣٤-٢٠٠٤



**ژیانی**

پیربال کوری مەحموود لەساڵی ١٩٣٤ لەهەولێر لەدایک بووە. تەنیا بەناوی خۆی و باوکی لەناو خەڵکیدا ناسراوەو لەژیانی ئەدەبیدا بەکاری هێناوە. نەیویستووە بەهیچ ناوو نازناوێکی دیکەوە بناسرێ. باوکی لەرووی

داراییەوە دەست درێژ نەبووە، دایکی لەخێزانێکی ئایینی سەر بەمزگەوت و شەریعەت و تەریقەت بووە. قوتابخانەی سەرەتایی لەهەولێر تەواو کردووە، لەقوناغی خوێندنی ناوەندی و ئامادەیی گەیشتوتە پۆلی پێنجەمی بەشی ئەدەبی، بەڵام تەواوی نەکردووە. لەسەردەمی لاویەتیدا باوکی کۆچی دوایی کردووە، چێژی لەئەدەب وەرگرتووە، لەسیاسەت نزیک کەوتۆتەوە، بیری لەگەڵ بێ نەوایان و زەحمەتکێشاندا بووە. بۆ دابینکردنی گوزەرانی لەدوای وازهێنانی لەخوێندن بەمووچەخۆر لەکارگێڕی شارەوانی هەولێر دامەزراوە. لەساڵە نەهاتەکەی عێراق و کوردستانی عێراق لەدوای کودیتا فاشیستییەکەی ٨ی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ی بەغدا لەگەڵ کەسانێکی یەکجار زۆر گیراوە. لەپاش ئازادبوونی لەدوای دوو ساڵ گەڕاوەتەوە هەولێر. لەساڵی ١٩٦٥ بۆ بەڕێوەبردنی ژیانی دارایی خەریکی کاری ئەرزوحاڵ نووسی بووەو کاروباری زەوی و خانوو فرۆشتنی لەتاپۆ بۆ خەڵکی گەیاندۆتە ئەنجام. لەساڵی ١٩٦٨ بەمووچەخۆر گەڕاوەتەوە کارگێڕی شارەوانی هەولێرو لەبەشی تایپرایتەر دامەزراوە. لەساڵی ١٩٨٣ خانەنشین کراوە.

کە خانەنشین کرا تا دوایی ژیانی لەنێوەندی ئەدەبی و ڕۆژنامەگەرییەوە نزیک بوو، لەسەر هەندێ لەبەرهەمی ئەدەبی لەشیعرو پەخشان دەژیا، سەرپەرشتی بڵاوکردنەوەی چاپەمەنی دەکرد لەکتێب و ڕۆژنامەو گۆوار. لەساڵانی دوایی ژیانیدا نەخۆشیی دڵ ئازاری دەدا، تا ڕۆژی ١٧ تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٤ لەنەخۆشخانەی کۆماری هەولێر کۆچی دوایی کرد.

**شیعری**

پیرباڵ لەمنداڵییەوە هەوەسی لەشیعر بووە، حەزی لێ کردووە، توانای لەبەرکردنی بەهێز بوو، زوو شیعری لەبەر دەکرد، بۆ ماوەیێکی زۆریش لەبیری نەدەچووەوە. ئەم دیاردەیە بەهرەی گوێی مۆسیقی لەلا دروست کردبوو. خانەکانی ناو مێشکی پڕ بوون لەوێنەو ئاوازی گەلێ لەشیعری کوردی و عەرەبی و تورکی. خانە بەتاڵەکانی ناو مێشکی دەیانتوانی هەندێ لەتارمایی ئەو وێنەو ئاوازانە بدزن و بەشێوەیێکی دیکە بیانکەن بە بەرهەمی شیعری.

بەرهەمی پیرباڵ هەمووی ناچێتە ناو ئەم بابەتەوە، شیعری هەیە داهێنانی خۆی پێیانەوە دیارە.

یەکەمین نووسینی پیرباڵ پارچە پەخشانێک بووە لەعەرەبییەوە وەریگێڕاوەتە سەر کوردی و لەساڵی ١٩٥٥ لەگۆواری "هەتاو" لەهەولێر بڵاوی کردۆتەوە. لەو دەمەوە لەگەڵێ ڕۆژنامەو گۆواری کوردی و هەندێکی عەرەبی شیعرو نووسینی هەیە. جگە لەوە لەبڵاوکردنەوەی شیعری لەسیپارەو کتێبی بچووکدا چالاک بوو. ناوە ناوە شیعرە بڵاوکراوەکانی جارێکی دیکە لەدوو توێی کتێبدا دەیگەیاندنە خوێنەر. هەندێ لەبڵاوکراوەکانی "لافاو" (کەرکووک ١٩٥٧)، "بەهەشتی دڵداری" (کەرکووک ١٩٥٨)، "بزەی سروشت" (بەغدا ١٩٨٥)، "مەرگی نەوجەوانی" (هەولێر ٢٠٠٤) و هی دیکە بوون. پیرباڵ بەڕاستی لەشاعیرییەتی خۆی گەیشتبوو، ئەوەی لەدڵی ڕەخنەگردا بوو خۆی دەریدەبڕی و دەیوت: "من هەواکارم پیشەکار نیم" بەو مانایەی هەوەسی شیعری هەیەو شیعر نەبووە بەپیشەی. سەرچاوە بنچینەییەکانی بۆ پەیداکردنی زانست و زانیاری لەبابەت ئەدەبەوە بەتایبەتی شیعر دیوانی شاعیرانی کوردی کۆن و نوێ بوو. ڕێبازی ڕۆمانتیزمی زۆر پێ خۆش بوو، لەبەر ئەوە بەرهەمی شاعیرانی مەهجەری عەرەب و جەماعەتی ئەپۆلۆو شاعیرە ڕۆمانتیکەکانی میسرو لبنان بەتایبەتی عەلی مەحموود تەهای موهەندس سەرچاوەیێکی گرنگ بوون بۆ مشتوماڵ کردنی بیرو چێژو خەیاڵی پیرباڵ. شاعیر بەسەلیقە لەزۆربەی بابەتەکانی شیعری کوردی سەردەمی خۆی دەنووسییەوە. هەردوو جۆرە کێشی بەحری عەرووزی و کێشی سیلابی خۆماڵی بەکارهێناوە. لەقافیەدا یەکێتیی قافیەو جووت قافیە (مەسنەوی) و قافیەی ڕەنگاو ڕەنگی هەیە. لەبابەت ڕوخسارەوە "شیعری نوێ"ی هۆنیوەتەوە، واتە ئەو شیعرەی لەتاکێکدا زیاتر لەکێشێک و قافیەیێک بەکار دێنێ.

بەگشتی پیرباڵ بایەخ بەکێش و ڕیتم و مۆسیقا دەدا، ئەوەندە بەتەنگ ماناوە نییە، لەبەر ئەوە هەرچەندە زمانی ڕەوانە، میللییانەو زمانی قسەکردنی ڕۆژانەیەو مۆرکی دیالێکتی ناوچەیی هەولێر (سۆرانی) پێوەیە، بەڵام هەندێ جار وشەو تەعبیری وا بەکار دێنێ بەم کارەی مانا دەکاتە

قوربانی کێش و ڕیتم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو جۆرە دێڕانە لەشیعریدا قورس خۆیان نانوێنن و بەناسکی دەکەونە بەرگوێ و ناو دڵی خوێنەرەوە.

**نموونەی شیعری**

**لەسەر گۆڕی یار**

پیرباڵ لەتافی لاویدا لەگەڵ کچێکی خزمی خۆی پەیمانی دڵداری بەستووە، لەناکاوو لەسەردەمێکی چاوەنۆڕ نەکراو لەساڵی ١٩٥٥ سەعادەتی دەسگیرانی جوانەمەرگ دەبێ. ماتەمنامەی بەکوڵی بۆ ئەم خۆشەویستە بەم جۆرە دەست پێ دەکا:

**لەسەر گۆڕت وەکو بولبول ئەناڵێنم هەتا ماوم**
**دوای ڕژینی تۆ گێتی هەموو ڕەش بوو لەبەر چاوم**
**سەراپا گوڵخەنی ژیلەو زوخاڵە گیانی سووتاوم**
**هەموو قورگی غەم و ئێش و گرینە ژینی ڕووتاوم**
**دەبا ون بێ لەپاشی تۆ لەڕووی ئەم ژینەدا ناوم**
**لەبەر مەرگی سیاهی تۆ وەها سیس و پەشۆکاوم**

لەم لاواندنەوەیەدا شاعیر شین بۆ کەسێک دەکا بووە بە بەشێک لەرز پەیکەری خۆی وەک دیاردەییێکی مەتریاڵی، هەروەها بووە بەشێک لەگیان و دڵ و دەروونی. بەمردنی ئەو بەشە، بەشەکەی دیکەی کە ماوەتەوە شاعیر خۆیەتی چۆن دەتوانێ بژی! ئەگەر لەش چارەی بکرێ، گیان چۆن دەتوانێ بە لەتکراوی و نیوەچڵی بژی.

لەکۆتاییدا دەنووسێ:

**لەتەک ئەو گۆڕە بمنێژن کەدەورەی بێ درو داڵە**
**کە بەرگی خوڵەکەی بەردی سیاه و قاوەیی و ئاڵە**
**لەسەر کێلی گەرا قویم کە ڕەمزی مردنی تاڵە**
**بنووسن ناوم و ناوی (سەعادە)ی شەنگ و (پیرباڵ)ە**
**لەژین و مەم زیاتر بووین بەڵام ئەو چوو ئەمن ماوم**
**فەلەک تەختت سەرەنگوون بێ بەدەستی تۆ پەشۆکاوم**

شاعیر لەناو تەمومژی ئەشکەوتێکی ئەفسانەیی پڕ لەترس و لە پەیکەری قووپاوەی خۆی دەبینێ. باکی بەوە نییە خۆی چی جۆرە ئازارو ئەشکەنجەییێک دەچێژێ، لەو ئانەدا گیانی لەناو لەشی سەعادەتی خۆشەویستی تواوەتەوە. ئەشکەوتەکە ڕەمزی ئەو گۆڕەیە نازەنینەکەی هەتا هەتایە تێیدا خەوی لێ کەوتووە. ئاواتەخوازی ئەوەیە زوو بگاتە سەعادە، کە ئەوپەڕی بەختیارییە بۆی و لەسەر گۆڕیشی ناوی هەردووکیان بنووسن بۆ ئەوەی هەموو ڕێبوارێک یادی ئەو دڵدارییە بکاتەوە.

**فەرامۆشم نەکەی**

لەلیریکێکی وەسفدا پیرباڵ دیالۆج لەگەڵ دلبەری دەکا:

**بەیانان کاتێ گوڵ پشکووت لەگوڵزاری گوڵەندامان**
**خوداوەندی جوانی هاتە بانیژەی دڵارامان**
**شەرابی پاکی پیرۆزان درەوشاوە لەنێو جامان**
**لەوێدا لەو کەیفگایەی کە تێدا بووین لەگەڵ ڕامان**
**فەرامۆشم نەکەی گیانە ئەمن شایانی باڵاتم**
**هەتا ماوم لەدنیادا تروسکەی ئاڵ و واڵاتم**
**لەهاوینا لەکاتێکا کە خۆر هەڵهات لەپشت کێوان**
**قژی تاڵ تاڵ و زێڕینی ڕژایە سەر بەی و مێوان**
**لەکاتی هەر دڵی مەست بوو بەمیسک و عەنبەری لێوان**
**لەوێدا لەو کەیفگایەی کە بۆ تۆ هۆشمی شێوان**
**فەرامۆشم نەکەی گیانە ئەمن شایانی باڵاتم**
**هەتا ماوم لەدنیادا تروسکەی ئاڵ و واڵاتم**

هۆی لەدایکبوونی ئەم لیریکەی پیرباڵ بەم جۆرە بوو: لەساڵی ١٩٥٦ لەهەولێر لەماڵان شیعری کوردی دەخوێندرایەوە. جارێکیان لەهەڵبژاردەی یەکێ لەدەسنووسە بەنرخەکانی نەجمەدین مەلا بەناوی "سۆزی نیشتمان" (١٩٤٥)، لیریکێکی چوارین بەند بەناوی گۆرانەوە تۆمار کرابوو خوێندرایەوە، بەندی یەکەم و دوایی ئەمانەی لای خوارەوە بوون:

**لەگوڵزار لەسەرچاوەی بەهارا**
**لەچیمەندا لەبن سایەی چنارا**
**لەگوڵشەندا لەگەڵ ناڵەی هەزارا**
**فەرامۆشم نەکەی من گیرۆدەی تۆم**

*******

**لەگەنجیدا لەسەر تافی جوانی**
**کە گەردوون ڕانە گیانە تۆ شوانی**

**لەوەختی لێ ئەدەی لافی جوانی**
**فەرامۆشم نەکەی من گیرۆدەی تۆم**

لەدوای ئەوەی پیربال گوێی لەشیعرەکە گرت، بۆ خۆی نووسییەوە، ئینجا لەپاش چەند ڕۆژێک لەکۆبوونەوەی شیعر خوێندنەوە لیریکەکەی خۆی خوێندەوە. بەئاشکرا دیارە شاعیر ئیلهامی لەشیعرەکەی گۆران وەرگرتووە، بەڵام ماناو وێنەکانی شیعری پیربال جیاوازن لەگەڵ ئەوەی گۆران. نیو سەدە بەر لەئێستا پرس لەسەر ئەم شیعرە هەبوو، ڕاستە نەجمەدین مەلا بەناوی گۆرانەوە تۆماری کردووە، بەڵام ئەم شیعرە لەناو شیعرە بڵاوکراوەکانی گۆراندا نییە، لەنێوەندی ئەدەبی کوردیدا هەندێ کەس بەشیعری ئیبراهیم ئەحمەدی دادەنێن، هەندێکی دیکە بەشیعری ڕەشید نەجیب (فەرامەرز)ی حسێب دەکەن. هەر چۆنێ بێ شیعرێکی جوانە. پیربال لەدانانی شیعرەکەیدا سەرکەوتووە، ئەگەر هەندێ ڕستەو تەعبیری نائاسایی بەداهێنان بۆی بژمێررێ.

### هەڵبەستەکانم

لەشیعرێکی کۆمیدی ئامێزی پڕ لەقسەی سووک لەبابەت شیعری خۆیەوە پیربال دەڵێ:

**شیعرەکانی من قوماشی خۆمن**
**شیعرەکانی وان پینەو پەڕۆکن**
**من خۆمم ئەوان ڕوونووسی خەڵکین**
**ئەمن هەراش و ئەوان زارۆکن**
**من خۆمم ئەوان تاپۆی خودی من**
**من داهێنەرم ئەوان دزۆکن**
**ئەمن گوڵاوی گوڵشەنی کوردم**
**ئەوان وردە بای نێو ڕیخەڵۆکن**

لەسەر شیعرەکەی بەردەوام دەبێ و بەم شێوەیە کۆتایی پێ دێنێ:

**گۆشت بۆ قەسساب و نان بۆ نانەوا**
**من کێردو چەقۆ ئەوان تیرۆکن**

شاعیر ڕیالیزمیانە لەڕووی ناوەڕۆکەوە بیروڕای خۆی دەردەبڕێ بەرامبەر بەو کەسانەی خۆیان بەشاعیر دادەنێن و بەڕاستی شاعیر نین، ئەو بیروڕایانەی بەڕستەی جوان و وێنەی شیعری داهێنراو دەڕازێنێتەوە. شاعیر لێرەدا ستایشی خۆی دەکا، جا ئەوەی دەری دەبڕێ بەرامبەر بەخۆی ڕاست بێ یا ڕاست نەبێ گرنگ نییە، بەڵام لەکۆمەڵدا کەسانی وا هەن لافی شاعیرییەتی لێ دەدەن، کەچی ئەوە نین. ئەگەر ئەم شیعرە لەمانای پلەی شاعیرییەتی پیربال دەربهێنرێ و ببێ بەموتڵەق، وەک شیعرێکی داهێنراوی بەرز دەکەوێتە ڕوو. بێ گومان مەبەسی بنچینەیی لەهەموو داهێنانێکی ئەدەبی و هونەری ئەوەیە لەو قاوغەی بۆی دانراوە بچێتە دەرەوەو ببێ بەموتڵەق.

لەم شیعرەو لەهەندێ شیعری دیکەی پیربالیش وشەو ڕستەی وا دەکەونە بەرچاو لەلێکسیکۆنی زمانی کوردی نەبیستراون لەڕووی دەستووری زمان و مانای وشەکانەوە، خۆی دروستی کردوون و بەرگرییان لێ دەکاو لەسەر ئەو باوەڕەیە ئەوەی ئەو نووسیویەتی ئەویش ڕاستەو دەبێتە هۆی دەوڵەمەندکردنی زمان و ئەدەبی کوردی.

## جەمیل ڕەنجبەر
## ١٩٨٠-١٩٤٨



### ژیانی

جەمیل کوڕی ساڵح گۆران لەساڵی ١٩٤٨ لەهەولێر لەدایک بووە، قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی لەهەولێر تەواو کردووە. لەدوای ئەمە لەخانەی مامۆستایانی سەرەتایی خوێندوویەتی و لەساڵی ١٩٦٧ بڕوانامەی ئەو

ئامۆژگایەی وەرگرتووە و بووە بەمامۆستای قوتابخانەی میرگەسوور، لەپاشان گوێزراوەتەوە قوتابخانەی سەرەتایی هەریر. لەساڵی ١٩٧٤ کە نێوانی شۆڕشی کوردو دەسەڵاتی بەغدا تێک چوو جەمیل وەکو خەڵکێکی زۆر رووی کردە ناو شۆڕش، لەوێ زۆر نەمایەوە لە بەهاری ١٩٧٥ لەدوای نسکۆی شۆڕش یەکێک بوو لەوانەی کە چوونە ئێران و گەڕانەوە وڵات و دەستی کردەوە بەخەباتی نهێنی تا ساڵی ١٩٧٧ لەلایەن دەسەڵاتەوە گیراو لەدادگا فەرمانی بەندکردنی هەتا هەتایەی بۆ دەرچوو. لەدوای ماوەیێک دەسەڵاتی بەغدا لێبووردنێکی گشتی دەرکرد بۆ بەندە سیاسییەکانی مەسەلەی کورد. جەمیل بەر ئەو لێبووردنە کەوت و لەبەندیخانە ئازاد بوو. ئیتر ئەم ماوەیەی بەهەلێکی لەبار زانی و یەکسەر رووی کردەوە ناو شۆڕش و چووە ریزی چەکدارانەوە. لەو کاتەوە جەمیل هەستی بەشاعیرییەتی خۆی کردووە ناوی "رەنجبەر"ی هەڵبژاردووە وەک نازناو بۆ شیعری و ناسینی لەناو خەڵکیدا.

ئەم ماوەیە دوا قۆناغی ژیانی جەمیل بوو، چەک بەشانەوە لەخەباتدا بوو تا پاش نیوەڕۆی رۆژی ١٨ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٠ لەگوندی جەلکانی پشدەرە رەقەی بناری کێوە رەش لەناوچەی سەنگەسەر دوو هەلیکۆپتەری بچووک بەدۆشکە کۆمەڵێک جەنگاوەری کوردیان گوللەباران کرد، لەئەنجامدا هەشت کەس شەهید کران یەکێکیان جەمیل رەنجبەر بوو. تەرمی هێنرایەوە هەولێرو لەگۆڕستانی سەید مەعرووف بەخاک سپێردرا.

**شیعری**

جەمیل ساڵی ١٩٦٦ دەستی بەشیعر وتن کردووە، واتە لەتەمەنی هەژدە ساڵیدا. سەرەتا بەشیعری میللی کێشی سیلابی و جووت قافیە (مەسنەوی) دەستی پێ کردووە. یەکێکە لەو شاعیرانەی نەوەی تازە بەتاقیکردنەوەی شیعری بەحری عەرووزی تێنەپەڕیون و یەکسەر لەسەر دەستووری بزووتنەوەی "شیعری نوێ" رۆیشتوون. بەرهەمی تاقیکردنەوەی جەمیل لەکێشی شیعری خۆماڵیدا بەزۆری لەساڵانی ١٩٦٦-١٩٦٨ بەرچاو دەکەون. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ لەپێشانا ئەم جۆرە شیعرەی وتووە، لەپاشان هاتۆتە سەر ئەو شیعرەی دەچێتە خانەی "شیعری نوێ"وە، واتە ئەو شیعرەی لەقەسیدەیێکدا زیاتر لەکێشێک و زیاتر لەقافیەیێک بەکار دێنێ. شاعیر لەسەرەتای شیعر وتنەوە تا کۆچی دوایی لەدانانی شیعر دوا نەکەوتووە.

شاعیر هەموو کێشە سیلابییە خۆماڵییەکانی لەشیعریدا بەکارهێناوە، بەڵام ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ هەشت برگەیی زۆر بەکار دێنێ. لەشیعرێکدا هەشت برگەیی دەکا بەدوو کەرت، یەکێکیان درێژ ٨ برگە، یەکێکیان کورت ٤ برگە. هەندێ جاری دیکەش لەشیعرێکدا سێ جۆرە دێرە شیعر بەرچاو دەکەون ٤ برگە، ٨ برگە، ١٢ برگە. جگە لەوەی کێشەکانی دیکەی ٧ برگەیی و ١٠ برگەیی لەگەڵ ئەو کێشانەی ناویان هێنرا لەشیعرێکدا هەموویان بەکار دێنێ. قافیەی شیعری جەمیل مەسنەوییە، یا رەنگاو رەنگە. مەسنەوییەکە لەشیعری دە برگەیی بەرچاو دەکەوێ، رەنگاو رەنگەکە لەشیعرە نوێیەکە بەکاری دێنێ کەچەند کێشێکی خۆماڵی بەکارهێناوە لەهۆنینەوەیدا. شیعری جەمیل لەرووی روخسارەوە هەمووی دەچێتە ناو لیریک، ئێستا ئەم جۆرە هونەرە کە لەبنجدا رەنگدانەوەی لیریکی رۆمانتیکی ئەورووپای سەدەی نۆزدەمەوە بووە بەعالەمی. لەگەڵ ئەوەشدا چوارینی روخساری شیعری کلاسیکی کوردی هەیە، بەڵام ئاسۆیێکی میللی کوردی داوەتێ، بەوەی لەسەر کێشی دە برگەیی و جووت قافیە (مەسنەوی) هۆنیویەتییەوە. چەند چوارینێکیشی هەیە لەسەر قافیە کلاسیکییەکە (اا ب ا) رێکی خستووە.

شاعیر ناوەرۆکی بیری کوردایەتی شەستەکان و حەفتاکانی سەدەی بیستەم تێکەڵ بەسۆزی مرۆڤایەتی کردووە، دڵداری جەوهەرێکی گرنگە لەبەرهەمی شیعریدا. لەپێشاندانی نموونەی شیعری هەندێ لایەنی شاعیرییەتی روون دەبێتەوە.

جەمیل رەنجبەر وەکو شاعیرێک هەستی بەوە کردووە شیعری بۆ دێ، ئەوەی خستوویەتییە سەر کاغەز بەدڵی بووە، لەمەدا لەبەشێکی زۆر لەشیعریدا بەهەڵە نەچووە.

بەڵگەی باوەڕ بەخۆکردن، یاتێگەیشتن لەو بەرهەمەی بەوێنەی داهێنانێک دەیداتە خوێنەران لەدوا کۆپلەی قەسیدەی "شیعر بەبووک دەبەن"دا بەدی دەکرێ:

**ئەمرۆ هەندێ وشەم خۆشویست**
**شیعرێکی شۆخم لێ چنی**
**پیتەکانم هەڵگیرساندو**
**ئاواتێکم خستە بنی**

ئەو وشانەی شاعیر خۆشی ویستوون ئەوانەن مانای تازەی تیایاندا دۆزیوەتەوە، ئەگینا ئەگەر بۆ مانای ئەو وشانە لەفەرهەنگدا بگەڕێ مانایێکی دەست دەکەوێ بەکەڵکی شیعر نایە.

ڕیتم لای شاعیر لەنگەری سووکی ئاوازی شیعری میللی (فۆلکلۆری) پاراستووە، چونکە بناغەی وشەو ڕستەو تەعبیر بەپێی دەست لەملانێی دەنگەکان هارمۆنیا بەرێوە دەچێ. کێش ڕەوان و قافیە سوارە، لەشیعری "پێکەنینێک لەباوەشی گریانا" دەڵێ:

**چاوێکی تیژ لەژێر چاویلکەی بەردەستێل**
**بیر بەنینۆک هەڵدەکەنێ**
**بەقاندرمەی قەڵاتی کورد هەڵدەگەڕێ**
**بۆ داهاتووی چاوی خوێنین پێدەکەنێ**
**لەراپۆرتی ئارەق ڕێژێکا نووسرا بوو**
**هەرچی بڵێم تەمی هەوا دەیقۆستەوە**
**تەرازووی شەو بەدوامەوە**
**خۆی دەکێشێ**

قەڵاتی کورد دروشمی "ئازادی کورد"ە. لەبەر ئەوەی کورد ئازادی نەدیوە، دەبێ بەخەیاڵ ئەو قەڵاتە دروست بکا. لەقەڵاتەکەدا چی نهێنییەک هەیە؟ نایزانێ! خۆ دەبێ بیر لەوەش بکرێتەوە کە هیچی تێدا نییە. کەوا بێ ئەگەر بگاتە ناوی پێویستە بەکەلوپەل و ناومالی وەشاوە بیڕازێنێتەوە. لەو ڕۆژگاردا سالی ١٩٧٣ شاعیر لەڕەشبینیدا دەتلایەوە، چونکە ١١ی مارتی ١٩٧٠ خۆی نەکرد بەسالی گەیشتن بۆ سەر "قەڵاتی کورد" بۆیە "چوونە ناو قەڵات" بێ ئەنجام بوو. لەپاش سالێکی دیکە یا دوو سالْ (١٩٧٥) قەڵاتەکە تالان کرایەوە.

ئەگەر سەرێک لەشیعری "مردن لەگۆڕی سەرشۆڕی دەژیت"ی جەمیل ڕەنجبەر بدەین، هەندێ ڕاستیمان دەست دەکەوێ لەبابەت شاعیرەوە. لەم قەسیدەیەدا شاعیر لایەنگری ئەو باوەڕدیە "مردن لەپێناوی ژیان"، واتە کۆمەڵێک خەڵک گیانیان دەبەخشن لەپێناوی ئەوەی کۆمەڵێکی دیکە یا نەوەی داهاتوو سەربەست و بەختیار بژین. ئەمە لەخۆبووردن و قوربانی تێدایە. مرۆڤ جارێک دەمرێ، گەل نەمرە، شاعیر لەگەڵ ئەمەیە. بۆ ئەم مەبەسە تاک پێویستە گیانی ببەخشێ، چونکە سیفەتی مردن و لەناوچوونی تێدایە، لەپێناوی گەل ئەوەی نەمری و هەمیشە زیندوویی تێدایە. ئەمەیە ئەستووری بیروباوەڕی جەمیل ڕەنجبەر ڕێکەوتێکی سەیر بوون ڕۆژگار ئەم تیۆرییەی خستەی پراکتیکەوە لەژیانی شاعیر خۆیدا. لەکاتێکدا ژیانی لەدەست دا کە تفەنگ بەشانییەوە بوو. لەئازادی دەگەڕا بۆ میللەتەکەی. گەلی ژێر دەست بۆ ئازادی دەگەڕێ، گەلی برسیش بۆ نان، دەبێ "تاک" قوربانی بۆ ئازادی و نان بدا.

شاعیر وێڵی ئازادییە، بەشوێنیدا دەگەڕێ. کۆڵ نادا، ئەوەتا لە شیعری "کێ لە سەربەرزی بەتەمەنترە" لە سەرەتاکەیدا دەڵێ:

**گولی خۆزگە**
**چۆن بۆ چڵی داری ژیانی دەگەڕێ**
**یا چۆن سەعات قورمیشی لێ ون بووە**
**ئارەقەی دواکەوتن دەسڕێ**
**گیانە منیش وێڵی چاوتم**
**سەد ئەوەندە لێت دەگەڕێم**

لەکۆتاییشدا دەڵێ:

**ئەرێ گیانە**
**ئیتر نامەم بۆ مەنێرە**
**پوولی پۆستە نامەکانم دەپشکنێ**
**سندووقی سوور**
**گۆڕی مردن بۆ وشەی جوان هەڵدەکەنێ**

**ئیـــتـــر نامــــەم بۆ مــــەنێـــرە**
**بەرێگای كــــۆن بۆم مـــــەنێـــــرە**
**تا دێمــە لات یا تۆ بەخـۆت دێیـتـە ئێـرە**

شاعیر دۆش داماوەو، سەری لێ شێواوە "ئازادی" لێ بووە بەئەفـــــانە! هەمـــوو جـــۆرە بەرنامـــەو پلانێكی بەكارهێناوە بۆ ئەوەی بگاتە ئەو "ئازادی"یە. وەكو بڵـێی رێگاو پلانی دیكە نەماوە بۆ ئەم ئامانجە بەكار بهێنرێ. مـەبەسی شـاعـیـر جـۆرو شـێـوەی دیپلۆمـاسـیـیـەت و پۆلـیـتـیكێكی كـلاسـیـكـیـیـە تا ٢ی ئابی ١٩٧٣- رۆژی دانانی شیعرەكە- بەكار هێنراوە بۆ گەیشتن بە "ئازادی". ئەمەی لەدێری "بەرێگای كۆن بۆم مەنێرە" دەربڕیوە لەپاش ئەوە دیسانەوە شاعیرانە سەری لێ شێواوە، چونكە نازانێ خۆی دەگاتە ئەم ئازادییە! یا ئازادی دێتە لای. رەنگە ئەمە نموونەی دوارۆژبینی بێ لای شاعیر، ئەوەتا ئێستا هەموو بەڵگەیێك ئەوە دەگـەیەنن ئێـمـە بۆمـان نەكـرا بگەینە ئازادی. بەڵام لەوە دڵنیاین پۆلیتیكی ئەنتەرناسیۆنالیزمی دەستەی نەتەوە یەكگرتووەكان دەورێكی باڵای دەبێ لەدوا رۆژدا لەهێنانی ئازادی بۆ خاكی ئێمەش.

شاعیر لەئازادی بەو لاوە شتی دیكە نابینێ، یاخود بەلای ئەوەوە ئازادی لەهەمـوو شـتـێكی دیكە گرنگتـرە. لەشیعری "پیرێكی بەندكراو"دا، مامە پیرە، مامە سوارەیە، بەڵگەی "كـوری ئازا"ی كـوردە. هەر چەندە كـورێ ئازا ناگیرێ، بەند ناكرێ، ئەگەر بەرێكەوت بەدیلیش بگیرێ، زوو كۆت دەشكێنێ و پێوەند دەپچرێنێ و خۆی ئازاد دەكا، ئەویش وێڵی ئازادییـە. لەپشت چیـای قـاف، لەنزیك ئەشكەوتی كـانیـاوی ئاوی ژیانیـشی بێ، دەبێ ئازادی بدۆزێتـەوە. شـاعـیـر ئازادی لەگـوارەی نازەنین و نیگارو شۆڕەكچاندا دەبینێ:

**مــــــامــــــە ســــــوارە**
**منـاڵـەكـــــان چاوەڕێتن لەو بنـارە**
**رۆ رۆیانە! دەگـریەن بۆ جـووتێ گـوارە**
**بۆ دەسگیـرانی دێرینیش كـوانێ گـوارە**
**مـــامــە ســـوارە! كـــوانێ گـــوارە**
**كـــــــوانێ گـــــــوارە**
**بـێـنـە گـــــــــــــوارە**
**جـارێ گـوارە نییـە، بەڵام جـوانان بەبێ**
**گـــــــــــوارەش دەژیـن.**

دوورکـەوتنەوەی قـوتابیـان لەمامـۆستـا كـاردسـاتێكی جەرگبـڕو تەپێنی دەروونە بۆی. یەكێ لەشیـعـرە پڕ لەسۆزو گیانییەكانی جەمیل رەنجبەر "برووسكەیێك لەدڵەوە"یە.

شـاعـیـر مـامـۆسـتـا بوو، زوو زوو دەبوو بەمـیـوانی گـرتووخـانەو بەندیخـانەو ناو ئەو شـاخـانەی نەدەكـەوتنە بەرچاوی نەیاران. لەقـــوتابیـــان دوور دەكــــەوتەوە. دوورکــــەوتنەوە پـچــڕانی رەگ و دەمــــاری ژیانە بۆ ئەو مامۆستایەی قوتابیی خۆی خۆش بوێ و بەبێ ئەو هەڵنەكا.

جەمیل رەنجبەر هەست و نەستی ناسكی دەرژێنێتە سەر تەلی كـەمـانجـە. ئاوازی نەمـر دەخـزێ تا هەمـوو "بوون" دەگرێتـەوە. بەڵێ! شـاعـیـر بەلەش لەشاگردەكانی دوورە، بەڵام بەگیـان لەگەڵیاندا یەكە، بەم جۆرە قسەیان لەگەڵدا دەكا:

**لـەگـــــــــەڵـتـــــــــانم**
**شـاگـردەكـان! دوور نیم لێـتـان**
**نـزیـكـتـــــــــــــــــــانم**
**توخـمـی شـیـلەی گـوڵە گـەنمی**
**فـــــــــەریـكـتـــــــانم**
**لەناو جـانتـای كـتـێـبـتـانا**
**دەرسی شــــیـكـاری شـــەوتـانم**
**نزیكتانم كـاوەی نەورۆزی خـەوتانم**
**لەگـەڵتـانم لەهاتوچۆی قـوتابخـانە**
**دڵـم لـەنـاو دڵـتــــــــانـایـە**
**پەپـولـەی زینـدانی تـەمــــــەن**
**لەناو باغی گـــــوڵتــــانایە**

دەبێ هەستی شاعیر چۆن گۆڕانێكی بەسەردا هاتبێ لەو كاتەی دوایی بەژیانی لاوانی وەكو شەهاب و جەعفەرو ئەنوەری بەرگـوێ كـەوتووە! رەنگە ئەگـەر شـاعـیـرانە بۆی بچین، دەبێ بڵـێین جەمـیل رەنجبـەر لەو كـاتەدا خۆزگـەی خواستووە ئەویش یەكێك بوایە لەوان، چونكە لەگەڵیاندا هاوپیـشـە بوو لەگـۆڕەپانی وشـەو خـەباتی كـوردیدا، بەڵام

لەشیعری "بەیادی تاڤگە سوورەکە" لەسووچێکی دیکەوە دەنوارێتە دیمەنەکە.

ئەم شیعرەی جەمیل ڕەنجبەر لەدوای لەسێدارەدانی قارەمانەکان نەنووسراوەتەوە، بەڵکو لەپاش تێپەڕبوونی ساڵێک واتە یۆبیلی پیرۆزی ساڵێکی شایی و زەماوەندی خوێن. تاقیکردنەوەی هەستی شاعیر ساڵێکی خایاندووە. ماوەی ساڵێکی تەواو لە کەلێنێکی شاردراوەی دڵ و مێشکی شاعیردا وێنەی سێ قارەمانەکە ئاوا نەبووە، تاقیکردنەوەکە شیعرێکی پڕ لەسۆزی داهێناوە، لەدوا کۆپلەیدا دەڵێ:

**ئەی چاوەکان**
**ساڵی ڕۆیی تیشکەکانتان ئاگر دەگرن**
**داڵی خنکان بەتۆوی لاشەتان دەمرن**
**زۆر چاوی تر بۆ بارەگای ئێوە دێن و**
**بڕیاری سەربەرزی دەدەن**
**لە خاکی گڕ تێبەربووا**
**بەرماڵی شۆڕش ڕادەخەن**
**زۆر گیانی تر**
**تەرمەکانتان ماچ دەکەن و**
**دەبنە پردی بەرەو بەیان**
**لافاوی ڕووناکی زۆر چاو**
**میوانی ماڵی هەژارە**
**بۆ خواستنی یەک دەسگیران**

شاعیر داهێنانی لەماناو ناوەڕۆکدا زۆرە، هەروەها لەناونانی شیعری. لەوانەیە ناوی هەموو شیعرێک زوو لەبیر بکرێ، یا پشتگوێ بخرێ، بەڵام هەندێ لەناوی شیعری جەمیل ڕەنجبەر خۆیان دێڕە شیعرن، یاخود پارچە شیعرێکی سەربەخۆن. لێرەدا ئێمە نامانەوێ ناوی شیعری "ئەو کتێبەی وشەی بەخەنجەر نووسراوە" بکەین بە بەڵگە بۆ ئەم مەبەسە، بەڵکو ناوەڕۆکی شیعرەکە خۆی گرنگە بەلامانەوە، لەسەرەتای شیعرەکەدا کە دەڵێ:

**ڕیزە چیاکان**
**وەکو تەونی بەرەبەیان ڕاچەندرا بوون**
**بەرۆی ڕووناکی چاوی خۆر**
**وەکو ڕیسی مافووری دەستی قەیرە کچ**
**بەگوڵاڵەی باڵا لاوی رایەڵ کرابوو**

مەبەستی دروستکردنی ئەبستراکتێکە (تجرید) خاک لەناو سروشتدا لەقاڵب دەدا. ئەو خاکە بووە بەمایەی ئازارو ئەندێشە، بەڵام ناشیرین نەبووە، لەبەر ئەوە هەر جوانەو خۆشەویستە. لەپاش گەشتێک لەگێتیی وردەکاری وشەو ڕستەو تەعبیرو مانا، ناشرینی لەخاک دوور دەخاتەوە، جوانی دەکا بەئەدگاری هەمیشەیی ژیان، کە دەڵێ:

**هاتم هاتم**
**ناویان لێنام بزمار کوتە**
**چەکوشێ بووم**
**ئەو دارتاشەی ئەسکەملی ئەنجومەنی**
**کۆشکی سپی دروست دەکرد**
**ئاسنگەرێ کە**
**شیشبەندی**
**بەندیخانەی خوێنی باستیلی خەست دەکرد**
**هێزی منی پێ نەکرا**
**کەوی کێوی باوەڕی پێ هەڵنەفڕا**

لێرەدا شاعیر ئاماژەی زیرەکانەی هەیە، کە دەڵێ کوردستان لەئازادی دەگەڕێ، لەبەر ئەوە خراوەتە ناو بەندیخانەوە. ئینجا باستیلی پاریسی کردووە بەڕەمزی ئەو بەندیخانەیە، کۆشکی سپیی ئەمەریکاش دەوری ئەمپریالیستی گرنگی هەبوو لەشێواندنی کێشەی کورد لە شەستەکان و حەفتاکانی سەدەی بیستەمدا. بەراوردی جوانی شاعیرانەی جەمیل ڕەنجبەر لەوەدایە، ئەو دارتاشەی کورسی و مێزی کۆشکی سپیی دروست کردووە، لەگەڵ ئەو ئاسنگەرەی شیشی بەندیخانەی باستیلی بەستووە، واتە دوژمنانی کورد، ئەمانە ناتوانن بەسەر هێزی ڕزگاری کورددا زاڵ بن.



# هەگبەی دەنگوباس*

**شیعری: عەبدوڵڵا پەشێو**

هاوڕێم! هاتی و بە هاتنت
تۆ بارانی گزیژەت هێنا
بۆ هەڵگەڕانی بەرەو خــۆر پەیژەت
هێنا
مژدەنامەی زستانی زگپڕت هێنا
دەنگی مـەزدە و یاخیـبـوون و گـڕت
هێنا
هاوڕێم!
ناوی خانزادت بردبوو*
با پێت بڵێم:
پرچی خانزاد خۆڵەمێشە،
چاوی رەشی پلیشاوەی ژێر پۆستاڵە،
چەپکە نێرگزی سەر گۆڕی-
سپیلکەی چاوی منداڵە!
***

هاوڕێم!
کە چوویتەوە سلێمانی*
لە ڕێگاتا لەبیر نەکەی:
لە قەڵات و منارەوە،
لە موغەکانی شارەوە،
چەپکە هەواڵێک بەرەوە
بۆ خوا، بۆ بیرەکانی نەوت،
بۆ مەزاری بابە گوڕ گوڕ،
بۆ ئەو شارەی
دانیشتوانی
لەناو گڕدا دەگرین بۆ گڕ

لەبیر نەکەی:
دەنگوباسی شارەکەی من:
شاری مزگەوت و دەرۆزە،
شاری تینوو
بۆ ماچی جەژنە پیرۆزە،
لەبیر نەکەی:
دەنـگـوبـاسـی ئـەو مـنـاڵـەی... بـۆ
لەتێک نان،
تا ئێوارە...
بەردەبێـتـــە گــیـــانی مـــردووی
شەقامەکان.
لەبیر نەکەی:
دەنگوباسی
حەمە، چورچە، جومعە، کسۆ*
یەک بە یەک شێتەکانی شار...
دەنگوباسی مەیدانی کار،
چایخانەی پڕ،
هەمووی بەرە
بۆ خوا، بۆ بیرەکانی نەوت،
بۆ مەزاری بابەگوڕ گوڕ!

١٩٧١/٣/١٥- کوردستان

* کەژاوەی گریان: دیوانێکی شێرکۆ بێکەسە
* هەگـبـــەی دەنگوباس: وەڵامی هۆنراوەی (دیدەنی)ی، شێـرکـۆ بێکەسـە، کـە لـە گۆڤـاری هەولێـر (شـوباتی ١٩٧١) پێـشـکـەشی شاعیری کردبوو.
* خانزاد: مەبەست خانزادی سۆرانە.
* لەو سـەردەمـەدا هاتوچۆی نێـوان هەولێـر و سلێـمـانی بە شـاری کەرکووکدا بوو.
* حـەمـە، چورچە، جومعـە، کسـۆ: چوار شێتی هەولێر بوون.

سەرچاوە:
دیوانی" پشت لە نەواو روو لە کرێوە"ی عبدوڵلا پەشێو.

# هەولێر

شیعری: پیرباڵ مەحمود

هەولێر تا دەمرم نەغمەخوانی تۆم
پەرۆشی باغ و باغەوانی تۆم
تا لە ژین ماوم وێژەوانی تۆم
بە شەو و بەرۆژ پاسەوانی تۆم
زەنگ و ئاوازی نێو قەوانی تۆم
***
چاوم هەڵهێنا دیمەنی تۆم دی
دەشتی رەنگین و چیمەنی تۆم دی
گوڵە گەنم و جۆی دەگمەنی تۆم دی
بە شەو و بە رۆژ پاسەوانی تۆم
بەرگی لاو و نەوجەوانی تۆم
***
بەهاران کاتێ گوڵی رەنگاو رەنگ
دەڵەرێتەوە لەسەر چڵی شەنگ
دەرت پڕ دەبێ لە بەزم و ئاهەنگ
بە شەو و بە رۆژ پاسەوانی تۆم
شالووری شەیداو غەزەلخوانی تۆم
***
کۆنترین شاری لەسەر رووی زەوی
خەنی بوون خەنی کە زانیم هەوی
زێڕو زەبەری، نەک زیخ و چەوی
بە شەو و بە رۆژ پاسەوانی تۆم
تۆ رەزو ئەمن رەزەوانی تۆم
***
شوێنەوارێکی مێژووت دیارە
هێمای گرنگیت بەبێ ژمارە
هالێرە (قەڵا) لەوێ (منارە)
بە شەو و بە رۆژ پاسەوانی تۆم
پەروەردەی دادو دادوەرانی تۆم
***
پێڵووم کردەوە جێی ژیانم بووی
لانک و لەلووگی لەش و گیانم بووی
دایکی بەسۆزو بێ زیانم بووی
بە شەو و بە رۆژ پاسەوانی تۆم
لە تیرەی گوردو پاڵەوانی تۆم
***
گەشتیاران پۆل پۆل دێنە دیدارت
دەحەسێنەوە لە سایەدارت
لەسەر ترۆپکی زەوی گوڵدارت
بە شەو و بە رۆژ پاسەوانی تۆم
ئاشقی لالەو ئەرخەوانی تۆم
***
بەیانیان کاتێ بولبول دەخوێنێ
کاتێ شنەی با دڵ دەبزوێنێ
شۆخیت نیگاری خۆی دەنوێنێ
بە شەو و بە رۆژ پاسەوانی تۆم
تۆ بەهەشت و من دەرگەوانی تۆم
***
منم شایەستەی هەڵگری ئالات
هەڵگری رازو نازو سکالات
بێت و بپرسی لە ئاڵ و والات
پێت دەڵێ: کە من پاسەوانی تۆم
تۆ خاوەنی من، من شوانی تۆم
***
کە مردم گڵکۆم لەسەر خاکتە
سەرینم خۆڵی نەرم و پاکتە
کێلی بان سەرم بەردی چاکتە
وەک چۆن ئێستاکە پاسەوانی تۆم
ئاواش لە گۆڕا هەر میوانی تۆم
***
(هەولێر) بە دووریت دڵم زووخاڵە
هەبوونم هیچەو مانم مەحاڵە
کەڵە شاعیرت کاکە (پیرباڵ)ە
دەڵێ: تا ماوم پاسەوانی تۆم
لە دەریای شیعرا مەلەوانی تۆم
***

# ڕەشید ئاغای حەوێزی (موجریم) ١٨٤٥-١٩٠٨

ئامادەکردنی: کەریم شارەزا

"موجریم" نازناوی شاعیری کورد ڕەشید ئاغای کوڕی حاجی بەکرئاغای حەویزییە. لەساڵی ١٨٤٥دا لەشاری کۆیە هاتۆتە دنیاوە، خوێندنی مەلایەتی لەمزگەوتی مەلا ئەسعەد لەلای زانای گەورە، حاجی مەلا ئەسعەدی جەلیزادە خوێندووە و هاونشینی شاعیرە ناودارەکانی ئەوسای کۆیە، وەک حاجی قادری کۆیی و ئەختەری براگەورەی و حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی و کەیفی جوانڕۆیی بووە. سەردەمێک بەنازناوی (فەهمی) و لە دواییشدا بەنازناوی (موجریم) شیعری داناوە. باب برای ئەمین ئاغای (ئەختەر) بووە و لەهەموو کۆڕو کۆبوونەوەیەکی ئەدەبی دیوەخانی (ئەختەر) ئامادە بووە. لەکۆڕی ڕابواردنی شەوانی هەینی و سێ شەموانی مەدرەسەکەی حاجی مەلا ئەسعەد بەشداری کردووە. دۆستی هەرە نزیکی کەیفی جوانڕۆیی بووە. کاتێک کەیفی لەسەر شەڕەکەی لەگەڵ شێخ ڕەزا، لەکۆیە دەڕوات و ماوەیەک لەهەولێر جێگیر دەبێ، ڕەشید ئاغا نامەیەکی ناسکی شیعریی بۆ دەنووسێ و داوای لێدەکات بگەڕێتەوە کۆیە تا وەکو جاران بەخۆشی لەگەڵ یەکتر ڕابوێرن. (کەیفی) بەنامەیەکی شیعریی وەڵامی دەداتەوەو لەدێرە شیعرێکیدا هۆی نەگەڕانەوەی بۆ کۆیە دەباتەوە بۆ شەڕەکەی ساڵی پاری لەگەڵ شێخ ڕەزا و دەڵێ:

**(فی الجملە) کە نووسیوتە لەبۆ نایەوە کۆیە**
**چۆن بێمەوە ئیستەش کە لەسەرمایە شەڕی پار؟!**

موجریم لەشیعری لاواندنەوەی خۆشەویستانی بەبۆنەی مردنیان، شاعیرێکی بەتوانا بووە. هەروەک بە بۆنەی کۆچی دوایی ئەمین ئاغای کاکی هۆنراوەیەکی بەرزی داناوە و دەیەوێ بەشنەی نەسیم هەواڵی مەرگی (ئەختەر) بنێری بۆ حاجی قادری کۆیی لەئەستەمبووڵ، بابزانین چی داڕشتووە؟

**فیدات بم ئەی نەسیم هەڵبستە ئێستا**
**هەتا قوستەنتەنیە ڕامەوەستە!!**

**هەتا کن حاجی قادر بێ تەوەققوف**
**بڕۆ ئەمما چلۆن وەک بەرقی یەلدا**

**بڵێ: قوربان حەوادیساتی کۆیە**
**بەیان نابێ بەتەحریرو بەئینشا**

**شەوی پێنج شەممە وەقتی بانگی عیشا**
**لەهەر چوار کۆیی (کۆ) هاوار هەڵسا**

**سوئالم کرد لەیارێکی وەهای گوت:**
**ئەمین ئاغایە قەسری عومری ڕووخا**

ڕەشید ئاغا کەسایەتییەکی ناوداری بنەماڵەی گەورەو گرانی حەویزییان بوو لەکۆیە. لەدوای کۆچی دوایی حاجی ئەسعەد ئاغای کاکی لەساڵی ١٨٩٥دا دەبێتە سەرۆکی بنەماڵەی حەوێزیان تاکو ساڵی کۆچی دوایی کردنی لە ١٩٠٨دا، لە دوای ئەو، جەمیل ئاغای برازای لەگەڕەکی هەوار، لەدیوەخانی حاجی ئەسعەدئاغای دادەنیشێ و دەبێتە سەرداروعەولاغای حاجی تایەر ئاغاش لەگەڕەکی بەفریقەندی، دەبێتە سەردارێکی دیکە و کەلێنی نەمانی ڕەشید ئاغا پڕ دەکەنەوە.

# محەمەد کەریم شەریف
# ١٩٤٦-٢٠٠٢

**کەریم شارەزا**

نووسەری خامە ڕەنگین و فۆلکلۆر پەروەری کورد، مامۆستا شێخ محەمەدی کوڕی حاجی کەریمی کوڕی شەریفی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی حاجی عەزیزی شێخ بزێنی ناسراو بە (محەمەد کەریم شەریف). لەساڵی ١٩٤٦دا لە گوندی (گاینج)ی سەر بەناحیەی ئەوسای (خەبات) لەپاریزگای هەولێر لەدایک بووە و لەناو ئاوو هەوای دەشت پەروەردە بووە.

هەر منداڵ دەبێ ماڵەکەیان لەساڵی ١٩٥٤دا دێتە شاری هەولێر و لەگەڕەکی (تەیراوە) نیشتەجێ دەبن و وردە وردە لەگەڵ داب و نەریتی شارستانی ڕادێن.

ئەم زاتە لە ساڵی ١٩٥٦دا دەچێتە بەر خوێندنی قوتابخانەی سەرەتایی و لە ساڵی ١٩٦٣دا ئەو قۆناغە بەرایەی خوێندنەکەی دەبڕێ و دەچێتە قوتابخانەی ناوەندیی هەولێرو لە ساڵی ١٩٦٦دا لە تاقیکردنەوەی گشتی بەپلەیەکی بەرز دەردەچێ و هەر لەو ساڵەدا لەخانەی مامۆستایانی سەرەتایی لە هەولێر وەردەگیرێ و لە ساڵی ١٩٦٩دا کۆتایی بەخوێندنەکەی دێنێ و لە ساڵی ١٩٧١دا لەگوندی (بیشە)ی بناری چیای حەسەن بەگ لە دەڤەری سۆران بەمامۆستا دادەمەزرێ و نەوەی نوێی کورد پێدەگەیەنێ و لە هەمان کاتیشدا دەست دەکات بەکۆکردنەوەی بابەتی فۆلکلۆری و تۆمارکردنیان و دوای ماوەیەک دەگوێزرێتەوە بۆ قوتابخانەی گوندەکانی (کانی قرژاڵە) و (قەلانچۆغان) و (شیوە ڕەش) لە ناحیەی خەبات و لەدوا قۆناغی مامۆستاییی دەگوێزرێتەوە بۆ قوتابخانەی (مەشخەڵی سەرەتایی کوڕان) لە شاری هەولێرو بەجوانی خزمەتی پرۆسەی خوێندنی کوردی دەکات.

مامۆستا محەمەد کەریم شەریف، کورد پەروەرێکی خاوەن هەڵوێست بوو، تادوا هەناسەی ژیانی لەرێبازی کوردایەتی لای نەدا. کاتێک کە پیاوانی ڕژێمی بەعسی فاشی خەریکی لەخشتە بردنی بوون، تا بیکەن بە (جەیش شەعبی) فرمانەکەی خۆی وەلاناو لە ساڵی ١٩٨٨دا خۆی خانەنشین کرد، تاکو لەبەڵای ئەو ڕژێمە دوور کەوێتەوە و بکەوێتە سەر تۆمارکردنی پرۆژەکانی نووسینی لە بواری خزمەتکردنی فۆلکلۆری ڕەسەنی کوردییەوە.

مامۆستای خوالێخۆشبوو، نووسەرێکی بەتوانا بوو، جگە لەزمانی کوردی زمانەکانی عەرەبی و تورکمانیشی دەزانی. لەدوای دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کورد لە ١٠/٢/١٩٧٠دا بووە ئەندامێکی چالاک لەو ڕێکخراوە ئەدەبییەی کوردو لە هەموو کۆنگرەو سیمینارو کۆنفرانسێکی بەشداری دەکرد.

ئەم زاتە جگەرسۆزە جگە لە گرنگیدانی بەکۆکردنەوەی دەقەکانی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی و تۆمارکردنیان. لەبواری نووسین و هۆنینەوەی شیعریش بەتواناو بەهرەدار بووە و لەماوەی ئەو ٥٦ ساڵەی تەمەنی کە لەرۆژی ٢٠٠٢/٦/٩دا بەبێ دەنگی ماڵئاوایی لێ کردین، توانی چوار کتێبی بەنرخ لەبواری فۆلکلۆری کوردی بەچاپ بگەیەنێ و لەپاش مەرگی ناوادەیشی کتێبێکی دیکەی بۆ چاپ کراوە کەئەمانەی خوارەوەن:

١- فۆلکلۆری یارییەکانی کوردەواری- لەساڵی ١٩٧١دا لەچاپخانەی شیمال لەکەرکوک چاپ کراوەو دەکەوێتە ٢٠٠ لاپەرەی قەبارە مام ناوەندی.

٢- فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواری- لە ١٩٧٤دا لەکەرکووک چاپ کراوەو ٢٦٨ لاپەڕەیە.

٣- سوارچاکی لەلاوکی کوردەواری دا- لە ١٩٧٨دا لەبەغدا چاپ کراوەو ١٩٢ لاپەڕەیە.

٤- هەقایەتی کوردەواری- لە ١٩٨٥دا لەبەغدا چاپ کراوەو ١٦٠ لاپەڕەیە.

٥- مەسەلەکانی کوردەواری- ئەمەیان لەدوای کۆچی دوایی بەهەوڵ و کۆشش و پێشەکی دوکتۆر عەبدوڵڵا خدر مەولوود لەساڵی ٢٠٠٥دا لەهەولێر چاپ کراوە و ٢٤٠ لاپەڕەیە.

# نەزهەت
# ١٨٥٠-١٩١٥

کەریم شارەزا

"نەزهەت"، نازناوی شیعریی شاعیری کلاسیکی کوردی ناوچەی رەواندز حاجی سولەیمان بەگی کوڕی مەجید بەگی کوڕی رەسووڵ پاشای برای میر محەمەد پاشای رەواندزییەو بەحاجی سولەیمان بەگی ژووژیلە ناسراوە، چونکە ماوەیەک لەگوندی ژووژیلەی ناوچەی برادۆست ژیاوە، کە موڵکی خۆی بووە.

ئەو زاتە لە دەوروبەری ساڵی ١٨٥٠دا لە گوندی (باپشتیان)ی نزیک رەواندزی لەدایک بووەو بەمنداڵی لەحوجرەکانی ئەو شارە دەستی بەخوێندنی ئایینی کردووە. لەدواییدا زۆر شوێن گەڕاوە بەدوای مەلای چاک، تاکو دەرسی لەلا بخوێنێ. لەئەنجامدا گەییوەتە پایەیەکی باش لەخوێندنی مەلایەتی و زانست فێربوون، ئینجا بۆ تەواوکردنی خوێندنی بەرزتری چووەتە شاری (ئەستەمبووڵ)ی پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی و ماوەیەک لەئامۆژگایەکی ئەو شارەی خوێندووە، جگە لەزمانی کوردی، کە زمانی زگماکی خۆی بووە، فێری زمانەکانی تورکی و عەرەبی و فارسی و کەمێک فەرەنسی بووە. کە خوێندنەکەی تەواوکردووە عوسمانییەکان هەندێ فەرمانی میرییان پێ سپاردووە. بەڵام لەسەرچاوەی مێژووی بنەماڵەکەیاندا هاتووە، کە هیچ کارو فەرمانێکی میریی قەبووڵ نەکردووە، وەک موڵکدارێک بە بەروبوومی موڵکەکانی خۆی بەڕێوە چووەو لەشاری رەواندز نیشتەجێ بووە.

خەڵکی رەواندز رێزێکی زۆریان لەو زاتە ناوە، چونکە لەنەوەکانی میرانی سۆران بووە، ئەمە بووەتە مایەی تێکچوونی لەگەڵ سەعید بەگی عەبدوڵڵا پاشای سەرۆکی ئەوسای شاری رەواندز، کە ئەویش لەبنەماڵەی میرانی سۆران بووەو پیاوێکی توندە تەبیات و تووڕەو تەنگاو بووە. هەردەم بەچاوێکی سووک سەیری غەیری خۆی کردووەو لەوەش دەترسا نەزهەت بەهۆشیاری و زمان زانی خۆی دەستی لێ بستێنێ و لەگەورەییەکەی کەم بکاتەوە. بۆیە لەئەنجامی ئەو ناکۆکییەی لەگەڵ سەعید بەگ، نەزهەت وای بەپەسەند زانی شارەکە بەجێ بێڵێ و رووبکاتە ناوچەی نەهری لە باکووری کوردستان. بۆ لای شێخ محەمەد سدیقی نەهری، کە ئەو سەردەمە شێخەکانی نەهری خاوەن دەستەڵات بوون و فەرمانڕەوای دەڤەرەکە بوون، نەزهەت لەلای ئەو زاتە حوکمڕانە نەزهەت کراوەتە بەڕێوەبەری دارایی.

لەپاش کۆچی دوایی شێخ محەمەد سدیق، لەگەڵ سەید تەهای نەهری کوڕیدا ماوەتەوە تادەست پێکردنەوەی بەربەرەکانێی کوردەکانی باکووری کوردستان لەدژی زوڵم و زۆرداری عوسمانییەکان، ئینجا نەزهەت لەگەڵ سەید تەهای نەهری رووداکەنە رۆژهەڵاتی کوردستان و لەشاری ورمێ جێگیر دەبن تاکو هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی و هاتنی سوپای رووسیای قەیسەری بەرەو رۆژهەڵاتی کوردستان و رۆژئاوای ئێران و داگیرکردنی شاری ورمێ. زۆربەی خەڵکی ناوچەکە لەدژی ئەو داگیرکارییە بوون و بەرگرییان لەوڵاتەکەیان کردووە، لەئەنجامدا ئەو داگیرکەرانە خەڵکێکی زۆریان گرت، یەک لەوانە نەزهەت بوو. دوای ماوەیەک بێ دادگایی کردن

عەلی حەریرییەوە بەفیرۆ نەدەم و پێشکێشی خوێنەرانی بکەم، لەوانەیە سوودێکی ببێ. واش دەزانم کەوا ئەم شاعیرە لە هەموو شاعیرانی کۆنی کوردی زیاتر پێویستی بە لێکۆڵینەوەی ورد و بیندرێژ هەیە.

راستت دەوێ، کێشەی عەلی حەریری کێشەیەکی گەورەیە، جگە لە کەمیی زانیاری لەبارەی ژیانی خۆیەوە، تا ئێستە ژمارەیەکی کەمیش لە بەرهەمەکانی گەیشتوونەتە دەستمان و بەشی لێکۆڵینەوەی تێروتەژی ناکەن. دەبێ لەم هەلەدا دەسخۆشی لە بەرێزان عەبدورەقیب یوسف و محەمەد عەلی قەرەداغی بکرێ، کە هەر یەکە و چەند شیعرێکی ئەم پیاوەیان دۆزیوەتەوە، بەمەش سەرەداوێکیان داوەتە دەستی لێکۆڵەوان بۆ گەیشتن بە هەندێک راستی لەبارەی هزر و ژیان و سەردەمی ژیانییەوە.

لەبارەی کەمیی بەرهەمی عەلی حەریرییەوە، زەینی مرۆڤی ئاسایی بۆ تاکە هۆیەک دەروات، ئەویش دووریی ئەو سەردەمەیە کە تێیدا ژیاوە، سەدەی پازدەیەم و شازدەیەم، یان وەک هەندێ کەس دەیڵێن بەولاوەتریش واتە سەدەی یازدەیەم. راستە، لەبەرئەوەی چەندی دوورتر بەرەودوا بگەرێینەوە، بەڵگە و شوێنەوار و دەستهاوێژ کەمتر دەبنەوە، مێژوو تاریک و لێڵتر خۆی دەنوێنێ و رێچکۆڵەکان زیاتر ون دەبن. بەڵام من هۆیەکی تریشم لە زەیندایە، کە یاریدەر بووە بۆ زوو فەوتانی شیعری عەلی حەریری، ئەویش ئەوەیە ئەم پیاوە لە ناوچەیەکدا شیعری بەزاراوەی کرمانجیی سەروو نووسیوە، کە زۆربەی خەڵکەکەی بە کرمانجیی خواروو دەدوێن. ئەمەش دەرفەتی نووسینەوە و پاراستنی بەرهەمی ئەوی لە لای خوێندەوارانی سەردەمەکەیدا، هەروەها دوای ئەو سەردەمە کەمتر کردووەتەوە. بەرهەمێک، کە زۆربەی خەڵک باش لێی حاڵی نەبن و چێژی لێ نەبینن ناشینووسنەوە. ئەمە بۆ زۆربە، هەڵبەت تاک و تەرای بەدەریش لەم بڕیارە هەبووە، کە شارەزای دیالەکتە کوردییە جیاوازەکان بووە و چێژی لە ئەدەبیاتی هەموو کوردی وەرگرتووە. ئێستە لە سەردەمی پەرەسەندنی تێکەڵاویشدا ئەم راستییە هەر وەک خۆی بەردەوامە. بەپوختی، هەڵکەوتنی شارۆکەی هەریر لە سەر سنووری لە یەک جیاکەرەوەی هەردوو دیالەکتی کرمانجیی سەروو و خوارووودا، عەلی حەریری کردووە بە عەلی قوربانی.

جگە لەمە تا ئێستە دەقی شیعرەکانی حەریریمان بەشێوەی راست و دروستی خۆیان بەدەست نەگەیشتووە، ئەگەر مرۆڤ لەو چەند دەقە کەمەی بەردەست ورد ببێتەوە بۆی دەردەکەوێ، زۆربەیان جێ پەنجەی نووسەرەوەی دەقەکانیان بەسەرەوە دیارە، کە سەر بەزاراوەی کرمانجیی خواروو (سۆرانی) بوونە. هەر ئەم جێ پەنجەیەشە وای کردووە هەندێک کەس باوەڕی ئەوەیان لەلا پەیدا ببێ، کە عەلی حەریری لە بنەڕەتەوە شوێنەواری دیالەکتیی کرمانجیی خواروو بەسەر زمانی شیعرەکانیەوە هەبووە، بەڵام پێچەوانەی ئەم دۆخەش هەیە، دەقی وا بڵاو کراونەتەوە شوێنەواری شێوەزاری بادینانی بەسەریانەوە دەبینرێ. وەک گوتم ئەمەش هەر کاری نووسەرەوەیە. بەسەرنجدانی خۆم بۆم دەرکەوتووە، عەلی حەریری بەزاراوەیەک شیعری نووسیوە، کە بڕبڕەی پشتی کرمانجی سەروو بووە و لە شیعرەکانیشیدا ئەمە تەواو روونە، هەروەها هەندێک شوێنەواری ئاخاوتنی کرمانجیی خوارووش بەسەر شیعرەکانەوە دەبینرێ، کە وابزانم ئەمانە لە بنەڕەتەوە هەبوونە و رەنگە دەسکاری شاعیر خۆی بن. پاشان بەڵگەی ئەمانە دەخەینە روو.

بارێکی سەرنجراکێشی تر هەیە کە رۆڵی هەبووە لە نەپارێزرانی بەرهەمی عەلی حەریریدا، ئەویش ئەوەیە تا ئێستە هیچ بەرهەمێکی ئەم پیاوە لە رێگەی کوردستانی باکوورەوە نەگەیشتووەتە دەستمان، تەنانەت ئەو رۆژهەڵاتناسانەی بەرهەمی مەلای جزیری و فەقێ تەیران و ئەحمەدی خانییان لەناو کوردەکانی باکووردا بەرهەڤ کردووە، هیچی راستەقینەیان لە بەرهەمی عەلی حەریری دەست نەکەوتووە، مەگەر بەهەڵە بڕێک شیعریان دابێتە پاڵی، یان هەندێک زانیاریی چەوتیان لەبارەی شوێنی ژیانییەوە تۆمار کردبێ. ئەم حاڵەتە وای کردووە هەندێک کەس بگەنە ئەو بەرئەنجامەی کەوا دەبێ عەلی حەریری لە ناوچەکانی کوردستانی باکووردا کەم ناسرا بێ، بۆیەش لە ئەنجامدا دەرفەتی ئەوە بۆ شیعرەکانی نەبووە لەناو خوێندەوارانی باکووردا ئەم دەست ئەو دەست بکەن و هەڵبگیرێن. بەپێی ئەو باوەڕە، ئەو قووڵاییە جوگرافییە لە

سەردەمانی پێشوودا پێویست بووە بۆ جەماوەربەتیی عەلی حەریری و پاراستنی بەرهەمەکانی.

بەڵام پێچەوانەی ئەم بۆچوونەش هەیە، ئەحمەدی خانی لە سەدەی حەڤدەیەمدا (١٦٥٠-١٧٠٦) و لە شاری بایەزیدی دەڤەری هەکارییەوە، عەلی حەریریی بە کەڵەشاعیری پێش خۆی ناساندووە و لە نێوان مەلای جزیری و فەقێ تەیراندا ریزی کردووە:

**بیناڤە رحا مەلێ جزیری**
**پێ حەی بکرا عەلی حەریری**
**کەیفەک وە بدا فەقیهێ تەیران**
**حەتا بئەبەد بمایە حەیران**

هەر کامی راست بێ، چ ئەوەی عەلی حەریری لەناو کوردی باکووردا بەناوبانگ بووبێ یان نا، تێپەڕینی سەردەمانی درێژ و ناجێگیریی کۆمەڵایەتی لە کوردستاندا، رۆڵی مەزنیان لە کوێربوونەوەی شوێنەوار و نەمانی زانیاری لەبارەی بەرهەم و ژین و ژینگەی ئەو شاعیرەدا گێڕاوە. تەنانەت ئەحمەدی خانی خۆیشی، مەم و زین و نووبارەکەی لێ دەرکەی، ژمارەیەکی کەم لە شیعرەکانی گەیشتوونەتە ئەمڕۆ. لەم رووەوە حاڵی خانی لە حاڵی حەریری زۆر خۆشتر نییە. بەگشتی دەتوانین بڵێین پارێزرانی ئەدەبیاتی کۆنی کوردی، بەشی زۆری دەگەڕێتەوە بۆ رێکەوت و هەلی دەگمەن، نەک لێهاتوویی کۆمەڵی کوردەواری.

لەناو کورددا، حاجی قادری کۆیی دووەمین کەسە دوای ئەحمەدی خانی، ناوی عەلی حەریری هێناوە. حاجی بەکورتی و بەپوختی گوتوویەتی کەوا عەلی حەریری خەڵکی کوێیە! دەبوایە ئەم بەڵگەیەش لە زووەوە بەس بێ بۆ بڕینەوەی مشتومڕ لە بارەی نشینگە و زێدی عەلی حەریرییەوە:

**دوو عەلێن شاعیرن وەکو حەسان**
**بەردەشان و حەریرە مەسکەنیان**

ئەو بۆچوونەی بەدوای شوێنێکی تر بەناوی حەریر لە باکووری کوردستاندا دەگەڕێ و نایدۆزێتەوە، لەوەوە سەرچاوە دەگرێ، کە شیعرەکانی عەلی حەریری بەزاراوەیەک نووسراون، زۆر دوورە لە زمانی ئاخاوتنی ئەمڕۆی ناوچەی حەریر. لە خوێندنەوەی ئەو چەند دەقە کەمەی هەمانە، وەک گوتمان ئەوە زۆر ئاشکرا و خوویایە کە عەلی حەریری بەزاراوەی کرمانجیی سەرووی ناوچەکانی باکووری کوردستان شیعری نووسیوە، نەک شێوەی ئاخاوتنی ناوچەی بادینانی کوردستانی باشوور. ئەم راستییەش پرسیارێکی لەلای زۆر کەس ورووژاندووە دەڵێ: ئاخۆ عەلی حەریری خۆی یان بنەماڵەکەی بە بنەڕەت خەڵکی سەروو بوونە و کۆچیان کردووە بۆ ئەم شوێنە یاخۆ خۆی سەر بە زاراوەی کرمانجیی خواروە (سۆرانی) و ئەو کاتە و لەو شوێنەدا، زمانی ئەدەب زاراوەی کرمانجیی سەرووی شێوەی بۆتانی بووە و عەلیش شیعری خۆی بەم شێوەزارە نووسیوە، بۆ ئەمەش مەولەویی تاوەگۆزی بەبەڵگە دەهێننەوە، کە ناوچەکەی وەک ئاخاوتن سەر بەزاراوەی کرمانجیی خواروو بووە، بەڵام خۆی بەزاراوەی گۆرانی شیعری نووسیوە لەبەرئەوەی زاراوەی گۆرانی لە سەردەمی مەولەویدا زمانی ئەدەب بووە. هەندێک کەس بۆ ئەوەش رۆیشتوون ئاخۆ دەبێ خەڵکی حەریر لەو سەردەمانەدا بەشێوەی کرمانجیی سەروو نەدوابن! ئەگەر هەمووشیان نەبێ هەندێکیان! ئەم بۆچوونانە هەموویان رێیان تێ دەچێ و شایەنی لەسەر وەستانن، بەڵام دەبێ کامیان نێزیکتر بێ لە راستییەوە! ئەمەیان دوایی دێینەوە سەری.

با بگەڕێینەوە لای حاجی قادر، هەر لەو قەسیدەیەدا کە بە (شاسواری بەلاغەتی کوردان) دەست پێ دەکا، بەر لەوەی بگاتە باسی عەلی حەریری و عەلی بەردەشانی، لە شوێنێکی تریشدا سووکە ئاماژەیەک بەعەلی حەریری دەکات، ئەویش لە بواری ناوهێنانی مەلای جزیریدا:

**لە جزیرە یەکێکە شێخ ئەحمەد**
**ساحێبی ناو و مورشیدی ئەرشەد**
**ئەوی جامی گوتوویەتی ئەمەیە**
**"پیر مردی بدیدە ام ز جزیر**
**نیک مردی بدیدە ام ز حریر"**

واتەی بەیتە فارسییەکە ئەمەیە: پیرەمێردێکم بینی لە جزیر، پیاو باشێکم بینی لە حەریر.

هەڵبەتە حاجی قادر لەم شیعرەدا بۆ نیشاندانی گەورەیی شێخ ئەحمەدی جزیری، کە ناسراوە بەمەلای جزیری، ئاماژە بە بەیتە شیعرێکی جامی دەکات. نوورەدین عەبدورەحمانی جامی یەکێکە لە شاعیر و رۆشنبیرانی گەورەی فارس لە سەدەی پازدەیەمدا (١٤١٣ - ١٤٩٢). زانراوە کە جامی ساڵی ١٤٧٣ چووە بۆ سەفەری حەج. گەشتەکەی لە خوراسانەوە دەست پێ کردووە، بە رێگەی هەمەدان و کوردستانەوە چووە بۆ بەغدا و کەربەلا و نەجەف و لەوێشەوە گەیشتووەتە وڵاتی حیجاز، لەو لاشەوە لە گەڕانەوەدا بە دیمەشق و حەلەبدا هاتووەتەوە و پاشان لە رێگەی کوردستانەوە چووەتە تەورێز. وەک دەڵێن جامی ماوەی ٤٥ رۆژ لە دیمەشقدا ماوەتەوە، لە شوێنەکانی تری وەک بەغدا و حەلەبیشدا زۆرماوەتەوە، زانا و رۆشنبیرانی ئەو سەردەمە سەردانیان کردووە و دیاریان بۆ بردووە و کۆڕ و دانیشتنیان لەگەڵیدا ساز داوە. گەورەپیاوانی دەسەڵات لە هەموو شوێنێکدا رێزیان لێی ناوە و میوانداریيان کردووە. جامی لەم گەشتەدا ٣٠٠ سواری لەگەڵدا بووە بۆ پاسەوانی و خزمەت.

بەپێی بۆچوونی حاجی قادر ئەو کەسەی لە جزیردا بینراوە مەلای جزیری لەمەڕ خۆمان بووە. جزیرە و حەلەب لە یەکەوە نیزیکن و هیچ دوور نییە مەلا یەکێک بووبێ لەو زانا و رۆشنبیرانەی سەردانی جامییان کردووە لە حەلەب، یان جامی خۆی لەو گەشت و گەڕانەیدا بەجزیردا تێ پەڕیوە.

بۆچوونی عەلائەدین سەجادی لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا، زیاتر بەلای ئەوەدایە جامی چووبێتە جزیر. هەر بەپێی بۆچوونی سەجادی، پیاوەکەی لە حەریردا بینراوە دەبێ عەلی حەریری بێ. ئەم بۆچوونە بە لای منەوە بۆچوونێکە تەواو پەسەند و جێ سەرنجە. حاجیش رەنگە بۆیە روونی نەکردبێتەوە ئەو مێرخاسەی حەریر کێیە، چونکە هەر خۆی دوای چەند بابەتێک دێتە سەر باسی عەلی حەریری و ئەم پرسەی بۆ تێگەیشتن و لێکدانەوەی خوێنەر بەجێ هێشتووە. بەپێی قسەی مامۆستا سەجادی، جامی بە هەولێردا تێ پەڕیوە. دیارە حەریریش ناوەندێکی دەسەڵاتی ئەو سەردەمە بووە و میرانی سۆران فەرمانیان تێدا گێڕاوە، دوور نییە جامی لای دابێتە حەریر و میرانی سۆران رێزیان لێ گرتبێ، کە ئەو سەردەمە شا عەلی بەگ میری حەریر بووە، ئەم شا عەلی بەگە دەکاتە باوکی میری بەناوبانگ میر سەیدی، کە لەمەودوا لێی دەدوێین.

حاجی کەسێک نەبووە لە خۆیەوە و بێ بەڵگە بدوێ. دەبێ ئەم تێگەیشتنە لە شیعرەکەی جامی دەماودەم هاتبێ و حاجی لە خەڵکی تردەوە بیستبێ. ئاشکرایە حاجی قادر چ لە شارەکەی خۆیدا (کۆیە) و چ لە ناوچەی باڵەکایەتی یان موکریاندا، کە دەرسی تێدا خوێندوون و بە ساڵان تێیاندا ماوەتەوە، هاودەمی زانا و رۆشنبیرانی سەردەمی خۆی بووە، پاشانیش لە ئەستەنبووڵ کە ئەم شیعرەی تێدا نووسیوە (واتە: شاسواری بەلاغەتی کوردان) لەگەڵ رۆشنبیرانی هەموو دەڤەرێکی کوردستاندا سەری پێوەندی هەبووە و زانیاریی گۆڕیوەتەوە، بۆیە ناشێ ئەم قسەیەی حاجی بەقسەیەکی بێ سەرچاوە و بێ بەڵگە دابنرێت و پشتی پێ نەبەسترێ.

ئەو کاتەی جامی ئەم قسەیەی کردووە تەمەنی خۆی نیزیکەی شێست ساڵ بووە. بەم پێیە تەمەنی مەلای جزیریش ( کە پیرەمێردێک بووە) دەبێ لە دەوری حەفتا ساڵ یان زیاتر بووبێ، ئەو پیاوخاسەی حەریریش دەبێ دەوری ٣٠ ساڵێک بووبێ و بەشی ئەوەی کردبێ لە تێگەیشتن و فامیندا بەرادەیەک چووبێتە سەرەوە، شاعیرێکی وەک جامی پێی سەرسام بێ و دوایە لە شیعردا ئاماژەی پێ بدات. گومان لەوەدا نییە مەلای جزیری عارف و مەتەسەوف و شاعیرێکی باڵادەستی سەردەمی خۆی بووە، بەهەمان شێوەش ئەو چەند ژمارە کەمەی بەرهەمی عەلی حەریری کە بەدەست گەیشتوون بەسن بۆ شایەدیی لێهاتوویی حەریری لە شیعر و هزردا.

بەپێی ئەم بەراورد و بەرئەنجامانە، دەبێ عەلی حەریری لە دەوری ساڵی ١٤٤٠ پێشتر پاشتر بەچەند ساڵێک، لە دایک بووبێ و هاوچەرخی فەرمانڕەوایی شا عەلی بەگ و کوڕەکانی بووبێ، کە سەردەمی گەشانەوەی یەکەمجاری میرایەتی سۆران لەوێوە دەست پێ دەکات. بەپێی مێژووی میرانی سۆرانی حوسێن حوزنی موکریانی، شا عەلی بەگ لە ژیانی خۆیدا بەرێوەبردنی میرنشینەکەی بەسەر هەر سێ کوڕەکانیدا دابەش کردووە. پاش مردنیشی، ئەم کوڕانە یەک لەدوای یەکتر دەسەڵاتیان لە شوێنی باوکیاندا بەڕێوە

بردووە. میر سەید عەلی یان وەک لە ناو خەڵکدا باو بووە میر سەیدی، سێیەم و دوا برا بووە دەسەڵاتی سۆرانی بەدەستەوە گرتووە. ئەو میر سەیدییە بە مێرخاسی و دەست کراوەیی ناسراوە و لەناو خەڵکدا خۆشەویست و جێ متمانە و بڕوا بووە، یەکێک لە مێرخاسییە بەناوبانگەکانی ئەوە بووە، کاتێ میر عیسای برای بەدەستی میر بوداقی بابان کوژراوە، لە کەڵکەڵەی ئەوەدا بووە تۆڵەی خوێنی برای خۆی بکاتەوە، بەڵام لە بەردەم هێرش و پەلاماری میر بوداقدا بەرگری پێ نەکراوە و هەڵاتووە، تا دوا جار دەسەڵاتی لە کیس چووە و بەرەو کێوان تێی تەقاندووە. بەڵام سەیدی بەردەوام هەر لە بیر و پلانی ئەوەدا بووە میر بوداق بکوژێ و بگەڕێتەوە سەر جێگە و پایەی خۆی، تا ڕۆژێکیان میر بوداقی لە خۆرازی چووەتە دەشتودەر بەنیازی ڕاو و نێچیروانی، ئیتر بێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێ، بەسەر پارێزی میر سەیدیدا کەوتووە و میر بوداق و تێکڕای پاسەوان و نۆکەرەکانی کوژراون و میر سەیدی هاتووەتەوە سەر دەسەڵات. ئەم مێرخاسییە متمانەی خەڵکی بە میر سەیدی زیاتر کردووە. جگە لەم ڕووداوە، لە سەردەمی میر سەیدیدا ناوچەی سۆران ئارامی و پێشکەوتنی زۆری بەخۆوە بینیوە و ژیان لە هەموو ڕوویێکەوە بووژاوەتەوە. ئەم میرە بایەخی بەخوێندەواری و بنکەی ئاینی داوە و زانا و ڕۆشنبیرانی لە خۆی کۆ کردووەتەوە.

دەسەڵاتی میر سەیدی درێژەی هەبووە تا دەمی شەڕی چالدێران و دواتریش. ئەوە بوو لەو شەڕەدا (ساڵی ١٥١٤) عوسمانی بردیانەوە و سەفەوی شکان، ئەمە هەلی بۆ ناوچە کوردنشینەکان ڕەخساند بۆ ئەوەی لەمپەڕ تا ئەوپەڕی کوردستان دژی سەفەوی ڕاپەڕن و لە وڵات وەدەریان نێن. میرە کوردەکان هەریەکە و لەناوچەی خۆیەوە هێرشیان بردە سەر بنکەکانی دەسەڵاتی سەفەوی و ئاڵای دەوڵەتی عوسمانییان بەرزکردەوە. میر سەیدی لەمەڕ خۆمان، هەولێر و کەرکوک و مووسڵ دەگرێ، کە هەموویان ناوچەی ژێردەستی سەفەوی بوون. ئاشکرایە کورد بەهۆی جیاوازی مەزهەبەوە کەیفیان بەدەسەڵاتی سەفەوی نەدەهات، ئەمە جگە لە زوڵم و زۆری قزڵباش، کە لە مێژوودا زۆر باس کراوە.

دەگوترێ کەوا میر سەیدی کاتێ گەمارۆی هەولێری داوە، میرەکانی قزڵباش (قزڵباش واتە: کڵاوسوور) نەیانویستووە قەڵا بەدەستەوە بدەن، بەتوندی بەرگری و شەڕیان کردووە. میر سەیدی بۆ ماوەی شەش مانگ قەڵای هەولێری لە گەمارۆ کێشاوە و لەو ماوەیەدا مزگەوتێکی لە بنەپاڵی قەڵادا ڕۆناوە و خێڵانی ئەو ناوەی هان داوە بۆ ئەوەی لە دەوری قەڵادا خانوو دروست بکەن و نیشتەجێ بێن. هەروەها کەرکوک و مووسڵی گرتووە و مامەڵەی لەگەڵ خەڵکدا باش بووە، بەمەش بووە بە مایەی ڕێز و متمانەیان. میر سەیدی لە ساڵی ١٥١٦دا سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاندووە و دەوڵەتی سەفەویش دانی پێدا ناوە، بەمەرجێ دژی ئەوان پەیمان لەگەڵ کەسدا نەبەستێ و یارمەتی ناحەزانیان نەدا. ئەم میرە تا ساڵی ١٥٢٥ دەسەڵاتی گێڕاوە و لەو مێژووەدا مردووە.

لە دوای شەڕی چالدێراندا، میرانی کوردستانی ناوەڕاست و باشوور بەئازادی و سەربەخۆیی ژیاون. میرنشینە کوردییەکان هەر بەشێوەیەکی ڕواڵەتی سەر بەدەوڵەتی عوسمانی بوونە، ئەگەرنا بەسەرفرازیی خۆیان هەڵسوکەوتیان کردووە و پێوەندییان بەستووە. دوای ئەوەی سوڵتان سلێمانی قانوونی لە ساڵی ١٥٣٤دا بەغدای گرتووە، بە هەولێردا گەڕاوەتەوە بۆ ئەستەنبووڵ و بەدەم ڕێوە ناوچەی سۆرانیشی گرتووە. لە هەولێردا میر عیزەدین شێری میری سۆرانی کوشتووە کە کوڕی میر سەیدی بووە، ئەویش بەبیانووی ئەوەی ئەم میرە پێوەندیی لەگەڵ سەفەوییەکاندا گرێ داوە و نامەی لە شا تاهماسبی سەفەوییەوە بۆ هاتووە. سوڵتان سلێمان هەر بەوەندە نەوەستاوە کە میری سۆرانی کوشتووە بگرە فەرمانڕەوایی هەولێریشی لەم بنەماڵەیە ساندووەتەوە و داویەتی بە حوسێن بەگی ئێزیدی و هەریریشی خستووەتە سەر هەولێر، واتە خستوویەتیە ژێر دەستی میری ئێزیدییان. لەبەرئەوەی سەفەوییەکان پێشتر کوشتاریان لە ئێزیدییەکاندا کردووە و سوڵتانی عوسمانی دڵنیا بووە میری ئێزیدی بەم هۆیەوە پێوەندی لەگەڵ شای ئێراندا نابەستێ.

ئەو قسەیە زۆر بەجێیە کە دەڵێ میرانی کورد لە نێوان دەسەڵاتی ئێرانی و عوسمانیدا بەشێوەی هەلپەرستانە ژیاون، ئەمەش هەڵبەت بۆ ئەو ئامانجە بووە تا لەم نێوانەدا

ئازادیی خۆیان دەستەبەر بکەن. راستت دەوێ ئەگەر سەیری مێژووی سەردەمانی دوای شەڕی چالدێران بکەی دەبینی، سەپانی دەسەڵاتی عوسمانی لەو ناوچانەی تازە لە ستەمی سەفەوی رزگاربووبوون، پرسێکە هەر رووی نەداوە. میرنشینە کوردییەکان هەر بەڕواڵەت و زارەکی چووبوونە پاڵ داگیرکەری تازەوە کە عوسمانی بوو، ئەگینا بەکەیفی خۆیان کاروباریان بەڕێوە بردووە و فەرمانیان لە کەس وەرنەگرتووە. بەتایبەتی میرانی سۆران گوێیان بەکەس نەداوە جا چ سەفەوی بێ یان عوسمانی. ئەمە ئەو سەردەمەیە کە حاجی قادری کۆیی لە شیعردا باسی دەکا و دەڵێ: کوا ئەو دەمەی کە کوردان ئازاد و سەربەخۆ بوون!

وەک گوتمان عەلی حەریری لە سەردەمی گەشانەوەی یەکەمی دەسەڵاتی میرایەتیی سۆراندا، واتە لە سەردەمی شا عەلی بەگ و کوڕانیدا ژیاوە، کە دەبێ لەگەڵ ئەم گەشانەوە سیاسییەدا، شیعر و ئەدەب و ئاوەدانکاریش گەشابنەوە و پەرەیان سەندبێ و خەڵک لە گشت لاوە روویان لەو هەوارە ئاوەدانە کردبێ. وا دیارە شێخ عەلیی لەمەڕ خۆشمان بە جوامێری و ئانبدیی و ئاین پەروەریی میر سەیدی سەرسام و خۆشحاڵ بووە و شیعری بۆ گوتووە و پەسنی داوە:

**دلێ مەحزوون کیفارەت بیت**
**کە ئیمشەب تازە میهمان تێت**
**بمزگینی بشارەت بیت**
**کە میهمان جانێ جانان تێت**
**کە میهمان جانێ جانانە**
**لسەر چەشمێ مە میهمانە**
**بمالا جوملەیێ خانە**
**کە شاهێ جوملەیێ خان تێت**
**وەرە ئەی شاهیدێ شیرین**
**ژ عیشقا تە دل ئێخسیرین**
**بجان مەنزلگەهێ میرین**
**تەڵەبکارن کە سوڵتان تێت**

تا دەگاتە ئەوەی دەڵێ:

**بفریاد و بهاوارە**
**ژ دەست ئاهان من ئەو کارە**
**مە لازم بەندەیێ ژارە**
**ژ سەیدیێ چ فەرمان تێت**
**سەیدی حەق نەزەر ڤێرا**
**تە ئیقلیمان عەلەم گێرا**
**قەتارا گەوهەران ڤێرا**
**ژ نیڤ کانا بەدەخشان تێت**

هێنانی ناوی میر سەیدی دووجار لەم شیعرەدا، بەڵگەیە بۆ ئەوەی عەلی حەریری هاوچەرخی ئەو بووە. سەرتاپێی ئەم شیعرە رووی دەمی ئاخاوتن لەم میرەیە و باس باسی ژیان و حاڵی ئەو سەردەمەیە. وەک لە سەرەتاوە گوتم ئەگەر وردبوونەوە لە دەقی نووسین و بەراوردکردن لەگەڵ مێژووی کۆمەڵایەتیدا بکرایە بە رێبازگەی لێکۆڵینەوە لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا، ئەوا لەمێژبوو ئەو تەمومژەی گەمارۆی ژیان و ژینگەی عەلی حەریرییان داوە، رەوبیوونەوە و شێخ عەلی بایەخ و شوێنی شیاوی خۆی وەرگرتبوو. بۆ نموونە کە دەڵێ "خەراجا ئیسفەهان دیسا، ژ خواجان خالی مان کیسە" ئاشکرایە باس لە زوڵم و خەڵک رووتاندنەوە و باج کۆکردنەوەی قزڵباش دەکات، کەوا دیارە گەیشتووەتە رادەی ئەوەی کیسەی خواجە عەلیشیان خاڵی کردووە.

پرسێکی تریش هەیە سەرنجی ئەوانەی رانەکێشاوە، کە لە عەلی حەریری دواون، ئەویش دێڕە شیعرە بەناوبانگەکەی حاجییە کە ناوی عەلی حەریری و عەلی بەردەشانیی بەیەکەوە هێناوە و چواندوونی بە شاعیری چاخی جاهیلی و دەستپێکی سەرهەڵدانی ئیسلام: حەسانی کوڕی سابیت.

زانراوە کە حەسان لە سەردەمی پێش ئیسلامدا لەدایک بووە و تا ساڵی ٥٤ی کۆچی ژیاوە. لە مێژووی ئەدەبی عەرەبیدا، بەشاعیری شانازی و پەسن و پێدا هەڵگوتن بە گەورەپیاو و میرانی سەردەمی خۆی ناسراوە، حەسان بە پاشایانی غەسان و حیرەیدا هەڵگوتووە. مێژوونووسێکی ئەدەبی عەرەبی دەڵێ: کاتێ مرۆڤ بەخۆوە نازینی حەسان دەخوێنێتەوە هەست دەکات ئەم بەخۆوە نازینە لە سینەیەوە دێتە دەر. شاعیر بەچاوی خۆ بەزل زانی و گاڵتە پێ کردنەوە سەیری دوژمن و ناحەزانی خۆی کردووە و بەنەڕەی

دەنگ گوێی كاس كردوون:

لساني وسيفي صارمان كلاهما ويبلغ ما لايبلغ السيف مذودي

واتە: زمان و شمشێرم هەردووكیان تیژن، زمانم بۆ بەرگری دەگاتە ئەو شوێنەی شمشێرم نایگاتێ.

حەسانی كوڕی سابیت لە سەردەمی ئیسلامدا شاعیرێكی ڕێز لێ گیراو بووە و بەشاعیری پێغەمبەرایەتی ناسراوە. پەسنی پێغەمبەری ئیسلامی داوە و بەرگریی لە ئاینەكەی كردووە و پەلاماری قورەیشییە ناحەزەكانی داوە، هەروەها حەسان بەخەلیفە و سەحابەكانی پێغەمبەریدا هەڵگوتووە، بەهەمان گەرموگوڕیش لە كۆڕ و جڤاتی بادە و مەینۆشی دواوە.

ئەم پێناسەیە كتومت عەلی حەریری خۆشمان دەگرێتەوە، ئەگەر مرۆڤ ئەو چەند دەقە كەمەی حەریری بخوێنێتەوە، دەگاتە ئەو ئەنجامەی كە بەراوردەكەی حاجی و چواندنی ئەم شاعیرە بەحەسانی كوڕی سابیت شتێكی زۆر بەجێ بووە. لە بارەی عەلی بەردەشانیشەوە هەمان شت، بەیتی ئاوڕەحمان پاشای بابان زۆر ناسراوە. عەلی بەردەشانی بەم بەیتە ناودارە بۆ پەسنی ئازایەتی و لێهاتوویی ئاوڕەحمان پاشا، یادی خۆی لە یادمانی میللەتەكەیدا تاهەتا نەمر كردووە. دواتر دێینە سەر باسی عەلی بەردەشانی و لەو بەیتە مێژووییەش دەدوێین. بەڵام لێرەدا جارێكی تر دەگەڕێینەوە سەر باس و خواسی عەلی حەریری و خستنەڕووی بەرئەنجامی تاوتوێكردنەكانمان.

وەک گوتمان، دەبێ عەلی حەریری لە دەوری ساڵی ١٤٤٠دا چاوی بەژیان هەڵهێنابێ. بەم پێیە بێ، لە ١٤٧٣دا كە مەولانای جامی بەهەولێر و حەریردا تێ پەڕیوە، عەلی حەریری خوێندەوار و شارەزا بووە و لە جڤاتی ئەم كەڵە ڕۆشنبیرەدا، واتە جامیدا ڕۆنیشتووە. لە سەردەمی گەشە و پێشوەچوونی میرایەتیی سۆراندا، پیاو ماقووڵ و ڕۆشنبیرێک بووە پەنجەی بۆ ڕابكێشرێ، لە ڕاپەڕینی خەڵكی كوردستان لە سەروبەندی شەڕی چالدێران و تافی فەرمانڕەواییی میر سەیدیدا هێشتا لە ژیاندا بووە، كە دەبێ ئەو كاتە پیر بووبێ و تەمەنی حەفتا زیاتر بووبێ. ئەمەش زۆر نێزیكە لە ڕاستی، لەبەرئەوەی عەلی حەریری لە دەفتەر و دەستنووسەكاندا بەشێخ عەلی ناوی هاتووە و خۆشی لە هەندێک شیعردا هەر بە شێخ عەلی خۆی پێشكێش كردووە.

ئەمەی خوارەوە چەند دەقێكی شیعری عەلی حەریرییە:

**[٣] دلێ مەحزوون كیفارەت بیت**
**كە ئیمشەب تازە میهمان تێت**
**بمزگینی بشارەت بیت**
**كە میهمان جانێ جانان تێت**
**كە میهمان جانێ جانانە**
**لسەر چەشمێ مە میهمانە**
**بالا جوملەیی خانە**
**كە شاهێ جوملەیێ خان تێت**
**وەرە ئەی شاهیدێ شیرین**
**ژ عیشقا تە دل ئێخسیرین**
**بجان مەنزلگەهێ میرین**
**تەڵەبكارن كە سوڵتان تێت**
**تەڵەبكارین دڵئارائیم**
**مە دێم یاریم بوی شائیم**
**لبەژنا عەرعەرین دائیم**
**سیەهـ مار لێ بجەولان تێت**
**سیەهـ ماران كرە سەیران**
**كو خاس و عام بووبوون حەیران**
**لجۆتێ شوبهەتێ جەیران**
**لجەیران عەنبەر ئەفشان تێت**
**دوو زلفێت عەنبەر ئەفشانن**
**دوو لەعلێت شەكەرستانن**
**عەقیق و دوڕ و مەرجانن**
**لحەوزان ئابێ حەیوان تێت**
**عەجێب بركە مراری تێ**
**لسەدێ قەوسێ تاری تێ**
**سیەهـ پەنجێن خوماری تێ**
**ژ مەخمووران دوو ئەسلان تێت**
**ژ مەخمووران تو مەخمۆری**
**بجێ هشت عەقرەبا ژۆری**
**تەوافا بەیتێ مەعمۆری**
**لبورجان خوین بسەیران تێت**

عەقارب هات و بێحەد هات
لوێ برجێ زەبەرجەد هات
ڤەبالا قەوسێ ئەسوەد هات
لتەلەب ماهێ تابان تێت
لهەیڤا کەوچەرین کامیل
ڤە ئەهلاترا نەهێشتن دل
وە جوملەدا سەفێن سونبول
لهنداڤێ گولستان تێت
گولستانا خودا ڕستە
لچار ئەتراف دلان خوەستە
بنەفش و نێرگزا مەستە
جنەسرێ لەعل و رەیحان تێت
رەیاحێن سەوسەن و وەردن
وەرستێ ئەحمەر و زەردن
لشێخ عەلیێ غەریب فەردن
هەرۆ سەد جار دئەفغان تێت
ژ ئەفغانان نەمایم تێر
ببینە شەڕ دوو ئەسلەح دێر
دوعاگۆیێ تو ئەز بێ ڤێر
حەتتا ڤی قاسدێ جان تێت
ببینە روو شەمالینێ
وەرە هنداڤێ بالینێ
ژ دەست ئاهان و نالینێ
چ ڕەنگ فەریاد ژ عەسمان تێت
بفەریاد و بهاوارە
ژ دەست ئاهان من ئەو کارە
مەلازم بەندەیێ ژارە
ژ سەیدێ چ فەرمان تێت
سەیدی حەق ئەزەر ڤێرا
تە ئیقلیمان عەلەم گێڕا
قەتارا گەوهەران ڤێڕا
ژ نیڤ کانا بەدەخشان تێت
بەدەخشانان کو گەوهەردا
بقەنتار ئەختیان زەر دا
دەلالەت دینێ ئەکبەردا
ژ ئیقلیمێ هیندستان تێت

خەراج کر کیشوەرێ هیندی
لکەشمیر چاڤرەشێ جندی
لەحبووسا سەمەرقەندی
هزار رەنگ توحفەیێ ئیحسان تێت
هزار رەنگ توحفەیێ نادر
هەر سال ژ نوو بکن حازر
........................
ژ تەبریز و خوراسان تێت
خەراجا ئیسفەهان دیسا
ژ خواجان خالی مان کیسە
ژ بۆ شوخاک و بلڤیسە
قوماشێ کەز بتوومان تێت
قوماشێ کەز بسەد زێری
لبەر بەژنا پەری چێهری
خەبەر چوو حاکمێ ژێری
لرێ و بار بسەیران تێت
دوورە دێهان حەریر قەومە
ژ زیڤ و زێر کرە کۆمە
خەبەر چوو حاکمێ رۆمە
یەک...ی خەرجیا وان تێت
ئەمرێ وی هات ژ خوندکاری
لرۆمی حوکمێ کر جاری
خودا جازەنگیان باری
لمصریێد متاوان تێت
لحەلەب شووشەیێ دەند تێت
تکەل ئابا فەرەحمەند تێت
........................
لبۆ شاهی دشاهان تێت
حەریری گەر چە حەیرانە
لەدحێ تە شەش ئەزمانە
دوعاگۆ و سەناخوانە
حەتتا ڤی قاسدێ جان تێت
تو شاهی جوملەیێ شاهی
بحەقێ ئیسمێ ئەللاهی
ئەکی مەنعەم لدەرگاهی
کو ئەو مەجنوونێ ئاسان تێت

* * *

[٤] هەچی شێخ و مریدان گۆ
دبێژم قەت وەناکم ئەز
ئەگەر روحم [٥] دکن غارەت
ژ بادێ تۆبە ناکم ئەز
بلا ساقی مەیێ بینی
بنۆشم ئەز وەیارانرا
دکەرێ جوملێ سالۆسان
دەرێ کوویان رەوان کم ئەز
هەچی شەملەک لسەر پێچا
لاچک و لفکە لێ بەردا
ئەگەر سنگێ دخۆ راکە
دبێ ساحیب سیواکم ئەز
مەکن باوەڕ بسەر کەسکان
ئەگەر شاشی لنوورێ بی
دگەل کزبێ دبت کافر
دبێژی ئەسلێ پاکم ئەز
بسەر کەسکان مەکن باوەڕ
د جەهلێدا دبن کافر
دبێ ئەز شێخێ سەنعانم
بجارەک قوتبێ چاکم ئەز
هەچی سەر کەسکێ دبێن
هوون بسوادی سەرێ ژاکە
ئەگەر وارس دکن دەعوا
جەوابێ دێ ئەدا کم ئەز
ئەوێ شیرێ سەقا کردی
لدەست دگرم لمەیدانێ
بسەر کەسکان دجەڕینم
عەلی ژێک دی غەزاکەم ئەز

* * *

[٦] دیسان ژ نوو عیشقا بەرێ
پڕ ئەندەروونم ئاتەشە
زلفا مزەیێن عەنبەری
دەعوا تگەل خالا رەشە
خالا لدێمێ دلرەفە
سەد روح و جانم بن فیدا
سۆتم گەلۆ چوم تێ نەما
تەرکم کرن عەقل و هەشە
عەقل و هەشم بوون ئەسیر
دنیا کو گەهگەه تێتە بیر
دێم شبهەتێ بەدرا مونیر
زلفا ژ وەردێ بێن خوەشە
وەردان ژنیڤ زلفان دەرین
شوعلا بنەفشێ تێ وەرین
بالا وو قەددا عەرعەرین
هەژیان لسەر مارێ رەشە
دیسان کو حەی تێت و تچیت
ئەحیایێ ئەمواتان تبیت
وەجهان مودام نوور ژێ تچیت
دێم شبهەتێ شەمعا گەشە
شەمعا شەبستانان ئەوە
وەردا گولستانان ئەوە
سەرتەیێ بستانان ئەوە
شۆخا حەریرێ دلگەشە
عەجێب لەتیف و جندییە
ئەزمان نزان و رۆمییە
ئاگەه ژ عشقبازان نییە
مەست و خومار و سەرخوەشە
سەرخوەشا جامێ شەربەتێ
دێم شبهێ شەمعا زلمەتێ
حۆرییا تباغێ جەننەتێ
سەرداری چەندێن مەهوەشە
مەهوەش کو وستان سەف بسەف
ئەو هاتەدەر مصری تکەف
وان گۆت عەلیێ لا تخەف
مە پەمرنێ قەوی خوەشە

* * *

[٧] گەر ون ببینن نارێ عیشق
تێن و لبۆم زاری دکن
هەر کەس بزانە حالێ عیشق
بەخیل و دشواری دکن
بحالێ عیشق بەخیل دبن

هەر دەم بدەم زەلیل دبن
بێ راهـ و بێ دەلیل دبن
هەر کەسێ غەمخواری دکن
هون بار بکن غەمێ دزۆر
لحەسرەتا وەردێ دسۆر
چاوێ درەش بسکێ لـژۆر
هەنی ژ بەر تاری دکن
هەنی شەریف زلف تێن لسەر
رەنگێن دبن شەمس و قەمەر
رەشمار لجسمێ تێنە دەر
ژ عەرعەران یاری دکن
خوەش عەرعەر و شمشادە قەد
مەمسۆژە دل دەست بکەبەد
داد و مەدەد داد و مەدەد
چاوان چە خومماری دکن
جۆتی خومار ئەز بووم هەدەف
تەفسیر دکن سونعێ سەدەف
رۆژا عەمەل هەر چار تەرەف
بێ بسکێ تاتاری دکن
بسکێ لرۆژێ کرنە کۆم
جامێ مەیی هینا لبۆم
ئەوی دکر لازم قەخۆم
مەستی ژ من جاری دکن
مەستێ شەرابێ قەند لەبیم
ئەسیرێ بادێ وێ شەبیم
گەر وەسفێ هەندێ ئەز ببیم
هون تەرکێ هۆشیاری دکن
هۆشم چووین مایم بێ هۆش
هەردەم بدەم لەو تێمە جۆش
میران قەوی زەوق و خرۆش
پیشەیێ خوندکاری دکن
پیشەیێ وان دان و کەرەم
مەزیدێ عیشقێ دەم بدەم
خدمەت دکن کورد و عەجەم
بنەقشێ جەبباری دکن
نەقش و نیگارێ ناقشان
سەفێ دیوانێ چاوشان
هەی هەی لجۆتێ پادشان
عەجەب چ سەرداری دکن
سەردارێ شاهێ رەونەقان
موعجیزێ رەمزێ ئەهلەقان
عەلیێ مەبێژ ئەحمەقان
بازارێ ئینکاری دکن

* * *

(٨) مەحبووبێ دەستێ عاشق، سولتان محەمەد مستەفا
مەعشووقێ عیشقێ عاشق، سولتان محەمەد مستەفا
عاشق لدینێ ئەکبەر،.........
نازک سوارێ مەحشەری، سولتان محەمەد مستەفا
رۆژا حسێب و وەحشەتێ، قەد کەسی چاڤێ هلنەتێ
بەستە دحینێ روخسەتێ، سولتان محەمەد مستەفا
بەستە دحەق داخواز دکا، ئەز عیشقێ ئەو پەرواز دکا
گەهـ گەهـ نیازگەهـ ناز دکا، سولتان محەمەد مستەفا
نازدارێ حەیی قادرە، تەحقیق ئەبیی ئاخرە
کەوی کەمالاتی برە، سولتان محەمەد مستەفا
حەدێ کەمالی قەنج بدید، زدێ بەتالی قەنج بدید
حوبێ ویسالی قەنج بدید، سولتان محەمەد مستەفا
زانت خۆ نووحێ چ لێ هات، لەو بوو لتۆفانێ نەجات
دایم لدل قەد دەر نەتات، سولتان محەمەد مستەفا
نارێ خەلیلێ کردگار، لەوبوو ئەم مێرگ و مێرغوزار
دایم ددل گرتبوو قەرار، سولتان محەمەد مستەفا
یووسف بران ناڤێتە بیر، لەو بردە میسرێ کردە میر
هەر بوود لیسان و زەمیر، سولتان محەمەد مستەفا
یووسف کو ماسی خوار و چوو، لەو هاتەدەر سالم گەلۆ
دایم ددل ئەو چپە دگۆ، سولتان محەمەد مستەفا
خەلقێ یەقینە ئەو خەبەر، بەحرا مووسای لەوبوو بەکەر
دایم لدل قەت ناتە دەر، سولتان محەمەد مستەفا
دل پاشی حەقێ ئەو کافی، دەرمانێ دەردێ شافی
جوملە بنوورێ سافی، سولتان محەمەد مستەفا
نوورێ ئەرزێ ئەفلاکێ، درەفێ ئەو لەولاکێ
نەبی ژ ئەسلێ پاکێ، سولتان محەمەد مستەفا
بێ وەفا کردییە نەسەق، وێڕە ژ هەم دەرسان سەبەق
هەر چ کەسێ ناسییە بحەق، سولتان محەمەد مستەفا

**هەر چ کەسێ یارێ ویە، وداد ل راریێ ویە**
**باوک تکادارێ ویە، سولتان محەمەد مستەفا**
**باوک یەقینێ فیراشێ تو، خوەش یار و خوەش ئەلداشێ تو**
**رووحێ عەلی شاباشێ تو، سولتان محەمەد مستەفا**

پرسیارێکی تر کە لە پێشەوە ئاماژەمان بۆی کرد، ئەوەیە دەبێ ئاخۆ عەلی حەریری، کە بەزاراوەی کرمانجیی سەروو شیعری نووسیوە چۆن گەیشتووەتە حەریر، کە دانیشتوانەکەی بەکرمانجیی خواروو دەدوێن؟ هەرچەندە خەڵکی حەریر شوێنەواری کرمانجیی سەروو بەسەر ئاخاوتنیانەوە دیارە جا بەهۆی نێزیکی و تێکەڵی بێ یان بە هەر هۆیەکی ترەوە، بەڵام ئاخاوتنیان لە کرمانجیی خواروو نێزیکترە وەک لە سەروو، وێڕای ئەمە ئەو دیالێکتەی حەریری شیعری پێ نووسیوە جیایە لە ئاخاوتنی کرمانجیی سەرووی خەڵکی دەڤەری بادینان. ئەو دەڤەرە هەرچەندە تا بنەی حەریر درێژ بووەتەوە، بەڵام ناتوانین بڵێین عەلی حەریری بادینی بووە، لەبەرئەوەی شێوەی نووسینی جیاوازە.

بەلای منەوە وەڵامی ئەم پرسیارە هێندە سەخت نییە، جاران لە ناو کوردستاندا کۆچ و گەڕانی خەڵک و گواستنەوەیان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر زۆر ئاسایی بووە. گەلێک هۆی وەک گرانی و نەهاتی و قاتوقڕی، یان کێشە و بەرەی ناو خێڵان، یان لێقەومانی بنەماڵەیەک بووە بەهاندەر بۆ ئەوەی ناوچەکەیان بەر بدەن و بچن لە شوێنێکی تردا بگیرسێنەوە. میر و سەرۆک خێڵانی کوردیش هەردەم باوەشیان کراوە بووە بۆ ئەم جۆرە بارودۆخە و دالدەی لێقەوماوانیان داوە. بەتایبەتیش ئەم ناوچەیەی رەواندز و حەریر و شەقڵاوە باوەشێک بووە بۆ ئەوانەی لە باکووری کوردستانەوە بەهەر هۆیەک بێت رەویان کردووە بەرەو خواروو. تەنانەت دیار نییە ئاخۆ بنەماڵەی میرانی سۆران خۆیانیش لە کوێوە هاتوون، لە باکووردەوە یان لە رۆهەڵاتی کوردستانەوە! هەرچەندە قسەی بێ سەروبەر لەبارەی بنەچەکەیانەوە زۆرە، وەک ئەوەی کەلۆسی باپیرە گەورەیان عەرەب بووە، بەلای منەوە بەهیچ بارێک رێی تێ ناچێ عەرەبێک لە بەغداوە بێت و لە کوردستاندا دەسەڵاتێکی وا پەیدا بکات بتوانێ میرایەتی دابمەزرێنێ.

هەروەها نابێ ئەوەی بەدوور بزانین کە عەلی حەریری خۆی هەر خەڵکی حەریر بێ، بەڵام: لەسەردەمی خوێندن و فەقێیایەتی چووبێتە باکوور و لەو ناوچەیە خوێندبێتی، بە تایبەت کە لەو سەردەمەدا هەم ناوەندی خوێندنی پێشکەوتووی هەبووبێ و هەم لە رووی ئەدەبییەوە ئەدەبێکی پێشکەوتووی هەبێ و ئەویش کەوتبێتە ژێر کاریگەری ئەو ئەدەب و ئەو زادە، هەر ئەوەش بێ وای کردبێ کە بەشێوەی کرمانجی سەروو بنووسێ و کاریگەری شێوەزاری ناوچەکەی خۆشی هەر بەسەردوە مابێ و لەئەنجامدا، بەرهەمەکانی بەم شێوەیە کەوتبێتەوە.

لەبارەی هاتنی کوردی باکووردەوە بۆ نیشتەجێ بوون لە دەڤەری سۆراندا، چەند نموونەیەکی بەرچاو لە مێژوودا هەیە، دیارترینیان: دوای شکانی شۆڕشی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری لە ساڵی ١٨٨١دا، بەشێک لە پاشماوەی شۆڕشگێڕانی ئەو شۆڕشە هاتوونەتە ئەو ناوچەیە و تا ئێستەش ماون، ئەمانە پێیان دەگوترێ مهاجیر. هەروەها بەشێک لە دانیشتوانی بەردەڕەش و گوندەکانی دەوری کە ٦٥ کیلۆمەتر لە باکوری رۆئاوای هەولێرە، خۆیان بە بۆتانی پێشان دەدەن.

بۆ پرسی عەلی حەریری، رەنگە چیرۆکی هاتنی بنەماڵەی ئەوانیش بۆ هەریر جۆرێک بووبێ لەو بەسەرهاتانەی بەدرێژایی مێژوو لە کوردستاندا روویان داوە. دووریش نییە باوکی ئەو مەلایەک بووبێ و هاتبێ لەم شارەدا مەلایەتیی کردبێ، یان یەکێک لە میرانی سۆران با بڵێین شا عەلی بەگ، باوکی عەلی حەریری هێنابێ بۆ هەریر، وەک لەو سەردەمانەدا باو بووە میر و براگەورە مەلا و زانا و رۆشنبیریان لە دەوری خۆیاندا کۆ دەکردەوە.

دەمێنێتەوە سەر ئەوەی ئەگەر عەلی حەریری یان باوکی ئەو لە شوێنێکی تردوە هاتبێ بۆ ئەم شوێنە، بۆچی ناوی شوێنە کۆنەکەی نەکردووە بەنازناو و شۆڕەتی خۆی وەک لەناو کورددا باوە! وەک دەبینین خەڵکی کوردەواری زیاتر شانازی بەزێدی رابردوویانەوە دەکەن نەک زێدی تازەیان. بەڵام بەلای منەوە عەلی حەریری چ لە حەریر لە دایک بووبێ یان بەبچووکی هاتبێتە ئەوێ، ئەوە ئاساییە نازناوی حەریر بۆ خۆی هەڵبژێرێ، لەبەرئەوەی ئەو کاتە

حەریر ناوەندێکی گرینگ بووە لە چاو رۆژگاری خۆیدا و پایەتەختی میرنشینێکی بەهێز بووە، عەلیش وەک رۆشنبیرێک هەستی بەگرینگی ئەو دەسەڵاتە خۆماڵییە کردووە و شانازیی پێوە کردووە و بەرگریی لێ کردووە وەک لە شیعرکانیدا دەبینرێ. وەک دیارە میرانی سۆرانیش رێزیان لێی گرتووە و خۆشیان ویستووە. بێگومان عەلی هەر کوێی تری بکردایە بەنازناو و شۆرەتی خۆی، ئەوەندەی حەریر بایەخی نەدەبوو لەو سەردەمەدا. نەک هەر ئەو، کەسی تریش هەن لە رۆشنبیرانی ئەو سەردەمە یان دوای ئەو سەردەمە، حەریریان کردووە بەناونیشانی خۆیان لە کاتێکدا رەنگە لە گوندەکانی دەوروپشت یان دووریشەوە هاتبن و خۆیان بەرەچەڵەک حەریری نەبن. دواتر باسی ئەوانیش لەو نووسینەدا دێت. بەم بۆنەیەوە، هەر ئەو مەولانا عەبدورەحمانی جامییەی لەمەوپێش باسمان کرد، بنەماڵەکەی لە ناوچەی دەشتی ئەسفەهانەوە چوونەتە ناوچەی جام لە رۆهەڵاتی ئێران و مەولانا لەوێ هاتووەتە دنیاوە، خۆی گوتوویەتی لە جام دایک بووم، بۆیە ئەو ناوەم کردووە بەپاشناوی خۆم.

وەگ گوتمان حەریر لە شوێنێکدا هەڵکەوتووە، سنووری دابڕی سۆرانە لە بادینان. خەڵکی ئەم ناوچەیە بەشێوەیەک دەدوێن کرمانجیی خوارووە، بەڵام کاریگەریی دیالەکتی سەروو بەسەر ئاخاوتنیانەوە دیار و بەرچاوە. دوور نییە ئەو سەردەمە میرانی سۆران بایەخی زیاتریان دابێ بەئەدەبیاتی کرماجیی سەروو نەک ئەدەبیاتی خواروو هیچ بەڵگەیەکیش نییە کە ئەو سەردەمە ئەدەبیات بەزاراوەی کرمانجیی خواروو نووسرابێ. بێجگە لەمە تا ئەم چەند دەیەی دواییش لاوک و ستران و لاوژەی ناوچەی هەولێر بەچیا و دەشتەوە، هەر بەکرمانجیی سەروو بووە. کاوێس ئاغای بەناوبانگ بەشێوەی کرمانجیی سەروو لاوکە مێژوویی و ئەوینییەکانی خۆی چڕیوە، لە کاتێکدا خۆی سەر بە زاراوەی کرمانجیی خوارووە، زۆری تریش وەک کاوێس ئاغا لەم ناوچەیە هەیە.

تا دەگاتە سەرەتای حەفتاکانیش لە گوندەکانی دەوروپشتی هەولێر، لە کۆڕ و چڤاتی پیاوانی ناوسەرە و ماقوولدا ستران و لاوک بەکرمانجیی سەروو بوو، شتێک بە کرمانجیی خواروو واتە سۆرانی لە ئارادا نەبوو. دواتر گۆرانی و بەستەی کرمانجیی خواروو بەهۆی رادیۆوە لە ناو گەنجاندا باویان پەیدا کرد. دەمی منداڵیم لە بیرە، کە شایی و هەڵپەڕینی لاوانی گوندەکەمان لەسەر ئاوازی: هەی پێدا پێدا تەمۆ لاوۆ پێدا، بوو. بەکورتی ئەم ناوچەی هەولێرە لە رەواندزەوە تا دەگات بەدەشتی قەراج، زیاتر لە ژێر تین و تاوی کولتووری کرمانجیی سەروودا بووە هەرچەندە زمانی ئاخاوتن کرمانجیی خواروو بووە. ئەمەش لە ئەنجامی تێکەڵاویی بەردەوام و مێژوویی، لە نێوان خەڵکی کوردستاندا.

هەڵکەوتی شارۆکەی هەریر لە رووی زمانی ئاخاوتنەوە، بەجۆرێکە لە هەردوو دیالەکتەکەوە نێزیکە. لە بەرێکییەوە خەڵکەکە بەسۆرانی دەدوێن و لەبەرەکەی تردا بەبادینانی. ئەمەش وەک گوتمان زیانی بۆ ناوبانگ و مانەوەی بەرهەمی عەلی حەریری هەبووە، یان وەک زاراوەی کوردی دەڵێ لە هەردوو جەژنانی کردووە. بەخوێندنەوەی دەستنووسەکاندا دەردەکەوێ، هەندێک جار کاریگەریی دیالەکتی خواروو بەسەر شیعرەکانییەوە دیارە و هەندێک جاریش دیالەکتی سەروو (بادینان)، ئەمەش بەڵگەیە کە نووسەرەوەی ئەم دەقانە لە خەڵکی هەردوو بەرەکەدا بوونە.

ئەم بارە سەر لێ شێوانێکی تریشی دروست کردووە، ئەویش ئەوەیە لە دەستنووسە کۆنەکاندا عەلی عاشق ناوێکیش ناوی هاتووە و زۆر جار لەگەڵ عەلی حەریریدا بەرهەمیان تێکەڵ بووە. بەرهەمی شاعیرانی کورد زۆر جار لەلایەن نووسەرەوەکانیان تێکەڵ بەیەکتر کراون، بەڵام بۆ عەلی حەریری و عەلی عاشق ئالۆزییەکی ناوەتەوە بەجۆرێک هەردوو کەسەکەش کراون بەیەک. لێرەدا حەز دەکەم هەندێک جیاوازی بەبۆچوونی خۆم لەبارەی عەلی حەریری و عەلی عاشقەوە دیاری بکەم:

یەکەم: وەک لە پێشەوە بۆمان دەرکەوت، عەلی حەریری بە دیالەکتی کرمانجیی سەروو (شێوازی کوردستانی باکوور، یان بۆتانی) شیعری نووسیوە، بەڵام عەلی عاشق بەگوێرەی ئەو شیعرانەی بەزارگوت ماونەتەوە یان لە دەفتەرە کۆنەکاندا تۆمار کراون، بەشێوەزاری موکریانی شیعری گوتووە، کە ئەم دوو شێوە ئاخاوتنە لە یەکتر جیان. جگە لەمە، نە لە سەردەمی کۆن و نە لە

سەردەمی تازەدا کەسێکمان نەبینی لە ڕۆشنبیرانی کورد ئاوا سەردەست بێ بەسەر ئەم دوو دیالەکتەدا و بەڕەوانی شیعریان پێ بنووسێ، وەک چۆن ئەم دوو عەلییە وا بەسەر دیالەکتەکانی خۆیاندا زاڵن، تاوەکو بڵێین هەر یەک عەلی بوونە.

دووەم: وەک دەرکەوت عەلی حەریری پیاوێکی ماقووڵ و خوێندەوارێکی سەردەمی خۆی بووە، کە بەشێخ عەلی ناوی هاتووە. لە کاتێکدا نازناوی عاشق زیاتر بۆ شاعیرێکی کەم خوێندەواری گەلێری دەگونجێ، کە شیعرەکانی بەسەر زاری خەڵکەوە بن. باوەڕ ناکەم شیعری عەلی حەریری لە هیچ سەردەمێکدا لە ناوچەی حەریر و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایدا بووبن بە ویردی سەر زار، لەبەرئەوەی پڕن لە وشە و زاراوەی عەرەبی و فارسی. شاعیرانی لە جۆری عەلی عاشق لەناو کورددا شایەریان پێ گوتراوە نەک شاعیر، هەرچەندە ئەگەر بڕێک خوێندەواریشیان هەبووبێ. عەلی عاشقیش هەر شایەرە و بەرهەمەکانی بەسەر زارانەوە بووە نەک نووسراوە.

سێیەم: عەلی حەریری لە عەلی عاشق کۆنترە و لە سەدەی پازدەیەم و شازدەیەمدا ژیاوە، لە کاتێکدا بەگوێرەی هەندێک بەڵگە دەبێ عەلی عاشق زۆر لە دوای ئەو مێژووەدا بووبێ. بەپێی هەندێک کۆڵینەوە دەردەکەوێ کە عەلی عاشق لە سەردەمی میر سلێمان بەگ و لە دوا چواریەکی سەدەی شازدەیەمدا ژیابێ، واتە سەدەیەکیان بەینە. پاشان زیاتر بەدوای ئەم بابەتەدا دەڕۆین و لێی دەدوێین.

وەک دیارە لە ناو کورددا عەلی ناو زۆر بوونە، ئێستەش عەلی زۆرن. جا هەر عەلییەک ناوی هاتبێ گوتوویانە ئەمەش عەلی حەریرییە. نەک تەنیا لە سەردەمە کۆنەکاندا ئەمە ساغ نەکراوەتەوە، بگرە ئێستەش وایە. محەمەد عەلی قەرەداغی لە کتێبی بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورددا، باسی عەلی حەریرییەکی تر دەکات کە لە دەستنووسە کوردییە کۆنەکاندا ناوی بە (علی بن محمد السورچی الحریری مولدا، العلوی نسبا) هاتووە، واتە لە ناوچەی حەریر لە دایک بووە، ئەم عەلییە لە ساڵی ١٠٧٤ک (١٦٦٣ ـ ١٦٦٤ز)دا لە ناوچەی سەردەشت لە کوردستانی ڕۆژهەڵات مامۆستا بووە و قوتابخانەی خۆی هەبووە. جگە لەمە، دەڵێ بەگوێرەی ئەوەی لە دەستنووسەکاندا هاتووە، دەردەکەوێ ئەم مەلا عەلییەی دوایی جگە لە نووسینی پەراوێز بەسەر هەندێک کتێبەوە بەئیمزای: سوورچی، دانراویشی هەبووە بەڵام نازانین دانراوەکانی چەند بوون و چییان بەسەر هاتووە!

مامۆستا قەرەداغی ئەوەش دەڵێ کە ئەم مەلا عەلییە کوڕێکی هەبووە بەناوی مەلا هەمزە و لە دەستنووسەکاندا بە مەولانا هەمزەی کوڕی مەولانا عەلی ناوی هاتووە، کە وا دیارە خۆی و باوکی دوو زانای گەورەی سەردەمی خۆیان بوون و تا ساڵی ١١١٠ک ( ١٦٩٨ ـ ١٦٩٩ ) لە ژیاندا بوونە. م. قەرەداغی پرسیارێکیش دەکات و دەڵێ: ئاخۆ دەبێ ئەم عەلییە کە بەرهەمیی فارسیی لە کەشکۆڵێکدا هەیە، عەلی حەریری نەبێت؟ قەرەداغی لە زۆر جێگەی تریشدا نووسیویەتی: من پێم وایە عەلی حەریری و عەلی عاشق هەر یەک کەسن. ناهەقیشی نەبووە لەبەرئەوەی لە تۆمارەکاندا ئەم دوو ناوە و بەرهەمەکانیان بەجۆرێکی خراپ تێکەڵ بەیەکتر کراون.

مامۆستا عەبدوڕەقیب یووسفیش لە کتێبی دیوانی کرمانجیدا باسی کەسێک دەکات بەناوی شێخ ئەحمەدی کوڕی عەلی حەریری، کە باوکی خەڵکی باژێڕی حەریر بووە و چووە لە شام لە گوندێکی نێزیکی دیمەشق بەناوی گوندی "عەسال" نیشتەجێ بووە. ئەحمەد لەم گوندەدا لە دایک بووە و پاشان خوێندوویەتی و بووە ڕۆشنبیر و ناوبانگی دەرکردووە. ئەم شێخ ئەحمەدی حەریرییە لە ساڵی ١٦٣٨دا مردووە. م. عەبدوڕەقیب دەڵێ: لە لای من زۆر نێزیکە ئەم عەلی حەریرییەی باوکی شێخ ئەحمەد، عەلی حەریریی شاعیر بێت. کەواتە بەم پێیە بێت، دەبێ هەر عەلییەکی ناوچەی حەریر، ڕۆشنبیرییەکی هەبووبێ و لە هەر سەردەمێکیشدا ژیابێ، عەلی حەریریی شاعیر بێت؟ ئەمە کارەساتی بیروبۆچوونی بێ بەڵگەن.

وەک گوتم مەلا عەلی و شێخ عەلی لە ناو کورددا زۆرن، بەڵام بێگومان ناشێ ئەوانەی زاگەیان لە حەریر بووە یان نازناوی حەریریان هەبووە هەموویان هەر عەلی حەریریی شاعیری بەناوبانگ بن. لێرەدا پرسیارێک دێتە پێشەوە: باشە بۆچی ئەم عەلییانە شاری حەریریان بەجێ هێشتووە لە کاتێکدا ئەو شارە وەک گوتمان ناوەندی

دەسەڵاتی کوردی بووە، یان وەک لە پێشەوە باسمان کرد، لە رووی سەربەخۆیی دەسەڵات و هەبوونی بنکەی ئاینی و زانیاری و رۆشنبیرییەوە ناوچەیەکی گەشاوە بووە؟

بەر لەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە، دەڵێم کۆچکردنی ئەم عەلییانە و دەرچوونیان لە حەریر و مردنیان لە وڵاتانی تردا، جا لە ناو کوردستان بێ یان دەرەوەیدا، ئەو راستییەمان تەواو بۆ بەهێزتر دەکات کەوا ئەو گۆڕەی ئێستا لە حەریرە، دەبێ گۆڕی عەلی حەریری شاعیر بێ، دەماودەمیش وا هاتووە کە گۆڕی ئەوە، ئەمەش بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی کە عەلی حەریری لە سەردەمی جێگیری و تەناهیدا لەم شارەدا ژیاوە نەک لە سەردەمی ئاڵۆزی و پەشێویدا.

هۆی کۆچکردنی رۆشنبیر و زانایان لە حەریر دەگەرێتەوە بۆ ئەو پەشێوییەی لە ساڵی ١٥٣٥ بەدواوە روویان لەو ناوچەیە کرد. وەک گوتمان لەو ساڵەدا عیزەدین شێری کوڕی میر سەید عەلی لەلایەن سوڵتان سلێمانی قانوونییەوە کوژرا و ناوچەکەی درا بە حوسێن بەگی داسنی، کە پیاوێکی ستەمکار بووە. حوسێن بەگ جگە لە ستەمکارییەکەی، خەڵکی ناوچەکە پێیان خۆش نەبووە ئێزیدییەک باڵادەستی سەریان بێت، لەبەرئەوە سکاڵایەکیان نووسیوە و داویانەتە دەست شاندێکی گەورەپیاوان تا بیبەن بۆ ئەستەنبوڵ، شاندەکە ژمارەیەک لە کەڵە زانایانی ئەو دەمەی عێراقی گرتووەتە خۆ، لەوانە مەولانا شێخ شەرەفەدینی نەقشبەندی و مەولانا سەیفەدینی سەهرەوەردی و چوار کەسی تر کە هەموویان کەڵە زانا و ماقووڵی ئەو سەردەمە بوونە، بەڵام سوڵتانی عوسمانی هەموو ئەندامانی شاندەکەی کوشتووە. وا پێ دەچێ سوڵتان لە فرەوانبوونی دەسەڵاتی میرانی سۆران ترساوە و ویستوویەتی بەهەر شێوەیەک بێت لەناویان ببات یان هەلی هەڵسانەوەیان پێ نەدات.

ئەو میر عیزەدین شێرەی باسمان کرد کە سوڵتانی عوسمانی کوشتی، پیاوێکی لێهاتوو بووە لە بەرێوەبردنی کاروباردا، بریاری کارەکانی خۆی دوای وەگرتنی پەسندایەتیی ئەنجومەنێکی راوێژکار جێبەجێ کردووە. لە میرنشینەکەیدا کاری ئاوەدانکردنەوەی کردووە، لەوانە: دەزگای خێرخوازیی داناوە، گومەزی نەبی یونسی لە مووسڵ نوێ کردووەتەوە، لە رۆهەڵاتی هەولێردا دوو مزگەوتی بنیات ناوە و قوتابخانەیەکی خوێندنی قورئانی کردووەتەوە و لە مووسڵەوە مامۆستای بۆ هێناوە. بایەخی بەفرەوانکردنی شاری کەرکووک داوە و سێ مزگەوت و قوتابخانەیەکی زانستیی تێدا رۆناوە. هەموو ئەو کاروبارانە و گەلێکی تریش نیشانەی ئەوەن، کە لە سەردەمی میر عیزەدین شێردا، وەک درێژەی سەردەمی میر سەیدیی باوکی، ناوچەی دەسەڵاتی سۆرانییەکان ناوچەیەکی بووژاوە بووە و مەکۆی زانا و رۆشنبیر و شاعیران بووە، بەڵام دوای بەسەرچوونی ئەو چاخە زێرینە، بارودۆخی زانست و رۆشنبیری شێلوو بووە و زانا و رۆشنبیران لەم دەڤەرە دوور کەوتوونەتەوە.

دوای میر عیزەدین، سەیفەدینی برازای لە سماقوولییەوە لە دژی حوسێن بەگی ئیزیدی راپەریوە و ناوچەی حەریری لێ ستاندووەتەوە. میری ئێزیدی لە مووسڵەوە یارمەتی بۆ هاتووە و لەشکری سەیفەدینی شکاندووە و جارێکی دەستی بەسەر ناوچەکەدا گرتووەتەوە. ئێزیدییەکان کوشتار و وێرانەکارییەکی بێ رادەیان لە ئاست دانیشتوانی سۆراندا کردووە. میر سەیفەدین ناچار رای کردووە و پەنای بردووەتە بەر میر بێگە بەگی ئەردەڵان و داوای یارمەتیی لێ کردووە. بێگە بەگ لە ترسی تووڕەبوونی سوڵتان نەیوێراوە یارمەتیی بدات بۆیە میر سەیفەدین بەدڵی شکاو لە سنەوە گەڕاوەتەوە رەواندز. بەڵام جارێکی تر پیاوانی ئازا لێ کۆبوونەتەوە، لەشکری ساز داوەتەوە و هێرشی کردووەتە سەر هەولێر و میری ئێزیدییانی دەرکردووە. حوسێن بەگ زۆری هەڵ داوە ئەم جارەش سەر کەوێتەوە بەڵام بێ سوود بووە، میر سەیفەدین جاڕی سەربەخۆیی خۆی داوەتەوە.

سوڵتانی عوسمانی لەم کارانەی میری سۆران تووڕە بووە و هانی میرانی ئامێدیی داوە لەشکری بخەنە سەر. بەڵام ئەم هەوڵانە بێ سوود بوونە و میر سەیفەدین ئازاد و سەربەخۆ ژیاوە، تا دواجار بەقسەی خۆشی یووسف بەگی برادۆستی کە ناسراو بووە بەغازی قران فریوی خواردووە، رووی کردووەتە ئەستانبوڵ بۆ ئەوەی داوای لێ بووردن لە سوڵتانی عوسمانی بکات و پەیمانی لەگەڵدا ببەستێ تا بەو پێیە عوسمانی یارمەتیی بدەن بۆ شەڕ دژی ئێران و

گوایە عوسمانی دان بەسەربەخۆیی میرنشینی سۆراندا دەنێن و بالیۆزی لەگەلدا دەگۆڕنەوە، میر سەیفەدین نەیزانیوە ئەمە پیلانە، هەر بەگەیشتنی بەئەستانبوڵ لە ملی دراوە. ئەمە سالی ١٥٥٨ بووە، ئیتر دوای ئەمە وێرانەمالی و پەشێوی زیاتر روویان کردووەتەوە ئەم دەڤەرە.

جگە لەمە، لەوە بەدواوە ناکۆکی و دووبەرەکی کەوتووەتە نێوان میرانی سۆران خۆیان، برا و برا شەڕی یەکتریان کردووە. لە باتاسدا میر بوداق و میر سلێمان بەگی برای، بەرەوڕوو بوونەتەوە و شەڕ هەلگیرساوە. میر بوداق شکاوە و پەنای بۆ میرانی ئامێدی بردووە و لەوێوە لەشکری ئەوانی کێشاوەتە سەر ناوچەی سۆران، بەلام خۆشبەختانە و بەر لە گەیشتن بەئامانج سالی ١٥٧٧ لە رێگەدا مردووە. میر سلێمان بەگ دوای ئەوە ویستوویەتی تۆلەی کوژرانی میر سەیفەدینی مامی بکاتەوە، هێرشی کردووەتە سەر خێلی زەرزا لە ناوچەی شنۆ لە بەری رۆژهەلاتی کوردستان لەبەرئەوەی کاتی خۆی ئەم خێلە یارمەتیی غازی قرانیان داوە. راستت دەوێ، سولتانی عوسمانی بەردەوام ویستوویەتی ئەم خێلە واتە زەرزا کە لە شەڕوانیدا لێهاتوو بوون، بۆ لێدانی میرایەتیی سۆران بەکاربێنێ ئەویش لەبەرئەوەی ئەم میرنشینە دانی بەهیچ دەسەلاتێکی بیانیدا نەهێناوە. سلێمان بەگ هێرشی کردووەتە سەر خێلی زەرزا و زۆر بەخراپی شکاندوونی و ژن و مندالیشی بەدیل هێناون. پاشان سلێمان بەگ هێرشی کردووەتە سەر تەرگەوەڕ، کە قوباد بەگی ئامۆزای خۆی لەوێ فەرمانڕەوا بووە. سلێمان بەگ ترساوە لەوەی دەولەتی عوسمانی ئەم ئامۆزایەی راست بکاتەوە و میرایەتییەکەی لێ بستێنێ. هەروەها سلێمان بەگ شەڕی قزلباش (سەفەوی)یشی کردووە و ژمارەیەکی لێ بەدیل گرتوون و تالان و برۆی کردوون، دیلەکانی لەگەل دیاریی گرانبەهادا بۆ ئاستانە ناردووە، بەمەش سولتان لێی خۆش بووە و ئاشت بوونەتەوە.

سلێمان بەگ بەهۆی ئەم شەڕانەوە ناوبانگێکی فرەی دەرکردووە، لە ناوچەکەیدا دەسەلاتی چەسپاندووە بێ ئەوەی کەس بتوانێ رکابەریی بکات. هەرچەندە نەخوێندەواریش بووە بەلام کەیفی بە زانست و خوێندەواری هاتووە و رۆشنبیر و مەلای گەورە و زانایانی لە دوورەوە هێناوە و کۆی کردوونەتەوە. سلێمان بەگ تا سالی ١٥٨٩ ژیاوە. خانزادە خاتوونی بەناوبانگ خوشکی ئەو بووە و لە سایەی لێهاتووییەوە، زۆربەی کاروباری کارگێری بەدەستی ئەم خاتوونەوە بووە و پاشی میر سلێمانیش ماوەیەک میرایەتی کردووە.

بەکورتی دەشێ بلێین، بارودۆخی ناجێگیر لە ناوچەی سۆراندا بۆ ماوەی پەنجا سال بەردەوام بووە. ناشێ لەم نائارامییەدا شتێک لە بووژانەوەی زانست و خوێندەواری هەبووبێ. بۆیە وەک بینرا زانیار و رۆشنبیرانی ئەو سەردەمە لە ناوچەکە رەویان کردووە و دوور کەوتوونەتەوە. ئەوانەی ژیانی عەلی حەریری دەخەنە ئەو ماودیەوە، بێگومان دەبێ ئاگایان لەو مێژووە تالە نەبێ، کە بەهیچ بارێک رێگەی چووزەرەکردنی خوێندەواری و رۆشنبیریی نەداوە، بە کورتی: ولاتێکی وێران و میللەتێکی پەرێشان.

- لە سەردەمی میر سلێمان بەگ و بەدواوە، دووەمین چاخی زێرینی میرایەتیی سۆران دەستی پێ کردووە. لەم سەردەمەدا وەک گوتمان ئاوەدانی و رۆشنبیری گەشاونەتەوە و ژیانی خەلک جارێکی تر ئارام بووەتەوە. عەلی بەگی کوڕی میر سلێمان بەگ هەلمەتێکی گەورەی ئاوەدانیی لە ناوچەکەدا کردووە. چەندان قەلا و پردی رۆناوە و پرۆژەی خۆشکردنی رێگەوبانی جێبەجێ کردووە، یەکێک لەوانە چاکرنەوەی رێگەی گەلییە کە تا ئێستەش ئەو گەلییە هەر بەناوی ئەوەوە دەناسرێ (گەلی عەلی بەگ). هەروەها عەلی بەگ پیاوێکی بێ کێشە بووە و حەزی بەشەڕ نەکردووە، لەگەل ئێران و عوسمانیدا نێوانی خۆش بووە. عەلی بەگ زۆر پایەتەختیشی هەبووە: حەریر، دوین، خەلیفان. کەیفی بەزانا و رۆشنبیران هاتووە و شێخ حەیدەری ماوەرانی، شێخی زانایانی ئەو سەردەمە بووە. عەلی بەگ لە سالی ١٦٣٤دا مردووە.

لە سالانی ئاخیریی فەرمانرەواییی عەلی بەگدا جارێکی تر، ناوچەی فەرمانڕەواییی میرانی سۆران دووچاری شلەژان بووەتەوە ئەویش بەهۆی هێرش و پەلاماری بابانییەکان. عەلی بەگ لەو سالانەدا بەناچاری پایەتەختەکەی لە حەریرەوە گواستووەتەوە خەلیفان و پشتی خۆی بەگەلی قایم کردووە. لەلایەکی ترەوە سالی ١٦٢٥

خان ئەحمەد خانی والی ئەردەڵان، ڕەواندز و کۆیە و هەریر و ئامێدیی گرتووە، بەمەش دەسەڵاتی سۆرانییەکان زۆر لە کورتیی داوە و ناوچەکەیان بەرتەسک بووەتەوە. ساڵی ١٦٤٥ ئۆغـز بەگی کـوڕی عـەلی بەگ ڕەواندزی وەرگرتووەتەوە و پایەتەختەکەی بردووەتە ئەوێ، بەڵام لەوە بەدواوە ناوچەی هەریر و کـۆیە کـە لە مـێـژەوە لە بن دەسەڵاتی میرانی سۆراندا بوون، بەیەکجاری لە دەستیان دەرچوونە و کەوتوونەتە دەستی بابانییەکان.

دەتوانین بڵێین لە ناوەڕاستی بیستەکانی سەدەی حەڤدەوە، واتە لە دەمی عەلی بەگەوە ناوچەی میرنشینی سۆران بە سەردەمێکی نالەباردا ڕۆیشتووە تا دەگات بە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم، واتە تا سەردەمی سەرهەڵدان و ڕاپەڕینی میـر مـحـەمـەدی بەناوبانگ، کـە لەوە بەدواوە چاخی زێڕینی سێیەم و دوایی، لە گەشانەوەی میرایەتیی سۆران ڕوو دەدات. لەو ماوەیەی باسمان کرد، میرانی سۆران دەسەڵاتیان تەنیا لە ڕەواندزدا بووە و ناوچەی حەریریان بەدەستەوە نەماوە. بۆیە بە شتێکی ئاسایی دەزانرێ ڕۆشنبیر و زانایان لەم ناوچە کرژ و نائارامەدا کۆچ بکەن و بەجێی بهێڵن. وەک بینیمان عەلی سوورچی هەریرییەک لە شەستەکانی سەدەی حەڤدەدا لە سەردەشت ژیاوە و لە کۆتاییی سەدەشدا عەلییەکی تر چووە بۆ شام و لەوێ مردووە. ئیتر ئەمە بووە حاڵی عەلییەکانی دوای عەلی حەریری.

ئەو شایەرەی بەعەلی عاشق ناوی ڕۆیشتووە و لە هەندێک سەرچاوەدا لەگەڵ عەلی حەریریدا تێکەڵ کراوە، بەبیری من لە چارەکی ئاخیریی سەدەی حەڤدەیەمدا واتە لە سەردەمی خانزادە خاتوون و عەلی بەگدا ژیاوە. بەپێیی سەرچاوەی زارگوتی خەڵکی ناوچەکە، عەلی عاشق فەقێ بووە و لە قوتابخانەی سەر بەمزگەوتی ئەو سەردەمەدا خوێندوویەتی و عاشق بەکچێک بووە بەناوی پەریزاد.

بەپێیی حوسێن حوزنی موکریانی لە کۆواری زاری کرمانجیدا، دەبێ عەلی عاشق لە سەردەمی میر محەمەدی بەناوبانگدا ژیابێ، بەڵام بەپێیی وتارێک کـە لە پاشکۆی ڕۆژنامەی عێراقدا بڵاوکراوەتەوە، دەبێ لە سەردەمی خانزادە خاتووندا ژیابێ و خـۆیشی بەبنەڕەت خەڵکی ناوچەی موکریان بووبێ و بۆ خوێندن ڕووی کردبێتە ئەم ناوچەیە، کە وا دیارە لەو سەردەمەدا قوتابخانەی باشی لێ هەبووە و لە ڕووی ئابوورییەوە بووژاوە بووە. هەڵبەت هەردوو سەرچاوەکە پشتیان بەزانیاریی دەماودەمی خەڵک بەستووە و شتێکی بنبڕ لە گۆڕێدا نییە بەڵام تەرازوو زیاتر بەلای بۆچوونەکانی کزەڵدا لەنگە. سەردەمی خانزادە خاتوون و سەردەمی میر محەمەد زیاتر لە سەد ساڵیان بەینە.

ئەوەی مەحموود قادر ئەحمەد (کزەڵ) لە پاشکۆدا نووسیویەتی، پوختەکەی ئەمەیە: پەریزاد خوشکی خانزادە خاتوون بووە و کچێکی جوان و شۆخ و شەنگ بووە. فەقێ عـەلی بەرێکەوت چاوی پێ کـەوتووە و تیـری ئەوین ئەنگاوتوویەتی. شیعری لەسەر داناوە و بۆی سووتاوە، لەمەوە لە ناو خەڵکدا ناوی بە عەلی عاشق ڕۆییوە. دەنگوباسی ئەوینی فەقێ عەلی بۆ پەریزاد کەوتووەتە سەر زاری هەموو خەڵک. خانزادە خاتوون ئەم قسە و باسانەی زانیوەتەوە و سەرەتا نارەحەت بووە و هەڕەشەی کردووە لەوەی کە فەقێ ڕووتەیەک ئابڕووی بنەماڵەکەیان دەبات. فەقێش لە ترسانە و لە عەشقانە وردە وردە لە خەڵک تەریک بووە و پاشان داویەتییە کێوان، ئەمەش دڵی خەڵکی بۆ فەقێ هێناوەتە جۆش و بەزەیییان پێدا هاتووە، لەوانەیە پەریزادیش لەلایەنی خۆیەوە بێ هەڵوێست نەبووبێ و کەوتبێتە داوی ئەوینی فەقێوە. ئەمانەش وایانکردووە دوا جار دڵی خانزاد نەرم ببێ و پەریزادی خوشکی لە فەقێ مارە بکات. بەڵام سەرچاوەی دەماودەمی خەڵک باس دەکات فەقێ عەلی لە یەکەمین چاو پێ کەوتنی پەریزادی بووکدا، شیعری (پەریزادێ بەخێر هاتی)ی بۆ گوتووە و پێش ئەوەی لە یەک نێزیک ببنەوە، عاشقی بێ چارە کتوپڕ گیانی سپاردووە.

ئەوەی لە زاری کرمانجیدا هاتووە باسی خانزاد ناکات، بەڵام لەوێشدا باوکی پەریزاد کـە پیاوێکی ماقووڵ و ناوبەدەرەوەی دەڤەرەکە بووە، دڵی نەرم بووە و کچەکەی داوە بەعەلی عاشق، واتە کۆتاییی چیرۆکەکە هەمان شتە، کە بەبێ گەیشتنی عاشق و مەعشووق بەیەکتر، بڕاوەتەوە. ئەمەی خوارەوە دەقی شیعرەکەی عەلی عاشقە بەزاراوەی موکریانی:

**پەریزادێ بەخـێـر هاتی**

بەسەر چاوێ دەمن شاڵان
بەچم زانی کە تۆی هاتی
بەدەنگی تۆق و خرخاڵان
بەدەنگی بازن و زەندان
هەرچەند من گوێت هەزار چەندان
نەتهێشت عەقڵی عەقڵمەندان
ئەتۆم چاتری لە ئاواڵان
ئەتۆم چاتری لە لەیلایێ
یووسف لەگەڵ زولەیخایێ
مەم و زین هەرتک هەمتایێ
بەزوڵفانت کردم تالان
لە سپای زوڵفان بۆچ ناترسی؟
شیرین ئەحواڵان دەپرسی
موبارەک بێ لە تۆ کورسی
روونێ گوێ بدێرە عەبدالان
روونێ گوێ بدێرە وێ بەیتێ
دوو وەجهەت وەک چرای زەیتێ
دەسووتێ مەجلیسی مەی تێ
هەروەک پووشێ لە کەندالان
نەقەقنەس بووم نەپەروایم
دەخۆم سەد سوێند جودا نابم
گەر خزێم بم قەت تێر نابم
لە دیداری خەت و خاڵان
لە دیدارت دەی حەزین کەم
مردم هەندی رووحی تێ کەم
کەسەر بووم جارێکیت بێ کەم
خودانا چیت و دەسماڵان
خودانە چیت و جەبهەت بوو
دیداری تۆم بەقیسمەت بوو
خەراجی ئەرزی قیمەت بوو
بەخەت و خاڵ و ئەشکالان
بەخەت و خاڵ و سیایی- سایی تۆ
جیهان جوملە عەتایی تۆ
دەکێشم خاکی پایی تۆ
هەروەک زێری بەمستقالان
من نە زێرم من زێوم

کە بوو چێشتم نەبوو شێوم
بەسەد هەویا کردت کێوم
خودانە دۆشەک و پالان
خەدانی تۆم سەراسەر کرد
بەزوڵفت هێوی سەتەر کرد
دڵ من و تۆی وێکرا بەند کرد
بەعید و جێژنی سەر سالان
بەعید و جێژن و سایەی من
ئەوەڵ عید و ئەمانی من
عەزیز و ئەوجەوانی من
کەس و کارم پێت بوون تالان
ئەوەڵ کەس و کارم ئەتۆی
تەبیب و دەرمانم ئەتۆی
گەر تۆم هەبێ بەسم ئەتۆی
لە گەنج و ماڵ و پاتالان
لە گەنج و ماڵ و قازانجم
کەساسم ساحێبی ڕەنجم
لە بازاران گەوهەر سەنجم
خەبەردارم بەهەموو حالان
خەبەردارم بەمەعبوودی
دڵم راستە لەسەر جوودی
پەشیمان نیم لە مەقسوودی
بەسەرم هات ئەو رۆژگارە
بەسەرم هات لە بەرواری
وای گوت بە عەلی هەژاری
تۆبە بکە بەیەکجاری
بەڵکو ڕزگار بێ شالان

هاتنی ناوی پەریزادی خوشکی خانزاد لەم چیرۆکە ئەوینییەدا و هەڵسوکەوتی ژیرانەی خانزاد لەبەرامبەر گڕی دڵداریی فەقێ عەلیدا وەک چۆن بەسەرهاتی زارگۆت دەدڵێ، چیرۆکی ئەویندارێی لاس و خەزاڵمان دەخاتەوە بیر. لە بەیتی لاس و خەزاڵدا ناوی خانزادە خاتوون کەوتووە ناو چیرۆکی ئەویندارێی ئەوانەوە و بووە بەلایەنێک لە ئەویندارییەکە. دووکەڵ بێ ئاگر نابێ، لەوانەیە خانزاد و پەریزادی خوشکی، وەک دوو ئافرەتی ئازاد، ئەوینداریان کردبێ و چیرۆک و بەسەرهاتیان کەوتبێتە سەر زمانی

خەڵک، بەتایبەتیش لەبەرئەوەی سلێمان بەگی برایان پیاوێکی نەرمونیان بووە و ڕەنگە دەمارگیراویی خێڵایەتیی کەم بووبێ، یان خانزاد و پەریزاد (ئەگەر ڕاست بێ پەریزاد خوشکی خانزادە خاتوون بووبێ) لەبەرئەوەی خوشکی میر سلێمان بەگ بوون، ئازادی و کراوەییی کۆمەڵایەتییان زیاتر بووبێ لە خەڵکی تر. هەرچۆن بێ، کارکردن یان بەشداریی ئافرەت لە دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی کاروباردا ئازادیی زیاتری پێ دەدات لەوەی ئافرەتێکی ئاسایی هەیەتی.

لە دەقێکی بەیتی لاس و خەزاڵدا کە بەشێوەی ئاخاوتنی ناوچەی هەریر تۆمارکراوە، لاسی ئەحمەد بەگی جافی شارەزووری و خەزاڵەشۆڕی مەلا نەبیی باڵەکی، ئەوینداری یەکتر دەبن. لاس لە ناوچەی جافەتی گەرمیانەوە دێ بۆ ڕفاندنی خەزاڵ لە ڕەواندز، بەڵام بەر لەوەی بچێ بۆ ناوچەی باڵەکایەتی لادەداتە هەریر و میوانی خانزادە خاتوون دەبێ. خانزاد هێندە بە لاس سەرسام دەبێ خۆی پێشکێش دەکات و داوای لێ دەکات واز لە خەزاڵ بێنێ و بێ ئەم مارە بکات.

چیرۆکێکی تریش هەیە شایەنی سەرنج لێدانە ئەویش چیرۆکی خانزاد و لەشکرییە. بەگوێرەی بەیتی دەماودەمی خانزاد و لەشکری، ئەم لەشکرییە منداڵێکی سێوی و بێ دایباب بووە، لە ماڵی حوسێن بەگدا بەخێوکراوە کە پیاوێکی گەورەی ناوچەکە بووە. کە ئایشی حوسێن بەگیان داوە بە میر سلێمان بەگ، ئایش لەشکریی لەگەڵ خۆیدا بردووە. لەشکری جوانچاک و لێهاتوو بووە و ئایش و میر سلێمان بەگ پشتیوانییان کردووە تا بووە بەیەکێک لە کاربەدەستانی میرایەتیی سۆران، بەڵام لەبەرئەوەی لەشکری ئەوینداری ئایش بووە، ویستوویەتی بە هەر شێوەیەک بێ میر سلێمان بەگ لەناو ببات تا دەست بەسەر ئایش و دەسەڵات بگرێ. ڕەنگە هەر ئایش خۆی ئەوەی لە گوێ خوێند بێ. بەگوێرەی ئەو بەیتە، لەشکری لەلای عوسمانییەکاندا لە خراپەی سلێمان بەگ دواوە و لە دواییدا بەژەهر و دەرماندراوکردن کوشتوویانە. چیرۆکەکە دەڵێ: خانزاد لە تۆڵەی ئەم ناپاکییەدا لەشکری کوشتووەتەوە.

چیرۆک و بەسەرهاتی تر لە بارەی عیشقبازیی خانزادەوە زۆرن. هەر بەگوێرەی چیرۆکی زارگوتی خەڵکی ئەو ناوچەیە، دەڵێن: شەوێک خانزادە خاتوون بەناو شاردا گەڕاوە و لە پەنا دیواری حوجرەی مزگەوتێکدا گوێی لە ئاخاوتنی فەقێیان گرتووە. فەقێکەڵ هیوا و خواستی خۆیان بۆ یەکتر درکاندووە و یەکێکیان گوتوویەتی: هیوادەخوازم خانزاد ببێ بەهاوسەرم یان جارێک لەگەڵمدا بنوێ. چیرۆک دەڵێ: خانزاد بۆ بەیانی بەدوای فەقێیەکەیدا ناردووە و خۆی لێ مارە کردووە و کوڕێکیشی لێ بووە. ئەمانە قسەی دەماودەمی خەڵکن و نازانرێ چییان ڕاستن و چییان هەڵبەستن.

بەڵام هەبوونی ئەم چیرۆک و بەیتانە لە بارەی ئەویندارییی خانزادە خاتوونییی دۆتمیری سۆرانەوە، بابەتێکە جێی سەرنجدانە و نیشانەی بەڵادەستبوونی کچان و ژنانی بنەماڵەی سۆرانە لە هەندێک سەردەمدا. بۆیە دەشێ ئەوەی پەریزادیش لەگەڵ فەقێ عەلیدا ڕەگێکی ڕاستیی تێدا هەبێت. هەروەها دەشێ لە سەردەمانی دەسەڵاتی ئەو خاتوونەدا ئەو چیرۆکانە بەسەر زارانەوە بووبن و خانزاد و بنەماڵەکەیان گۆی بیستیان بووبنەوە.

وا لێرەدا دەقێکی تر لە شیعری فەقێ عەلی عاشق دەنووسمەوە، کە حوسێن حوزنی بڵاوی کردووەتەوە. حوزنی ئەوەش دەڵێ کەوا عەلی عاشق لە مودەی عومریدا ئەشعاری دڵسۆزانەی زۆر فەرمووە، ئەم چەند شیعرە لە فەرمایشاتی ئەو زاتەیە:

**ئەسیری میحنەتی هیجرانی تۆم، یاری وەفاکارم**
**کوژراوی خەنجەری موژگانی تۆم، مەحبووبی نازدارم**
**عیلاجێکم بکە دەردم گرانە، قیبلەکەی دینم**
**بکە ڕەحمێ بەفرمێسکی دڵتۆبی چاوی خەمبارم**
**فیدای لەعلی لەبت بم، بێنە یادت شەرتەکەی جاران**
**نەوەک عومرم بەناکامی بڕوا[9] غولامێکی ئەمەگدارم**
**مەلا و زاهید و سۆفی، غەریقی بەحری عیشقی تۆن**
**بزانە من لە ئەم حاڵە، چ ئوستادێکی هۆشیارم**
**نەخۆشێکم بەبێ دیداری تۆ، یار شیفا نابێ**
**مەگەر عیسای مریەم بێ، بکا دەرمانی ئازارم**
**عەلی هەتاوەکو دەمرێ ئینتیزاری قامەتی یارە**
**لە نێو عیشقت قوتار نابێ هەتا خۆی بێ بەغەمخوارم**

لە "پاشکۆی عێراق"یشدا دەقێکی تر هەیە مامۆستا

محەمەد عەلی قەرەداغی بلاوی کردووەتەوە، بەلام دەقەکە دوور و درێژە، وا لێرەدا چەند کۆپلەیەکی کەمی لێ وەردەگرین:

**چەند شەوان مەجنوون و مەستم، شیبهەتی پەروانەیە**
**دائیما مەی هەر بەدەستم، چون کچی باغی خوەیە**
**چون کچن چەنگاڵ بەدەستن، بولبولان سەرخۆش و مەستن**
**هیندییان میصری بەدەستن، ژین لە من بێ فایدەیە**
**تاڵ دەبوون وەقت و زەمانە، سوورگولان پەرژین رەحانە**
**هەر کەسێ بێن کا ئەوانە، سەرخۆش و دێوانەیە**

تا لە کۆتاییدا:

**ئەی حەریری هەر دەبێژی، عاشقی سەودا و گێژی**
**بێ برین خوێنێ دەرێژی، هەر شەوە تا سوبحەیە**

ئەمانە نموونەی شیعری عەلی عاشقن بەئاخاوتنی ناوچەی موکریان کە هیچ رێی تێ ناچێ هەمان ئەو کەسە دانەری ئەو شیعرانە بێ بۆ عەلی حەریری تۆمارکراون بەزاراوەی کرمانجیی سەروو. ئەم شیعرانە هەموو نیشانەی ئەوەن، کە جیاوازییەکی زۆر لە نێوانی عەلی عاشق و عەلی حەریریدا هەیە. وەک لەم شیعرەی دواییدا دەردەکەوێ، رەنگە ئەم عەلییەش جاربەجار نازناوی حەریری لە پاڵ عاشقدا بەکار هێنابێ لەبەرئەوەی ئەویش لە حەریردا ژیاوە و شانازی بەم هەوارگەیەوە کردووە یان ئەوانەی شیعرەکانیان نووسیوەتەوە هۆی تێکەڵ پێکەڵییەکە بن وەک لەپێشەوە گوتمان. دەبێ ئەوەش بڵێین، لەبەرئەوەی ئەم شیعرانەی عەلی عاشق دەماودەم پارێزراون و کەم نووسراونەتەوە، رەنگە بەر دەسکاری کەوتبن و بۆیان زیاد و کەم و کرابێ، یان شێوەی زمانەکەیان گۆڕابێ، بۆیە لە رووی زمان و دەقەوە زۆر جێی متمانە نین.

لە کۆتاییدا، دەمەوێ تێبینییەکی تریش لە بارەی شیعری پەریزادێوە بڵێم، ئەویش ئەوەیە: دەقێکی تری ئەم شیعرە هەیە کە بەکرمانجیی سەروو نووسراوەتەوە. ئەم دەقەی دوایی، ئاڵۆزیی نێوان عەلی حەریری و عەلی عاشقی زیاتر کردووە. وەک بینیمان دەقە موکریانییەکە دراوەتە پاڵ عەلی عاشق، بەلام کرمانجییەکە دراوەتە پاڵ عەلی حەریری.

هەروەک پێشتر ئاماژەم بۆ کرد، شیعری عەلی حەریری ئەگەر نووسەرەوەکەی خەڵکی بەری رۆژهەلاتی زێی بادینان بووبێ کاریگەریی دیالەکتی کرمانجیی خواروی چووەتە سەر، بەلام ئەگەر لە بەری رۆژئاوا بووبێ ئەوا کاریگەریی شێوەزاری بادینانیی خراوەتە سەر. بۆ بەڵگەی ئەمەی دوایی، خوێنەر دەتوانێ سەیری ئەو دەقانە بکات کە سادق بەهائەدین ئامێدی لە کتێبی هۆزانڤانێت کورددا پێشکێشی کردوون و بەراوردیان بکات لەگەڵ دەقەکانی تردا. سەرنج ڕاکێش ئەوەیە شیعری: پەریزادێ بەخێر هاتیی عەلی عاشقیش بەدەردی شیعرەکانی عەلی حەریری چووە و بگرە زیاتریش. وەک گوتمان لەبەرئەوەی عەلی عاشق و عەلی حەریری بەیەک کراون لە دەستنووسە کۆنەکاندا، هەندێک نووسەرەوەی بەری بادینان هەڵساون بەگۆڕینی دەقەکەی عەلی عاشق لە موکریانییەوە بۆ بادینی و داویانەتە پاڵ عەلی حەریری.

ئەگەر مرۆڤ سەیری ئەو چەند شیعرەی عەلی حەریری بکات کە نووسیمانەوە، دەبینێ لە رووی زمان و داڕشتنەوە چەند جیاوازن لە شیعری پەریزادێ، واتە ئەو دەقەی بەکرمانجیی سەروو و دراوەتە پاڵ عەلی حەریری. عەلی عاشق وەک گوتمان فەقێ بووە و شیعرەکانی کەمتر جێ پەنجەی رۆشنبیرییەکی هەڵکشاویان بەسەرەوەیە، زیاتری وشەکانی خۆماڵیی ناوچەی موکریان و هەریرن و لە کوردیی پەتی بەیتی شایەران دەچن، کە کتێبی بەناوبانگی فۆلکلۆریی توحفە موزەفەرییەی ئۆسکارمان پڕە لە نموونەی ئەمانە.

ئەمە شێوەی دەقە بادینییەکەیە، کە لە کتێبی هۆزانڤانێت کورددوەم راگواستووە:

**پەریزادە تو وا هاتی**
**لسەر چاڤێن دمن شالا**
**مە لەو زانی تو وا هاتی**
**ژ دەنگێ تەوق و خرخالا**
**ژ دەنگێ بازن و زەندا**
**ئەما عەقلێ عەقلەمەندا**
**هندی من گوت سی و چەندا**
**تو چێتر بوی ژ هەڤالا**
**تو چێتر بوی ژ لەیلایێ**

شرینتر بووی ژ زولەیخایێ
مەم و زینێ هەر دو یەک تایێ
سیا زولفێ کرم تالا
سیا زولفێ تو ناترسی
ژ ئەحوالێ مە ناپرسی
مبارک بیت تە ئەو کورسی
تو روینێ گوهـ بدە عەبدالا
تو روینێ گوهـ بدە بەیتێ
لپێشی تو وەکی زەیتێ
دسوژیت مەجلسا مەی تێ
وەکی پویشێ لکەندالا
وەکی تە ڤنووس بێ پەروابم
دخوەم سوندێ جودا نابم
حەزینم ئەز قەت تێر نابم
ژ دیدارا خەت و خالا
لدیدارا تە ئەز زینکەم
حەتا کەنگێ روح تێ تەنکەم
کەسەر بوم جارەکێ بێن کەم
خودانا تیت و دەستمالا
خودانا تیت و جەبهەت بی
خەراج و ئەرد و قیمەت بی
دیدارا تە بقیمەت بی
لعید و جەژن و سەرسالا
ئەول کار و کەسێ من توی
یەقین فرنا دەرسێ من توی
کەسێ من و بەسێ من توی
لزێر و مال و پر نالا
لزێر و مال و پر رەنجم
کەسادم صاحبم گەنجم
لبازێرا گەوهەر سەنجم
سەفەر دویرە هەتا مالا
سەفەر دوورە شەبێ تاری
ئەی عەلی و تو پر رایی
دابکەین زیکرێ جەباری
بەلکی لە خوشبت شالا

له کۆتاییدا، هیوادارم بەم نووسینە توانیبێتم چینێکم له چینگەلی فره و ئەستووری دەوراندەوری عەلی حەریری رەواندبێتەوە و خزمەتێکم پێشکێش کردبێ.

**پەراوێز:**

(١) لەم بارەیەوە سەیری سێ بەرگی کتێبی حاجی قادری کۆیی بکە لە دانانی مەسعوود محەمەد، لەوێدا ببینە نووسەر لە ئەنجامی نەبوونی زانیارییەوە بە چ چنگەرنێیەک هەوڵ دەدا لە هەورازی ناسینەوەی ژیانی حاجی و کێشەکانی ئەو دەمی کۆمەڵگەی کوردەوارییەوە سەر بکەوێ، زۆربەی جاریش بەدەستی خاڵی لێی دەچێتە دەر.

(٢) ناوی ئەم کتێبە: ئۆسمانی موودەلیفەری-یە، دانانی بورسالی محەمەد تاهیر ئەفەندی. دانەر ساڵی ١٨٦١ لە شاری بورسە لە دایک بووە و ساڵی ١٩٢٤ لە ئەستەنبۆڵ مردووە. کتێبەکە ساڵی ١٩٠٥ بۆ جاری یەکەم چاپ کراوە و ساڵی ١٩٧٢ بۆ جاری دووەم لە ئەستەنبۆڵ بەپیتی لاتینی چاپ کراوەتەوە. دانەر باسی گەلێک لە شاعیر و رۆشنبیرانی کوردی کردووە، بۆ نموونە لە لاپەڕە ٢٨٤ی بەرگی دووەمدا، لە بارەی نالییەوە دەڵێ: ساڵی ١٨٧٣ لە ئەستەنبۆڵ مردووە و لە گۆڕستانی قەرەجە ئەحمەد نێژراوە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: کۆڕاوی وان، ژمارە: ٢ ساڵی ١٩٩٢ وتارێک لەلایەن مەحموود لەوەندییەوە لەبارەی نالی لەو کتێبەدا.

(٣) ئەم شیعرە بۆ جاری یەکەم عەبدوڕەقیب یوسف بڵاوی کردووەتەوە. بڕوانە: دیوانا کرمانجی، ساڵی ١٩٧٠ و محەمەد عەلی قەرەداغیش لە ساڵی ١٩٩٤دا لە کۆواری رۆشنبیری نوێ ژمارە ١٣٤دا هەمان شیعری بڵاوکردووەتەوە و چەند کۆپلەیەکی زیادەی خستووەتە سەر.

(٤) ئەم پارچەیە تەنیا محەمەد عەلی قەرەداغی بڵاوی کردووەتەوە. بڕوانە سەرچاوەی پێشوو. تێبینی: م. قەرەداغی دەقی دەستنووسەکانی وەک خۆیان روونووس کردووە و من بەگوێرەی توانا هێناومەتە سەر رێنووسی نوێی کوردی. هەڵبەت زۆر جێگە هەن لێکۆڵینەوەی زیاتریان دەوێت تا دەقەکە رێنووسێکی

ڕێکوپێک وەربگرێت.

(٥) ئەم جۆرە دەربڕینانە: ئەگەر روحم دكن غارەت، یان لە شیعرەکانی دواتردا: سەد روح و جانم بن فیدا، یان: مەمسوژە دل، هەروەها زۆری تریش لە شیعری عەلی حەریریدا، دەربڕینی زاراوەی کرمانجیی خواروون. نازانرێ ئەمە کاری خۆی بووە یان دەسکاری نووسەرەوەی شیعرەکان بووە.

(٦) ئەم شیعرە عەبدوڕەقیب یووسف و محەمەد عەلی قەرەداغی هەردووکیان بلاویان کردووەتەوە. بڕوانە سەرچاوەکانی پێشوو.

(٧) ئەم شیعرە تەنیا محەمەد عەلی قەرەداغی بلاوی کردوەتەوە. بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

(٨) ئەم شیعرە محەمەد عەلی قەرەداغی بلاوی کردووەتەوە. بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە. بەرگی سێیەم. بەغدا ٢٠٠٠ لاپەڕە ٣٦٠-٣٦١.

(٩) ئەم وشەیە (بڕوا) شوێنەکەی چۆڵ بوو، من دامناوە.

**سەرچاوە:**

(١) اربیل في أدوارها التاریخیة، زبیر بلال اسماعیل، بغداد، ١٩٧١

(٢) کۆواری زاری کرمانجی، مێژووی میرانی سۆران، حوسێن حوزنی موکریانی، ڕەواندز ١٩٢٧ ـ ١٩٣٢

(٣) دیوانا کرمانجی، بەرهەڤ هینانا: عەبدوڕەقیب یووسف. نەجەف، ١٩٧١

(٤) بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە، بەرگی دووەم، دانراوی: محەمەد عەلی قەرەداغی، بەغدا ١٩٩٩

(٥) بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە، بەرگی سێیەم، دانراوی: محەمەد عەلی قەرەداغی، بەغدا ٢٠٠٠

(٦) مێژووی ئەدەبی کوردی، عەلائەدین سەجادی، بەغدا ١٩٧١

(٧) مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی دووەم، د. مارف خەزنەدار، هەولێر ٢٠٠٢

(٨) هۆزانڤانێت کورد، دانان و تویژاندنا: سادق بەهائەدین ئامێدی. بەغدا ١٩٨٠

(٩) نورالدین عبدالرحمن جامی، علی اصغر حکمت، ١٣٦٣ تهران.

(١٠) دەفتەری کوردەواری، بەرگی یەکەم، بەغدا ١٩٧٠ وتارێک بەناونیشانی: عەلی هەریری، د. عیزەدین مستەفا.

(١١) دەفتەری کوردەواری، بەرگی سێیەم، بەغدا ١٩٧٠ وتارێک بەناونیشانی: هۆزانڤانێ کلاسیکیێ بناڤ و دەنگ عەلی حەریری، سادق بەهائەدین ئامێدی.

(١٢) پاشکۆی ڕۆژنامەی عێراق، ژمارە ٣٧ حوزەیران و تەمووزی ١٩٨٠ وتارێک بەناونیشانی: لەبارەی سەرگوزەشتی عەلی عاشقەوە، محەمەد قادر ئەحمەد (کزەڵ).

(١٣) کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی، بەرگی یەکەم، محەمەد عەلی قەرەداغی. بەغدا، ١٩٨٠.

(١٤) پاشکۆی ڕۆژنامەی عێراق، ژمارە ٣٤ شوباتی ١٩٨٠ وتارێک بەناونیشانی: عەلی عاشق و عەلی حەریری و ئاسۆیەکی ڕووناکتر، محەمەد عەلی قەرەداغی.

(١٥) کۆواری ڕووناکی، ژمارە ٨ ساڵی ١٩٣٦ هەولێر، بابەتێک بەناونیشانی: عەلی بەردەشانی شایەری کورد.

(١٦) الجامع في تاریخ الادب العربي، الجزء الاول، حنا الفاخوري.

(١٧) شەرەفنامە. وەرگێرانی هەژار.

(١٨) خانزاد و لەشکری. محەمەد تۆفیق وردی. بەغدا ١٩٦٠.

(١٩) کۆواری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کورد. بەرگی ١٨ و ١٩. ساڵی ١٩٨٨ بەغدا، بەیتی لاس و خەزاڵ، بەشی یەکەم.

(٢٠) کۆواری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کورد. بەرگی ٢٠، ساڵی ١٩٨٩ بەغدا، بەیتی لاس و خەزاڵ، بەشی دووەم.

* سەرۆکی دەزگای ئاراس.

# فەرهەنگۆکەی بنزارەکانی هەولێر

عەبدولڕەحمان مەعروف

**وتەیەکی پێویست:**

ئەم کارەی مامۆستا (عەبدولڕەحمان مەعروف) کارێکی جوانە و بەشێک لەم وشە و ناوانەی خستووەتە بەردەست، کە لە شێوەزاری هەولێر بەگشتی بەکاردێن، شێوەزاری هەولێر بەشێکە لە شێوەزاری ئەوەی، کە پێی دەگوترێ (سۆرانی) دەکرێ یان راستتر ئەوەیە بەناوی (کرمانجی ناوەڕاست) ناوببرێ، ئەوەی جێگای سەرنجە، شێوەزاری هەولێر لە چەندین (بنزار) پێک هاتووە و هەموویان لەبۆتەی شێوەزارە سەرەکییەکەی (کرمانجی ناوەڕاست) دراون و تایبەتمەندی ئەم زاراوەیان وەرگرتووە، دەنا جوگرافیای پارێزگای هەولێر ئێستاش شوێنەواری زۆر شێوەزاری تری پێوە دیارە، بۆ نموونە: لە گوندەکانی سەر بەکۆیە، گوندەکانی (ئۆمەر گومبەت و کانیلەلەو سێگرتکان) بە شێوەزاری لوڕی دەدوێن، دیسان چەند گوندێک لە مرکەی دەشتی هەولێر ئەوانیش شێوە ئاخافتنیان لەک و لوڕییە، لە ناوچەی سەرووی هەولێر بەرەو شێوەزاری کرمانجی دەچێ. ناوچەی بارزان و دەوروبەری، رۆژئاوای هەولێر- ناوچەی بەڕانەتی- ئەویش بەرەو کرمانجی دەچێ، جگە لە ناوچەی خۆشناوەتی، کە بنزارێکی تایبەتە، هێندە هەیە، کەندێناوە و قەراج، تایبەتمەندییەکی (سۆرانی) هەیە و درێژ بووەتەوە تا دەگاتە موکریان، لەگەڵ کەمێک گۆڕان، بەڵام شێوەزاری هەولێر بە تایبەتمەندی جێگۆڕکێی (ل بۆ ر)، کە ئەمەش لە ئاوێستا و زمانی سۆمەریش بەرچاو دەکەوێ، تایبەتمەندی ئەم جێگۆڕکێیەی بەسەر زار و بنزارەکانی جوگرافیای هەولێردا زاڵ بووە، دەنا هەر لەم فەرهەنگۆکەی (عەبدولڕەحمان) زۆر وشە هەن دەچنەوە سەر شێوەزارەکانی دیکە، بەڵام لەگەڵ شێوەزاری هەولێردا خۆیان گونجاندووە.

**د. مەولود ئیبراهیم حەسەن**

(ئـ)

* ئێراهێ = ئێرێهێ = ئەوێندەرێ: شوێنێک هەندێک لێتەوە دووربێت.
- وەرە بچینە ئێراهێ.
* ئەوێهێ: کەسێک کەمێک لێتەوە دووربێت.
- ئەوێهێ دەناسی.
* ئیوهایە: ئەوهایە: ئاوایە
- برادەرایەتی ئیوهایە؟
* ئۆدا: دایە: دا: لە کورتکردنەوەی بانگکردنی هۆدا، ئۆدا.
- ئۆدا کەنگێ هاتی؟
* ئاروو: خەیار
- کیلۆ ئارووەکم لۆ بکرە.
* ئەستوورک: ستوورک، پەپە، پەپۆلە، جاران لە کوردەواری کە بەیانیان نانیان دەکرد ئەنگوتکە هەویرەکەیان بە شێوەیەکی ئەستوورتر لەسەر سێر دەبرژاند و لەگەڵ بەرچایی دەیانخوارد. پێم وابێ ئەستوورک لە ئەستوور + ک (پاشگر) دروست بووە.
- ئەستوورکەکەم نەبرژایە.
* ئاقار: دەشت: زەوی و زاری گوند و ناوچەیەک.
- ئاقاری گوندێ مە لەو بستییەیرا دەست پێدەکا.
* ئاجەڕات: ئەژداد: باب و باپیران.
- ئاجەڕاتت دەرەقەتی من نایێ.
* ئەنگۆ: ئێوە
- ئەنگۆ لە کیهان بەردەبینە؟
* ئەنگوتک: گونک: گوندی: گوشک
- کچێ زارێ ئەنگوتکت بڕیوە؟
* ئیدی: ئیتر
- ئیدی وازم لێ بینە.
* ئەستێرک: هەرزاڵە: ئەو سندوق و شوێنەی نوێنی لەسەر

هەڵدەگیرێ.
- ئەو نوێنانە لەسەر ئەستێرکی دانێ.
* ئاوقەران: ئاوکوف: ئاوقوف.
- بووکەکەیان ئاوقەرانی خۆیتیان.
* ئاوزە: هاوتەمەن
- من و تۆ ئاوزەی یەکین.
* ئەوێندەر: وێندەر: ئەوێ
- ئەوێندەرت پێخۆشە؟

(ب)
* بەبارەبار: بەئاشکرا
- بەبارەبار غەدرمان لێ دەکا.
* بستی: بەرزایی
- لەو بستییەی بەسەرکەوین دەگەینە کانییەکی.
* بێ سەروبەر: شتی نارێک و بێ رێوجێ
- ئیشەکانی تور هەمووی بێ سەروبەرن.
* بەلەک پێچ: پوزەوانە
- بەلەک پێچێکی گەرمم کڕیوە.
* بیژی: زۆڵ: بۆ منداڵی زۆرزان و چاوکراوەش بەکاریێت.
- بیژییە کەس نازانێ کوڕی کێیە!
- زۆر بیژییە کەس لێی ناباتەوە.
* بالیف: سەرین: سەرینگان
- بالیفەکەی من تووکی مریشکە.
* بەکاوەخۆ: لەسەرخۆ
- بەکاوەخۆ دەڕۆیشت.
* باروو بوو: هاوکاری و یارمەتیدان
- باروو بووی ئازادی کرد.
* بن: ژێر
- لەبن دارسێوەکەی دانیشتبووین.
* باتۆ: گون
- باتۆم دێشی.
* بەرەدواژی: بەپێچەوانە (معکوس)، وەرگەڕاو
- ئەو گۆرییە (گۆرەوی)یەی بەرەواژی لەپێ کردییە.
* بەرەباب: نەوە
- بەرەبابی وان (ئەوان) لێرە نەمایە.
* باوی: بادەم
- قیچەک (نەختێک) باویم بدێ.

* بەرچینچکە: نزگرە
- ئاویشم خوارد بەرچینچکەکەم هەر چاک نەبوو.
* بەست: چەم
- لەو بەستەی ئاوی لێیە.
- گەڕەکێکیش لە هەولێر بەناوی (بەستەپیازە) هەیە.
* بەرِک: گیرفان، بەری
- ئەو کراسە بەرکی نییە.
* بەهەشتاوی: بەپەلە
- بەهەشتاوی هاتە ژوورێ.
* بوز: سەهۆڵ: بەفر،وەفر (ئاوی بەستوو)
- دوو کێلە بوزان بکرە.
* بەربوونەوە: کەوتن
- منداڵەکە لەسەربانی بەربۆوە.
* بەربەسێر: بەرخ بەسێر
- لەو سەیرانەی بەربەسێرمان کردبوو.
* بەهەرمێن: بەبرشت
- ئەو گەنمە بەهەرمێنە.
* بنەبان: لای بنەوە و ئەوسەری دیوەخان و ژوور و ماڵ.
- برۆ هەڵکشێ بنەبانێ.
- خەسرۆ لەلای بنەبانێ دانیشتییە.
* بەدووکەتن: رەدووکەوتن
- خەتای باوکی بوو کیژەکەی بەدووکەت.
* بەرشەق: قەدبڕ و یەکڕاست
- بەرشەق بەرەو گوندی رۆیشتم.
* برێشکە: برژاندنی تۆ گندۆرە و دانەوێڵە
- داکم برێشکەکی زۆر بەتامی لۆ کردین.
* بەڕادان: بەدووریندانی جلک و بەرگ لای بەرگدروو
- کورتەک و شەلوارەکم بەڕادان دا.
* باژێڕ: بازار
- کەنگێ دەچییە باژێڕی؟
* بەرین: فراوان: والآ
- ئەو قوماشە بەری بەرینە.
- رێیەکە بەرینە.
* بریار: برشت: وەبەرهێنان
- ئەو ساڵ گەنم هیچ بریاری نەبوو.
- جۆیەکەتان یەک و چەندی بری؟
* بەرۆک: یەخە: سنگ و بەرۆک

- هەی بەردە بەردە بەردە دەبڕۆ بەرۆکم بەردە
* بەلەچەک: وشککراوەی گندۆرە (کاڵەک)
- ئەو ساڵ بەلەچەکمان نەکرد.
* بەبژار: بە هەڵبژاردن: مەبەست لە هەڵبژاردنی تەرە یان هەرشتێک کە دەیکڕی هەڵیبژێری.
- ئەو سێوە بە بژارە؟
* باگوردان: باگردێن
- ئەو ساڵ سەربانەکەم باگوردان ناکەم.
* بەرچیغ: ختورمە: مەترەق
- بەرچیغەکی لەناو شانی گیرکرد.

(پ)
* پت: تیل: پەنجە، پل.
- لەسەر پلم قسان مەکە. بەتایبەتی ئەمە لە یاری کەڵلایانێ (ماتانێ) بەکاردێت.
- پتی لێ دەی دەپەڕی.
* پێگۆڕ: لینگەوگۆڕ: تاکەوتاکی پێڵاو و سۆل لەپێ کردن
- ئەوە هەست ناکەی سۆلەکەت پێگۆڕە؟
* پێینگان: لای پێی کەسێکی درێژبوو، نووستوو، مردوو،....
- پەتووەکەم لای پێینگانی دانا.
* پارزنین: پاڵاوتنی چا و برنج و شتی لەم بابەتە.... (پارزوونگ)
- ئەو برنجە جوان بپارزنە.
* پارزوونگ: چای پاڵێو
- پارزوونگەکەت شووشت؟
* پێمەرە: بێڵ
- زەوییەکە رەقەڵانە ئەو ئیشە بە پێمەرەی ناکرێ.
* پێنجووکانێ: قەمچان یارییەکە بە پێنج بەردی چکۆڵە و هەڵدان و دەست دەکرێت.
- کێ پێنجووکانێم دەگە (لەگەڵ) دەکا.
* پازپازانێ: یاریکردن و پازدان لەسەر شتێک یان لە شوێنێکی دیاریکراو
- کوڕەکە لە پازپازانێ شەپکەی دەستی شکا.
* پۆقژە: پوقڵە، لە کاتی سووتان لەسەر پێست ولەشی مروڤ پوقڵە درووست دەکا.
* پەلیکانێ: هەلووکانێ: هەلووکێن
- ئەوان لەسەر جۆخینان پەلیکانێ دەکەن.
* پەلیک: چوست و چالاک و ئازا، جگە لەوەی بەو پارچە دارە دەڵێن، کە لە یاری پەلیکانێ بەکاردێ
- ئەو کوڕە گەنجە زۆر ئازایە دەڵێی پەلیکە.
* پاشەبەر: پاشەبەرە: دوا خێلان
- ئەو کوڕەمان پاشەبەرەیە.
* پرچ: قژ
- پرچی زۆر هاتییە.
* پارچەڵە: بۆ تەمەنی پێش هەرزەکاری کوڕ و کچ بەکاردێت.
- ئەوکاتە من پارچەڵە بووم.
* پەلەواژ: کەوتنە سەرپشت: مرداربوونەوە.
- منداڵەکە پەلەواژ بۆوە.
- پەلەواژی کردەوە.
* پەیت: مەیلەو توند: پەیت بووە: مەییە
- لەچاو شلان پەیتە.
* پلک: پوور
- پلکم مامۆستایە.
* پلە: جگە لەوەی بە مانای پوور دێت بۆ رێز لێنانی ئافرەتی بە تەمەنیش بەکاردێت.
- ئەورۆ پلە خەجێ کز دیارە.
* پل: پەنجە
- پلی بە تفەنگەکەوە نا، بەڵام چرووکی کرد.
* پشی: هەناسە
- پشی سوارە.
* پەرتبوون: پەرش و بڵاوبوون
- خەڵکی ئاوایی بەو ناوەی پەرتبوون.
* پەسیو: هەڵامەت
- کۆخە و پەسیومە.
* پەلک: گەڵای دار و درەخت، توێکڵ
- لە پایزان پەلکی دار دەوەرێت.
* پفهەڵمان: تووڕەبوون (پڕ با بوون)
- کارەسوڵ پفهەڵمابوو.
* پدوو: پووک
- پدووی بە خێن (خوێن) هات.
* پێکردن: داگیرسان، ئەمە بۆ داگیرساندنی ئاگر و گڵۆپ و پلاکی کارەبایی بەکاردێت.

- ئارام ئەم گلۆپە پێکە.
- ئەمن سۆبەکە پێدەکەم.
* پێکردن: تێهەڵێنانی نانەکە بە شلەو یان ئەو شتەی مەبەستە.
- نانەکەی بە ماست کە.
* پێشکە: مێشوولە
- ئەو ناوچە هیچ پێشکەی لێ نییە.
* پێ بوون: بەرۆژووبوون (داگیرسان)
- یەکێک دەپرسێ بە رۆژووی؟ لە وەڵامدا دەڵێ: پێم. یان ئەگەر بپرسێ دەڵێ: پێی؟
هەروەها بۆ ئاگر و گڵۆپیش بۆ نموونە دەپرسێ: سۆباکە پێیە؟
* پەڕەکەی ئاسمان: تاقی ئاسمان: کەشکەلانی فەلەک
- لەپەڕەکەی ئاسمانیش بی هەردەتگرم.
* پۆلیۆکە: خەناوکەی بچووک، کچان بەخۆوەی دەکەن.
- ئەو پۆلیۆکە جوانەت لە کێ (لەکوێ) بوو؟
* پەرگە: لاپەڕ
- ماڵمان لە پەرگەی گوندی بوو.
* پاشباب: سەرەخۆرە، منداڵێک کاتێ باوکی دەمرێ هێشتا لە سکی دایکێتی، واتە دوای مردنی باوکی دێتە دنیاوە.
- پاشبابە لۆیێ ئەوەندەیان نازداییتێ.
* پۆلی: پۆلوو: پەنگر: سکل
- ئاگات لەو پۆلییە ئاگرەی بی نەکوژێتەوە.

(ت)

* تیلک: پەنجە (بەتایبەتی پەنجەی شادە) خستنە ناو هەنگین و ماست و شتی لەمجۆرە
- بەتیلکان ئەو ماستە پیس مەکە.
- سێ تیلکە دۆشاوم خوارد.
* تورندی: پەرێوە
- حەفتەکە لێمان تورندی بووە.
* تەبارە: قایمە، گەنم وجۆ لەکاتی گوڵکردن بەر لە دوورینەوە.
- ئەو تەبارە گەنمە زۆر جوان هاتییە.
* تێکەولێکە: مامەڵەکردن
- تێکەولێکەی لەگەڵ بازرگانەکە هەیە.
* تریان: سەبەتەیەک بوو لە شێوەی سێنی و نانی مەزرەقە و رەقیان لەسەر دادەنا. بەزۆری لە شورکەبی (شورکی داربی) دروست دەکرا.
- کاتی خۆی لەباتی سێنی تریانیان بەکاردێنا.
* تەندوورە سۆرێ: یارێکە منداڵان بە شێوەی بازنەیەک سەریان بە سەری یەکدی دەکرد و دەستی یەکیان دەگرت، یەکێکیش خۆی هەڵدەدا سەریان.
- ئەوکاتەی گەنج بووم زۆر جار یاری تەندوورە سۆرێم کردووە.
* تیلکە مەسووسانێ: یارییەکی منداڵان و هەرزەکارانە، کە بە پەڕۆ یان شتێک چاوی یەکێک دەبەستنەوە و ئەوانی دیکە تیلکی پێوە دەکەن، ئەگەر ئەو کەسەی چاوی بەستراوە هەرکەسێک بگرێ ئیدی نۆرەی ئەوە چاوی ببەستنەوە.
- تیلکە مەسووسانێ مەکەن، جوان نییە.
* تێ ترەقاندن: راکردن و هەڵاتن
- نامەرد بوو تێی ترەقاند و هەڵات.
* تەوازۆ: پۆزش هێنانەوە و داوای لێبووردن کردن
- نەمزانی بوو دایکی مردییە تەوازۆم لێ خواستەوە.
* تەگە: لێرەدا مەبەستم نێرەی بزن نییە، بەڵکو لە هەندێ ناوچەی سەرووی هەولێر بە مانای (لەگەڵ)یش بەکاردێ تەگە: (تەگەر = دەگەڵ)
- تەگەرە توومە راوەستە
- لەگەڵ تۆمە راوەستە.
- تەگە من دێی؟
* تخوب: سنوور: کەوشەن
- لەگەڵ گوندی شێراوەی تخوبمان لەسەریەکە.
* توزبی: چوزبی: تەسبێح
- ئەو چوزبیەت لە کوێ بوو؟
* تەنگە: کەلەکە
- مستەکی لە تەنگەی دا.
* تریقە: گازەرە: لەسەرپشت (بڕ بڕەی پشت)
- لەسەر تریقەی پشتێ راکشابوو.
* تەبەش: روومەت و دەموچاو
- سەر و تەبەشەکی جوانی هەیە.
* تەڕادانێ: غارغارانێ: قۆشمەکردن
- ئەوە دەمەکە بە ئەسپی تەڕادانێ (غارغارانێ) دەکەن.

* تۆپ: مستەک (مشتەک) یان لەپێک قوڕ و گێچ و چیمەنتۆ
- تۆپەک گێچ (گەچ)م بدێ.
* تەبا: ئەم وشەیە جگە لەوەی بە مانای بەیەکەوە هەڵکردن دێت، ناتەباییش: ناکۆکی دەگەیەنێت. بەڵام لە هەولێر مانای بەیەکەوەو لەگەڵیش دەبەخشێت.
- ئەمنیش تەبای خەڵکی.
* تیتلەسماقە: یارییەکە لە کوردەواری منداڵان بە شێوەی بازنەیەکی نیمچە خڕ بە دەوری یەک دەسووڕانەوە....
- هەنکەش (ئێستاش) لە بیرمە لەگەڵ برادەرەکانم گەمەی تیتلەسماقانێمان دەکرد.
* تۆتکە: ئۆقرە
- ئەوە لۆ لە شوێنی خۆت تۆتکە ناگری؟
* تومەز: وەک بڵێی
- تومەز زۆروەڕ بوو کەس خۆشی نەدەویست.
* تۆپانێ: تۆپ تۆپێن، یاری فوتبال: هۆل هۆلانێ.
- وەرەن تۆپانێ بکەین.
* تۆ: تۆوی گوڵەبەرۆژە، بەتۆو دەغل و دانیش دەڵێن تۆ
- نیو کیلۆ تۆی بکڕە.
- چووینە تۆدانێ.
* تەنێ: تەنیا: بە تەنیا، لە هەولێر (تەن بەتەن)یش دەگوترێت.
- بە تەنێ لە مارێمە (ماڵێمە).
- تەن بەتەن وەرە مەیدانێ.
* تزۆکێ: چزوکێ: چوزەکێ: هەنگلەشەلێ: لەسەرییەک پێ ڕۆیشتن بە شێوەی پازدان، کە منداڵان زۆرجار لە شێوەی پێشبڕکێ و یاری دەیکەن.
- لە تزۆکێ کەس لە من ناباتەوە!
* تێکچەقی: تێکسمراو: لە چاوگی تێکچەقینەوە وەرگیراوە، کەوا کەسێکی دارژاو و پتەوە.
- پیاوێکی چوارشانەی تێکچەقییە.

(ج)

* جەڕباندن: تاقیکردنەوە، ئەم وشەیە لە (تجربە)ی عەرەبی وەرگیراوە و کوردێنراوە، بەهۆی (اندن)وە بووە بەکارێکی تێپەڕ.
- ئەمن ئەو ترۆمبێلەم نەجەڕباندییە.
* جوایەز: جیاواز
- بەڕکیان جوایەزە.
* جۆخین: خەرمان (جێگایەکی خۆشکراوە و خەرمانی گەنم و جۆی تێدا کۆدەکرێتەوە و دەکوترێ).
- با بچین لەسەر جۆخینان قاشوانێ بکەین.
* جمک: دوانە: دوو منداڵ بەیەک سک بووبن
- ئازاد و نەوزاد جمکن.
- زگی یەکجار گەورەیە وا بزانم جمکی پێیە!
* جۆڕک: هەگبە: توورەگە: کەشکۆڵ
- جۆڕکەکی لەگەڵ خۆت ببە.

(چ)

* چێڵ: مانگا
- چێڵەکەی لەبەر گوندی راتەوراند.
* چۆک: ئەژنۆ
- چۆکم دێشی.
* چێشتان: چێشتەنگاو
- ئەوە چێشتانە تازە دەڕۆی.
* چار: چوار
- چار دەرکە (دەرگا)ی باشم بۆ دروست بکە.
* چارەگ: لەچوار بەشان بەشێک
- چارێگەکم لۆ بکێشە.
* چما: بۆچی
- چما هاتی؟
* چەلاو: ئاوی گۆشتی
- چەلاوخۆرە (ئەمەیان بە کەسێکی نۆکەر و ماستاوچی دەگوترێ).
* چیدیکە: چیتر
- چیدیکە بڕوای پێناکەم.
* چاوشارکانێ: (چاوشلکانێ): چەمەشارکێ: یارییەکە منداڵان بەدوو دەستە دەیکەن، دەستەیەک چاوی خۆیان دەگرن و دەستەکەی دیکە خۆیان دەشارنەوە، دواتر بەدوایاندا دەگەڕێن.
- چەندم پێ گۆتن چاوشارکانێی لەگەڵ مەکەن.
* چەقێن: زەوییەکی ڕەق و بێ کەڵکی چاندن
- با لەو چەقێنەی دانیشین.
- دایەوە چەقێنێ.( پەندێکی کوردییە)

* چەمبەری: کەسێکی کردەوە نارێک
- پیاوەکی چەمبەرییە حەزی لێناکەم.

(ح)
* حندرحۆپ: یارییەکی منداڵانە و دووکەس دەیکەن، هەریەکە و لەسەر لایەکی دارێک یان ئاسنێکی درێژ دادەنیشن و یەکدی بەرزدەکەنەوە. پێم وابێ لە (up ، under)ی ئینگلیزی وەرگیراوە.
- حندرحۆپانێ ناکەی؟
* حەجمان: ئۆقرە
- حەجمانی نەبوو.
- ئەوە لۆ ناحەجمێی؟

(خ)
* خوریکە: ئاوڵە
- کورەکەم خوریکەی لێ نەهاتییە.
* خەو لێ هەڕمان: خەو لێ زڕان
- ئەوشۆ خەوم لێ هەڕرمابوو.
* خەنانێ: ساپ ساپانێ: یارییەکە بە تایبەتی کچان دەیکەن
- لە خەنانێ دووجار لە شنۆم بردەوە.
* خۆرخۆرۆکانێ: خۆر: خۆل، کاتێ منداڵ بە خۆڵ گەمان بکەن.
- خۆخۆرۆکانێ مەکەن چاوتان کول دەبێ.
* ختورمە: بەرچیغ: مەترەق
- بە مەترەقان مارکوژم کرد.
* خاپەرۆک: بنەبنە: خاکەرۆ: پاشماوە و بنەبنەی دەغل و دان، بۆ پاشماوەی زۆر شتی دیکەش بەکار دێت
- خاپەرۆکەکەم لۆ چییە؟
* خۆرەپۆک: خۆڵەپەتانێ
- ئەو رێیە لەبن پێی وڵاخان بوویتە خۆڵەپۆک.
* خشخشۆکە: یارییەکی منداڵانە لە شوێنێکی هەندێک بەرز بەرەو خوارێ خۆیان، دەخشاند، ئێستا لە شاری یارییەکان بەجۆری جیاواز هەیە.
- هەنووکەش حەزم لە خشخشۆکانێیە.
* خنخنۆکە: قورگ: هەوگ: (ئەوگ)
- دەستی لە خنخنۆکەی نابوو.

* خوچە: بۆ رێزلێنان لە خوشک و بەتایبەتی خوشکی گەورە بەکاردێت
- خوچە بنوو خەمی منت نەبێ.
* خلیسکانێ: خزیلێ: یاریکردن لەسەر بەفر وشوێنی تەڕ.
- لە خلیسکانێ بەربۆوە دەستی شکا.
* خەوە کوتکە: خەوە نوچکە
- زۆری خەو دێ خەوە کوتکەی دەباتەوە.
* خۆدانووساندن: داونانەوە و خۆحەشاردان
- لە پەنا غەرەکی خۆی دانووساندبوو.
* خەناوکە: ملوانکە
- خەناوکەکی زێرِم دەوێ.
* خین: خوێن
- چەقووی لێدەی خینی لێ نایێ.
* خورێنی: ناشتا
- لە خورێنی بەرداخێک ئاو بخۆ.
* خەلانە: لەبن ئەستێرک و هەرزاڵە شوێنیان بۆ زەخیرداکردن و هەڵگرتن دروست دەکرد.
- بن خەلانە هیچی لێ نییە.

(د)
* دنک: قل: دانە، دەنک
- ئەو تەسبێحە چەند دنکە؟
- دنکی هەنارەکە سۆر (سوور) نییە.
* داو: دەزوو
- داوی چ رەنگت دەوێ؟
- قوشقاقزەکە (کۆلارەکە) داوی زیاتری دەوێ.
* دەنا: ئەگەرنا: ئەگینا
- نەمزانی وا قرچۆکە (زۆر رەزیل)ە، دەنا قسەی خۆم دەکرد.
* دادێ: داهاتوو
- ساڵی دادێ کتێبەکەم چاپ دەکەم.
* دەردەقەت: دەرۆست
- بەزۆرانێ دەردەقەتی من نایێ.
* دەبتێ: دەبێت بە
- ئەو هەویرە دەبتە نان؟
* دێنکێ: سەیرکە، تەماشاکە (لەنێو زرارییان)
- دێنکە ئەو شاخەی.

* دزیاری: شتێک دزرابێ
- ئەو ئۆتۆمبێلە دزیارییە.
* دانی ئێوارە: تاقی ئێوارە
- دانی ئێوارە دێمە لات.
* دەو: دەم
- دەوت بکەوە.
* دژوون: پیس و چڵکن
- زۆر دژوونم مانگێکە خۆم نەشووشتییە.
* دەندە: پەراسوو (پیل و پەراسوو دەندەش) قەساب وا دەڵێن
- لەسەر دارەکەی بەربۆوە دوو دەندەی شکا.
* دانەوەرینەوە: ئۆقرە نەگرتن
- تێناگەم ئەم کوڕە بۆ داناوەرێتەوە!
* دوڕ: ناو: ناوی ناوەوە. لەدوڕنان: لەناونان
- خۆی لەدوڕ ژۆرێ نایە.
- لەدوڕ.....ت بەم.
* داکۆنی: کەسێک زۆر هۆگری دایکی بێت
- مندالەکی داکۆنییە.
* دەرکە: دەرگا
- دەرکەی خۆت باش بگرە سەگی خەرک (خەڵک)ی بەدز دەرمەینە.
* دۆخین: بەنەخوێن
- دۆخینی باشی هەیە.
* داخوا: ئاخۆ
- داخوا تەواوت کردییە!
* دیکە: دی: ئیتر
- نانی دیکەت ناوێ؟
* دووگرد: بەرماڵ
- دووگردی لە عاسمانێ دەسوڕێ. (پەندی کوردی)
* داندۆک: لە ساوار دروست دەکرێت.
- زۆرم حەز لە خواردنی داندۆکە.
* دەگەنێ: پێدەگەن
- یارێکی تازە هەڵدەگرم لەو کچانەی تازە دەگەنێ. (شیعری فۆلکلۆری)
* درنە: ورک: گرناگە
- درنەی زۆر پیسە بەکەس رازی ناکرێ.
* دۆغەوا: کفتە بەدۆ و پیاز و... جۆرە خواردنێکی کوردەوارییە زیاتر لە بەهاران دەکرێت.
- ئەوە نێرینەی بوارێیە دۆغەوایەکمان نەخوارد.
* دەرسەک: ئەو دارەی نەجاڕ لەکاتی بەستنی داری خانوو بۆ سەرگرتنی بە کاری دێنێ.
- ئەو دەرسەکانە بگۆزەوە.
* دارو دەرسەک: دار و پەردوو
- ئەو دار و دەرسەکەی خانووەکەتان کێ کری؟
* دەبدەبە: میزەڵان
- دەبدەبەکەی منیشی تەقاند.
* دەرۆزەکەر: سوالکەر
- ئەورۆ (ئەمرۆ) دەرۆزەکەرەکە گوراحی خۆش نەبوو.
* دبوسی: بێ حەیا و بێ شەرم
- دانیشە دبوسی.
* دەودەوانێ: قرەقر: دەولەدەونان: مشتومڕ
- چ دەو دەوانێتانە؟
- دەوی لە دەوی مەنێ منداڵێکی زمان پیسە.
* دووجێ: دووبەش: ئەم وشەیە لە هەولێر زۆرباوە، لەکاتی کرینی تەڕە و میوە و شتی لەو جۆرە، دەڵێ بەدووجێ یان بە سێ جێ بۆمی دانێ.
- چوار کیلۆ ترێم بۆ بکێشە، بەڵام بەدووجێ بۆمی دانێ

(ر)
* ردێن: ریش
- ردێنی ماش و برنج بووە.
* رەژوو: خەڵووز
- حەفت (حەوت) فەردە (گونیە) رەژووان بکڕە.
* راجفرین: راچڵەکین: لە خەوراپەڕین
- لە خەوێ راجفری.
* ریخەڵۆک: ریخۆڵە
- ژانی ریخەڵۆکە کۆرەی دیارە.
* روولک: دار ژاڵە
- با بچینە بن سێبەری ئەو دار روولکەی.

(ز)
* زڕداک: باوەژن
* زڕ باب: باوە پیاو
- هەر زڕ داکم نییە، بابیشم زڕ بابە.

* زەنگەزۆرە: زەنگەسوورە، زەردەواڵە
- ئاگات لە خۆت بی زەنگەزۆرە پێتوەنەدا.
* زار: دەم
- مەمکی لە زاری منداڵەکەی ناوە.
- پڕ بە زاریتی.
* زارک: دەرک، ئەم وشەیە لە چەند شوێنێک بەکاردێت.
- مەڕەکان لە زارکی گەلینە.
- شوانەکە لە زار گەلییە.
- زاری ئەو جەواڵە ببەستە.
- زارکی گرێدە.
* زەنگ: زەند: مەچەک
- زەنگەی زۆر باریکە.
- کەریم زەندەی ستی گرت
ئاوای کـــــرد لە دیواری. شیعری فۆلکلۆری
* زۆرانێ: زۆرانبازی: یەک بە زەوی دادان
- لە زۆرانێکە مـن بـردمـــــەوە، بەران (بەڵام) دوونـێـکە (دوێنێ) دۆڕاندم.
* زاک و ماک: کار و بەرخ لەگەڵ مەڕ و بزن، واتە لەگەڵ دایکیان
- شوانەکە زاک و ماکی بە پێشەخۆی دابوو.

(س)
* سورتک: چەقاوەسوو، ئاڵچاغ
- بە راستی کوڕێکی سورتکی.
* سایل: تەبا، هەروەکو، بە چەشنی
- سایلی خەڵکی چووینە پێشوازی.
* سەیوان: چەتر
- لەمەودوا بارانە دوو سەیوانان لە بازاڕی بکڕە.
* سیپەلک: سی
- سیپەلکی پەنمابوو (ئەستوور ببوو).
* سۆلک و سۆل: قوندەرەی لاستیک
- سۆڵکەکی لۆ من بکڕە.
* سیر هەنجن: ورد و خاش کردن، مارکوژ
- ئەوەندیان لێ دا سیر هەنجنیان کرد.
* سۆرێ سبیانێ: تازە رۆژهەڵات و بەیانی زوو، کازیوە
- لە سۆرێ سبیانێوە چاوەڕێت دەکەم.
* سێزدە: سیانزە
- سێزدە کەڕەت (جار) چوومە بەغدایێ.
* سینی سینیانێ: یارێکە بەتایبەتی لە مانگی رەمەزانان دەکرێت.
- لە سینی سینیانێ پێکی منیش بکەن.
* ساپانێ: خەنانێ، یارێکی منداڵانە بەتایبەتی کچان.
- دوونێ یان دوێکە (دوێنێ) سەیران ساپانێی دەکرد.
* سخ: بۆ داوی کشت دەگوترێت
- داوەکە سخە.
* سخ: توند
- بزمارەکەی بە سخی کوتی.
* ساتمە: سەرسمدان
- ساتمەی کرد و بەربۆوە (کەوت).
* سۆر: سوور
- قەڵەمەکی سۆرم پێویستە.
* سمێرە خنچکە: زەردەخەنە (زەردەخەنەی بەتەوسەوە)
-سمێرە خنچکەی هاتێ.
* سەرجەلە: داری خێزان: گەڕانەوەی بابەلباب، شەجەرە، رەگێشە
- سەرجەلەیان دەگاتەوە سەرپێغەمبەری.
- سەرجەلەی خۆی نازانی.
* سـەین و بەین: کـەین و بەین، تێکە و لێکە ( زیاتر بۆ کارکردنی بە نهێنی بەکاردێ)
- لەو سەین و بەینەتان تێناگەم.
* سەرەسەر: گەڕانی بێ سوود و زیاد.
- ئەوە چییە هەر لە سەرەسەران دەگەڕێی!
* سەرانگرێ: کەوتنە خوارەوە بەسەر سەردا
- منداڵەکە سەرانگرێ بوو.
* سەرکەوبنکە: منداڵی گچکەی ژێر دە ساڵی
- ئەو بێوەژنە کۆمەڵە سەرکەوبنکەکی هەیە.
* سۆ: کولک: گرێی هەناو
- سۆیەکی گەورەی لێ هاتییە.
* سۆریکە: سوورێژە
- منداڵەکەت بکوتە با سۆریکەی لێ نێ.
* سەرینگان: سەرینان: لای سەری کەسێکی نووستوو یان مردوو یان....
- چوومە لای سەرینگانی دانیشتم
* سێر: ساج

- خۆ نانت لەسەر سێریێ نەسووتایە -پەندی کوردی-
* سەرچیغ: رووشان و لێدانی شتێک قووڵ نەبێ.
- گوللەکە سەرچیغ پێی کەتییە.
* سەرچیغ چوون: بە هەلە و نادروستی و تێنەگەیشتنی بابەت و شتێک.
- ئەوە چ دەڵێی سەرچیغ چووی؟
* سینگوڕک: دەفەی سینگ، مانای بە رۆکیش دەدا.
- ئەسپەکە لوشکەکی لە سینگوڕکی ناڵبەندەکە دا.
- سنگوڕکی پیاوەکەی گرتبوو بەری نەدەدا.
* سەرگین: تەپاڵە
- جاران سۆبە و ئاگردانیان بە سەرگین و قشپل (پشقل) گەرم دەکرد.
* سوخەت: سیفەت، رەوشت، هەڵسوکەوت.
- سوخەتی باش نییە.
* سابات: کەپر
- بن ساباتەکەی لێروکانە (لێرە) فێنکترە.
* سووقبوونەوە: دان ئاڵبوونەوە، ئاو لەزار هاتن.
- ئارووەکەی لە پێش چاوی مەخۆ سوقی دەبیتەوە.
* سێ رسکانێ: سێ ریزکانێ: یارییەکە لە نێوان دووکەس، بە سێ بەرد لەسەر سێ ریز، کە لەسەر زەوی یان هەر شتێک دەکێشرێت دەکرێت.
- ئەوە دوو مانگە سێ رسکانێم نەکردییە.
* سەردەرە: چێوەی سەر دەرکەی: ساپیتەی دەرکەی
- ئەگەر حوشترت بوێ، دەبی سەردەرەی دەرکەت بەرز بی.
- پەندی کوردی -
* ساقەتەسۆرە: زەرنەقوتە: بە بێچووە باڵندە (بەتایبەتی فەرخە کێشکە) دەگوترێت، کە هێشتا پەروباڵی نەهاتبێ.
- ئەو ساقەتە سۆرە لەو هێلانە بەربوویتەوە (کەوتووە).
* سرپات: تلپە: دوای گوشینی تەماتە، توێکڵەکەی و ئەوەی دەمێنێتەوە سرپاتە.
- ئەو تەماتەیە سرپاتی زۆر بوو.
* سبەی رۆژێ: ئاییندە، داهاتوو
- سبەی رۆژێ گازاندە (گلەیی)م لێ نەکەی.
* سپیکاری: گەچکاری: گەچکردنی ماڵ و خانوو
- هێشتا خانووەکەم سپی (سپیکاری) نەکردییە.

(ش)
* شەمووله: کورتە باڵا، کەسێکی لە رادەبەدەر کورت
- شەمووله مێووژی دەوێ.
* شامی نۆک: ئەو نۆکەی دەکولێنرێ و بەیانیان لەگەڵ بەرچایی دەخورێ.
- هەندەک شامینۆک بکڕە.
* شتاق: هیچ کام، شتاقیان: هیچ کامیان
- شتاقیان لە ماڵێ نینە.
* شەوین: بردنە دەرەوەی مەڕ و ماڵات لەدوای نوێژی شێوان تا بەیانی
- ئەو شەو لە شەوینێ سەرمام بوو.
* شیوەخوار: بردنەوەی دەرەوەی مەڕوماڵات لەدوای نانی ئێوارە بۆ ماوەی یەک دوو کاتژمێر
- مەڕەکانی بۆ شیوەخوار بردە دەرێ.
* شەپکە: بە شتێکی پان دەگوترێت بۆ نموونە شەپکەدار، شەپکەی دەستی، کە دەکاتە نێوان زەنگە و قۆڵی
- شەپکە دارەکم بۆ بێنە.
- شەپکەی دەستی لە گردەبڕ شکا.
* شکارتە: پارچە زەوییەکی چێندراوە
- ئەو شکارتە جوانە هی کێیە؟
* شاپ شاپانێ: شەڕە شەق: بە شەق و شولاق لێکدان
- شاپ شاپانێ مەکەن جێیەکتان دەشکێ.
* شە شاگر: دەمانچە
- بە شە شاگری تەقەی لێکرد.
* شفتی: شووتی: زەبەش: شامی * لەم بارە کۆمەڵێک وشە هەن، کە زۆربەیان لە دەڤەری سلێمانی و هەندێک شوێنی دیکەی کوردستان لە جیاتی (ف) دەکرێت بە (و). بۆ نموونە حەفت = حەوت، مزگەفت = مزگەوت، ئەشکەفت: ئەشکەوت، نەفت: نەوت، کە ئەمە وشەیەکی بیانییە و لەبنەڕەت وشەی (nephta)یە. ئەوە بێجگە لە هەولێر لە تەواوی کرمانجی سەروو و شێوەزارەکانی دیکە بە (ف) گۆی دەکەن.
- شفتییەکی گچکە (بچووک)م لۆ بکێشە.
* شین بوون: سەوزبوون: روان
- دەغلەکە شین بوو.
* شە: شانە
- من شە و نەینۆکم هەیە.

* شلە ساوار: لەپە ساوار
- شلە ساوار بە گۆشتمان لێنابوو.
* شەپیلک: ناوشان
- شان و شەپیلکم دێشێ.
* شەکرۆکە: نوقڵ
- منداڵ زۆر حەزیان لە شەرکرۆکەیە.
* شەقاو: هەنگاو
- دوو سێ شەقاو برۆ پاش.
* شنگ: هێز و تاقەت
- هیچ شنگم نییە.
- شنگم لەبەر برایە.
- هەتا لەسەر شنگ و تاقەتی خۆم بووم.
* شرەکە: رۆژئاوابوون
- رۆژ لە شرەکەی بوو.
* شرت و شۆ: ریسواکردن
- لە پێش چاوی خەڵکی ئاوایی شرت و شۆی شکاند.

(غ)
* غاردان: راکردن، (بەغار: خێرا)
- غاریشم دا نەیگەیشتمێ.
- ئەسپێکی بەغارە.
* غارغارانێ: تەرادانێ، زۆربەی کات تەرادانێ بۆ وڵاغ بەکاردێت، بەڵام غارغارانێ بۆ مرۆڤ و وڵاخ بەکاردێت.
- ئەوە چ تەرادانێتانە!
* غام: نۆبەت:
- غامی منە واتە نۆبەتی منە. زیاتر لە یاری (کەللایانێ) دەگوترێت.

(ف)
* فەرشە: پنە: ئەو ئامرازەی نانی بە هۆی تیرۆگ لەسەر پان دەکرێتەوە، جاران لە گێچ (گەچ) ئێستا لەدار دروستدەکرێ و سێ پێچکەی هەیە.
- ئەو فەرشەیە نانی باش لێ دێ.
* فەرخە: بێچوو
- فەرخە سووسکە (سوێسکە) زۆر خێرایە.
بەڵام بۆ بێچووی قەتێ، پیتی (خ) گۆ ناکرێت و دەڵێن (فەرەقەتێ).

* فەلە: مەسیحی: دیان
- ئەو کیژە (کچ)ە فەلەیە.
* فاتەرەش: سپڵ
- ئەگەر کاوڕەکەتان کوشتەوە فاتە رەشەکەم بۆ بنێرن.
* فەراقە: لە خەم رەخسانی منداڵ و بێچووی ئاژەڵ و........ هەراش بوون.
- منداڵەکانی فەراقە بوون.

(ق)
* قوندە: قونە: مریشکی بێ کەڵک
- ئاو لە کوپان گەرم بوو مریشکە قوندەم خەسوو بوو / فۆلکلۆر.
* قرمسان: پێکەوەنووسانی قایم
- هیچ قسەی نەدەکرد دەتگۆ دەوی قرمسایە.
* قرساندن: مەزەندەکردن، تەخمین کردن
- ئەوەندە مزاشە (تێکەڵی گەنم و جۆ) بە چەند دەقرسێنی؟
* قەرسیل: ئەو پارچە زەوییەی بەر گوندی، کە زیاتر بۆ ئاژەڵ بەکاردێت. و بەجۆ دەچێندرێت.
- بەرخەکان چوونە ناو قەرسیلەکە.
* قەپۆز: لموز
- قەپۆزی گەوردیە.
* قرۆقەپۆز: بە سووکایەتی و بەچاوی نزم سەیرکردنی دەم و چاو.
- قەپۆزیان شکاند.
- قەپۆزی برندە (باڵندە).
- ئەو قرۆقەپۆزە زۆر لەخۆی رازییە!
* قۆیەن:
* قورقورۆرکێ: قورقورۆکانێ،یاری کردنی منداڵ بەقوڕ
- قورقورۆکێ مەکەن پیسە.
* قۆپک: شوێنی بەرزایی گرد و زوورگ و...
- لەو قۆپکەی ئاودیوبین دەگەینەجێ.
* قۆرت: چاڵ
- ئەوەی قۆرتی لۆ خەڵکی هەربکەنی (هەڵبکەنی) خۆی تێدەکەوی.
* قیناج: شەفتول
- خانووەکەیان قیناجە.

* قـەرەپەسـتـانێ: قـەرەباڵغی زۆری خـەڵـک لە شـوێنی بەرتەنگ. شان وێکدان: ئاپۆرە.
- بکشێنە دواوە، ئەو قەرەپەستانێیە چییە؟
* قەلەزراو: زۆر ترسنۆک
- ئەو قەلەزراوە ناوێری مریشکی سەرببڕی.
* قرچۆک: زۆر رەزیل
- ئەوەندە قرچۆکە رکی لە ددانی خۆی دەبیتەوە.
* قومپانی: قونپانی: پاژنەپێ: پاشپانی
- درکەک لە قومپانیم راچوو.
* قرێژ: چڵک
- دەستی هەموو قرێژە.
* قینچکە: زیبکە
- دەموچاوی هەموو قینچکەیە.
* قـینچکە تەنگ: کـەسێـک زوو هەڵـبچێت و تووڕەبێت: حەوسەلەی گچکە، حەوسەلە تەنگ
- پیاوێکی قیچنکە تەنگە.
* قاندڕ: رق لێ بوونەوە (کەسێک مەراق لە کەسێک بداو کێشەی بۆ دروست بکات)
- ئەو منداڵە قـاندڕی لە کـوڕەکـەی من دایە و وازی لێ نایێنی.
* قیچەک: نەختێک: کەمێک
- قیچەکی دی وەرەپێش.
* قدیلانە: ختووکە
- قـدیلانەی ئەو منداڵەی مـەکـەوە ژانە زگ (سک) دەیگری.
* قل: دانە: بە مانای دنک و خۆشەویستیش دێت
- وەکی برایان قلەک بۆ من قلەک بۆ تۆ.
- قلەکەم زۆر جوانە!
* قرپ: قرقێنە
- ئەو قرپەت بۆنی زۆر ناخۆش بوو.
* قولینچک: گۆشە، سووچ
- هەر ژورە(ژوورە)ی چوار قولینچکی هەیە
* قرتقرتۆک: قورگ
- رێوییەکە قرتقرتۆکی مریشکەکەی بڕی.
- دەستی لە قرتقرتۆکی نا.
* قان: پارچە، برێک: نۆرە: غام
- ئەو قانە عاردەم تۆ نەکردییە.
- ئەو جارە قانی منە.
* قاشوانێ: جۆرە یارییەکی فۆلکلۆرییە بە گویەک و قـاشۆ دەکرێت.
- کوڕگەل وەرن با قاشوانێ بکەین.
* قاندان: نۆبەتدان. قان: نۆبەت
- قانم دایێ.
* قـانگدان: دوکـەڵکردنەوەی زۆر بەتایبـەتی لە شـوێنی بەرتەسک، ئەشکەوت و کونە رێوی و.....
- دەڵێی رێوی قانگ دەدەن.
* قەدبڕ: یەکڕاست
- با قەدبڕلێدەین زووتر دەگەینەجێ.
* قـەسپـەرە: رەقبـوونی چلک لە پشـتی ملی کـراس و کورتەک
- پشت ملی کراسی قەسپەرەی بەستییە.
*-قۆدی: قتوو
- منداڵەکە شیری قۆدی دەخوات یان دایکی؟

ک

* کـاریتـە: نێـرگە: لوولە، راجە، ئەو دارەی بـۆ سـەرگـرتنی خانووبەرە بەکاردەهات، کە دارەڕێیان پێدەگوت و ئینجا هەراش و حەسیر و شتی لەو جۆرەیان دەخستە سەر و بە قوڕ سواخیان دەدا، ئێستا چیمەنتۆ دەکرێ.
- خانووەکەمان زۆر کۆنە کاریتەکانی رزیون.
* کـەرەمـسـتـانێ: کـاڵە مـشـتێ: یارییەکە بە شـاردنەوەی شـتـێـکی بچـووکی وەکـو ئەنگوسـتـیـلە لەناو کـڵاو و هەڵهێنانی، دوو دەستەش دەیکەن.
- کاکم لە کەرەمستانێ زۆر مەعلانە.
* کەڕەسیسە: قەرەباڵغی
- ناچمە ناو ئەو کەڕەسیسەی.
* کسۆک: سەگ
- حاڵم حاڵی کسۆکانە. واتە حاڵم زۆر ناخۆشە.
* کادین: کادێن، ئەو شوێنەی کای تێدەکرێت.
- هەور دەڕوا لۆ بادینان خـۆ هەڵکوتن لۆ کـادینانان. - فۆلکلۆر -
- کا هی خۆت نەبوو خۆ کادین هی خۆت بوو. - فۆلکلۆر -
* کەچکەچوولە: ئەو پارچە گوشە یان تەشکەی لبادو جلەی

لەدوای جەنجەڕی دێخن، یاخود ئەگەر منداڵان شتێک بەدوای خۆیان رابکێشن و گەمەی پێ بکەن.
- ریوی بە کونێوە نەدەچوو کەچکەچوولەشیان لە کلکی یەخستبوو.
* کیفاندن: فیشکاندن: دەنگی مار
- مارەکە کیفاندی.
* کووز: قاش
- دوو کوزە شفتی و کوزەک گندۆرەی بخۆ.
* کن: لا: لەکن: لەلای: نک: ئال
- لەکن من خەرمەنی گوڵ خارە بێ تۆ
لەکن تۆ خارو خەس گوڵزارە بێ من (نالی)
* کەون: کۆن
- ئەوە پێلاوە کەونەکەیە یان نووە (نوێ)؟
* کەچە: کۆن و بێ کەلک بوون
- کەنگێ (کەی) ئەو چەقووە (چەقۆ)یە تیژدەکەیەوە؟
* کەنگێ: کەی: کەینێ: کەنگێن: کەنگینێ
- کەنگێ هاتی؟ کەینێ بێم؟
* کیژ: کچ: قیز: دۆت: کەنیشک، دویت،لە هەولێر بۆ ناوی کچ (کیژان) هەیە، کە (ان)ی نیشانەی کۆی خراوەتەسەر.
- ئەو کیژە زۆر قشتە (جوانە)!
* کودی: کولەکە. تۆ کودی: ناوکە کودی
- برنج و شلەی کودیمان هەبوو.
* کەپوو: لووت: دفن: کەپ: دەماغ
- کەپووی بە کەپووی بابی دەچی.
* کێندەر: کوێ
- ماڵتان لە کێندەرە؟
* کەرەباب: کەڵەباب: کەڵەشێر
- ئەو کەڵەبابە مەفرۆشە زۆر چاکە.
* کەمۆ: ماڵی بوون: دەستەمۆ
- ئەو پشیلەیە کەمۆیە.
کاپێلک: کەلەش گەورە
- منداڵەکی کاپێلکە ستوور بوو.
ئاوەڵناوی (ئەستوور) (ئە) لەناوچووە،
* کەوەدەری: نەدیتکە: نەدی و بدی: هیچ نەدیو، بۆیە وەکو مەسەل دەگوترێ:
- ما ئەمن کەوەدەریمە!

* کوسکەکوسک: زەقەزەق
- چاوی پشیلەکە کوسکەکوسکی بوو.
* کەس لە کەس: ئەم وشانە لە نێوان منداڵان بۆ ئاشتبوونەوە بەکاردێت، کە دوو منداڵ بە یەک دەڵێن:
- کەس لە کەس. واتە ئاشتبووینەوە.
* کەسک: سەوز
- رەنگی کراسەکەی کەسکە.
* کێشکە: چۆلەکە: پاساری
- کێشکە خۆی هەیە هەتا چەلاوی هەبی.
* کیهان: کامە، کامیان
- کیهانت دەوێ، مامز یان کێروشک؟
* کوو: چۆن
- کووی باشی؟
- کوو ئەوها دەبی؟
* کەللایانێ: هەڵماتانێ: ماتانێ: گولێن: موشێن: هەڵماتێن: یارییەکە بەهۆی کەللا منداڵان و هەندێک جار گەورەش دەیکەن
- وەرە با کەللایانێ بکەین.
* کرتۆیە: پەتاتە
- کیلۆی ئەو کرتۆیەیەی بە چەندییە؟
* کەزی: پرچی هۆنراوە
- کەزی شۆڕەکەیان لە هەموویان قشتتر بوو.
* کورێژگە: بچووککراوەی کوڕ
- کورێژگەکەمان لەبەر بەرخانە.
* کوارگ: قارچک
- کوارگی ئەو دەشتەی زۆر بەتامە.
* کندر: پەت: حەبل
- هەر چوار پەلی مانگاکەمان بە کندر بەستاوە.
* کڕ: بێدەنگ: کڕبە: بێدەنگ بە: وسبە
- بە کڕی دانیشتبوو.
* کڕبوون: کورک بوونی مریشک و باڵندە.
- مریشکەکە لەسەر هێلکەکان کڕکەوتووە.
* کۆزوشەش: دووشەش بۆ هاتن: یەکێک باشی بۆ بێ.
- چت دەوێ کۆزوشەشە.
* کێلە بەردانێ: کێلە بەردینە: کێلە مارانێ، جۆرە یارییەکە لە نێوان دوو دەستە دەکرێت و هەر یەکە و چوار بەرد لە دوورییەکی دیاریکراو دەچەقێنن و بە بەرد تێی

دەگرن.
- کەس لە کێلە بەردانێ لە بارامی نەبردتەوە.
* کەرپووچ: خشت، بەڵام لە هەولێر بەوەی لە قوڕ دروست دەکرێ و سوورناکرێتەوە دەگوترێ (خشت).
- خانووەکەمان لە کەرپووچە.

گ

* گچکە: بچووک
- کیژە گچکەکەمان زیرەکە.
* گچکۆکە: بچوککراوەی گچکەیە
- هەند گچکۆکەیە دیار نییە.
* گۆزینگ: قولەپێ
- گۆزینگم دێشی.
* گازکردن: بانگ کردن
- ئەوە چەند جارە گازت دەکەم.
* گروازە: گلۆازە: قژی لوول
- پرچەکی گروازەی جوانی هەیە.
* گەردی بەیانی: بەیانی زوو: سۆرێ سبیانێ
- لەگەڵ گەردی بەیانی لەخەو هەستام.
* گۆلک: گوێرەکە
- چێڵەکەی مام پیرۆتی گۆلکە نێرەکی بووە.
* گڕدان: دەست بەسەرداگرتن و کردنە ماڵی خۆ. (بازنە بەدەوردا کێشان).
- ئەمن ئەو بەردانەم گڕدایە.
* گازمالووکە: بەشێکی باریک و بچووکە لە ئامرازی فاق، کە بۆ دانانەوەی باڵندەی بچووک بەکاردێ
- فاقەکەی من گازمالووکەی شکایە.
* گۆپاڵ: گۆچان: چەوگان
- هەنکە (ئێستا) پیربووە بەبێ گۆپاڵ ناتوانی بڕوا!
* گوفەک: زبڵدان (بانەگولان): شوێنێک زبڵ و پاشماوەی لێ فڕێ بدرێ.
- ماڵەکەیان دەڵێی گوفەکە.
* گونک: قۆڕ: ئاوسانی بەشێک یان تەواوی گون، کەچی لە سلێمانی و هەندێک شوێنی دیکە بەرامبەر (ئەنگوتک)ی هەولێردێت.
- منداڵەکەیان لە زگماکەوە گونک بوو.
* گنخاندن: خۆ خافڵاندن
- برا ئەوە کوە خۆت دەگنخێنی.
- ئیدی خۆت مەگنخێنە.
* گندۆرە: کاڵەک
- هەتا گندۆر گندۆر بوو، خزمێ بابم گەلە زۆر بوو
گندۆر هاتنە برانێ، خزمیش هاتنە قرانێ
فۆلکلۆر
- ئەو گندۆرە چەند کیلۆیە؟
* گۆربە: گۆرەوی
- گۆرییەکانت بشۆ بۆنیان دێ.
* گوجیلە: توتکە سەگ
- گوجیلەکان فەراقە بوون = هەراش بون = لەخەم رەخسیون.
* گازەرە: لەسەرپشت
- وەکی ئەمن چووم لەسەر گازەرەی پشتێ نووستبوو.
* گرۆو: گوری: گولی
- لە پیسیان گرۆو بووە.
* گێفرکانێ: گۆشەپرچنی: یارییێکە گەنج و منداڵان دەیانکرد،
- نابی لە گەمەی گێفرکانێ توورەبی.
* گەمە: یاری: وازی: وەک (game)ی ئینگلیزییە و وەک یەکن، لەم دواییانە بۆتە زاراوەیەکیش، دەگوترێت: گەمەی سیاسی، کەچی کەس ناڵێ یاری سیاسی یان وازی سیاسی
- وەرە با گەمان بکەین.
* گڕناگە: درنە: وڕک
- گڕناگەی لەو خەناوکە (ملوانکە)ی من داگرتییە.
* گوراحی خۆشبوون: دڵ و زەوق خۆشبوون
- دەتبینم گوراحت خۆش نییە مەسەلە چییە؟
* گرژینەوە: زەردەخەنە: پێکەنینێکی بێدەنگ
- ئەوە بە چ دەگرژییەوە؟
* گوریس کێشکانێ: گوریس گوریسانێ: وەریسە پرچنی
- لە مێژە یاری گێفرکانێکم نەکردییە.
* گۆلم: هەردوولەپی دەست: پڕ بە مشتێک: هۆک
- برینەکەی یەک گۆلم خوێنی لێهات.
* گۆد: سڕبوون: تەزیو: لەدوای دانیشتنی زۆر پێیەکان سڕدەبن و مرۆڤ ناتوانی بە باشی بڕوا، ئیدی بەم جۆرە ڕۆیشتنە دەگوترێ گۆد بوون.

- گۆد بوویمە ناتوانم برۆم.

ل

* لالە: چرا
- ئەو لالەیەی پێکە (داگیرسێنە).
* لەبای غــاریّ: هەربەرێود و زۆر بە پەلە، ســەرپێــیی راپەڕاندنی کارێک.
- لەبای غاریّ نانەکەی خوارد.
* لالمووز: مـرومـوّچ: دردۆنگ: رووگـرژ: لالووت (گـرنگی پێنەدان)
- لە دونێود (دوێنیّ) لێمان لالموزە.
* لاق: قاچ
- لاقم دێشی.
* لۆر: لۆرک
- ماست و پەنیر و لۆرمان هەیە.
* لاتەریک: گۆشەگیر
- پیاوەکی لاتەریکە.
* لاییـدە: غــەریبــە، کــەسێک لەلاوە بچێــتــە شوێنێک خەلکی ئەویّ نەبێت.
- هەر کە چاوم پێکەوت زانیم لاییدەیە.
* لینگەوگۆڕ: پێگۆڕ: تاکەوتاکی (بۆ پێلاو لە پێکردن)
- پێلاوەکەت لینگەوگۆڕە.
* لێروکانە: لێرە
- لێروکانە دێرە (دێلە) سەگەکە ترەکی (زا).
* لپرلپر: لۆچاوی
- دەموچاوی هەموو لپرلپرە.
* لگەن: لەگەن: قاپی گەورە
- یەک لگەنە شۆربای خوارد.
* لەزگە: خەریکە: رەنگە
- نەرمین لەزگە بگریّ.
* لۆ: بۆ: بۆچی، چمــا، ئەڕا. ئامــرازی پرســیــارە: لۆ وا دەکەی؟
- لۆ سمێری چوو ردێنیشی لەسەر دانا. ( لێرە لۆ ئامرازی پرسیار نییە)
* لچ: لێو
- لۆ لچت ئەستوور بووە؟
* لەگینە: لەوانەیە: رەنگە
- لەگینە لەبیری چووبێت.
* لانک: لاندک: بێشکە
- لانک لانک لانکۆریّ لانک لە دار هەناریّ (فۆلکلۆر)
* لەهیکڕا: لەناکاو: لەپڕ
* لەپڕ: لەناکاو: لەهیکڕا
- لەهیکڕا (لەپڕ) سەری لێداین.
* لوولوو: لوولی: پاروو
- ئۆدە لوولووەکیّ لۆمن بکە. (لەنێو زرارەتی)
* لووشکە: لەقە (تایبەتە بە ولاغ)
- ئەو کەرە لووشکەی داویّ.
* لەیلووک: لەلووک، جگە لەو ئامرازەی منداڵی بچووکی دەخـرێـتـە ناو بۆ خـەوتن و حـەسـانەوە لە دار و ئاسن دروست دەکرێت. ئێـسـتـا لەیلووک بۆ رابواردنی منداڵان لە شاری یاری و نێو باخچەی ماڵانیش پەیدابووە.
- سواری لەیلووک زۆر خۆشە.
- منداڵەکە لەناو لەیلووکەکە نووست.

م

* مراز: ئاوات: ئامانج
- یاخوا مرازت حاسل بی.
- خوایە بەمرازی خۆت بگەی.
* مــامــز: ئاسک، لە هەولێــر ئەم ناوە لە ئافــرەتانیش دەنرێت.
- ماڵی پلکە مامزی مامزەکەیان فرۆشت.
* مێرووستـان: مێرووڵە، لە هەولێردا پاشگری (ستان)ی شــوێن و مــێــروو ئینجــا دەبێت بە زیندەوەرەکــە، بۆ شــوێنەکــەشی وەک زۆربەی کــورد و هەولێــریش دەڵێت: (شارە مێرووستان)
- لێروکانە (لێرە) دوو شارە مێرووستان هەیە.
* مێشـەنگین: هەنگ. لە راسـتیـدا (مێش + هەنگوین)ە لە هەولێر (هـ، و) لەناوچوون و بەمجۆرەی لێهاتووە.
* مراک: ملاک: کەوچک
- مراکەک خێی (خویّ)ی لەو شیوە (چێشت)ی بکە.
* مەگیرانی: بێزوو
- ئەو ژنە مەگیرانی بە شتی مزر دەکا.
* ماردزیو: هەزارپیّ
- ئێرە ماردزیوی کەمە.

* مووس: گوێزان
- بە چ مووسەکی ردێنت دەتراشی؟
* مشکی: خۆڵەمێش: سوتماک
- ئاگرەکە کوژاێتەوە مشکییەکە بڕێژە.
* مامۆژن: ئامۆژن (ژن مام)
- ئەوە مامۆژنی کیهانتانە؟
* مزر: کەمەک ترش
- ئەو پرتەقاڵە مزرە.
* مزاش: تێکەڵ کردنی گەنم و جۆ، کە بە نانەکەش دەگوترێ نانی مزاش. لە راستیدا مز-ەی ئاشە، ئەو بەشە گەنم و جۆیەی ئاشەوان لە جیاتی هاڕینی گەنم و جۆ وەری دەگری و بەزۆریش تێکەڵ دەکرا، واتە گەنم و جۆکە پێکەوە مزاشە.
- دوو ساڵان نانی مزاشمان خوارد.
* مەعلان: زۆرزان
- ئای! چەندە مەعلانە.
* مەعلاندن: دەرسدان و فێرکردن
- لەمێژە ئیشی مەعلاندنە.
* مووە: موولێهاتن: دەردە پیسەکە
- پەنجەی دەردە پیسەکە (مووە)ی لێهاتبوو.
* مێراب: رۆخ: دامێن: دامان (میحراب: مزگەوت رووخایە مێرابی مایە. لە (میهراب)ەوە هاتووە.
- مێرابی مافوورەکە تەڕبووە.
* مزەورە: چێشتێکە بە زلق و برنج و ئاو(دۆشاو)ی تەماتەی دەکرێ، تورکمانەکانی هەولێر پێی دەڵێن یاپراغ دیبی.
- هەتا زگم هێشا مزەورەم خوارد.
* ملەوەز: بەخۆوە: تێکسمراو: چارشانە: عێل: نەفرەجا: کەتە
- کابرایەکی ملەوەز میوانتانە.
* مژمژە: ئەو نوقلەی دارێکی پێوەیە و منداڵان دەیمژن، ناوەکەشی هەر لە دووبارەبوونەوەی رەگی کاری (مژین)ەوە هاتووە (مصاصە).
- منداڵان زۆریان حەز لە مژمژەیە.
* مۆری: مووروو. مۆریانێ: مووروانانی، یاری کردن بە مۆری، یارییەکی کچانەیە.
- یەک گۆلم مۆری دۆڕاند.
- لە مۆریانێ تێرنەبووی.
* مەزرەقە: نانی کوردەواری کە بە شێوەیەکی رەق هەڵبگیرێ پێچەوانەی نانی تیری، کە نەرمە.
- دوو نانی مەزرەقەی بڕشێنە با نەرم بیتەوە.
* مەیل مەیلانێ: یارییەکە منداڵ و مێرد منداڵان دەیکەن، یەکێک مەیلێک دەڵێ و ئەوانی دیکە هەڵیدەدێن.
- لە مەیل مەیلانێ وەستایە.
* مەترەق: خەتورمە: بەرچیغ: دارێکی ئەستوورە و زۆرجار لە کاتی شەڕ و بەرگری لەخۆکردن بەکاردەهات.
- مەترەقەکی لە ئەسکورد (مل)ی دا.

ن
* ناگزوور: کەموکورتی: گوزەران باش نەبوون.
- ئەو پیاوە زۆر ناگزوورە یان ناگزووری هەیە.
* نزگرە: ئەوکاتەی یەکێک زۆر بگریێ و حاڵەتێکی وەک بەرچینچکە دەگرێ.
- سەری بە نزگران هەڵدەقەنا.
* نۆڕسکانێ: نۆڕێکانێ: یارییەکە لە شێوەی دامە و بەردەکانی کەمترە (نۆ بەردن).
- نۆرسکانێ نازانم.
* نەرمک: نەرمە گۆشت: گۆشتی بێ ئێسقان.
- نەرمک کیلۆی بە چەندییە؟
* نەدی و بدی: نەدیتکە: هیچ نەدیو
* نەدیتکە: نەدی و بدی
- نەدی و بدی کوڕەکیان بوو کیروگونیان بری. - پەندی کوردییە -
- پیاوەکی زۆر نەدیتکەیە.
* نەفرەجا: زەبەلاح و زۆر ناشیرین
- پیاوێکی نەفرەجا بوو.
* نەینۆک: ئاوێنە
- لەبەر نەینۆکێ ردێنم دەتراشم.
* نوو: نوێ
- جلک و بەرگی نووم دەوێ.
* ناندین: ئەو شوێنەی نان و شیوی لێ دەکرێت، دەکرێ لە جیاتی (مطبخ) بەکاربێت.
- ناندینەکەمان زۆر کچگەیە.
* ناورانەوە: پاڕانەوەیەکی بە رەزیلی

- خزمەتکارەکە زۆر لەبەر گەورەکەی پاراوە.
* نینۆکبڕ: نینۆککەر
- ئەو نینۆکبڕە قیچەک (نەختێک) کۆرە (کۆڵە).
* نەورایی: زەوییەکی نزمی چوار دەور بەرز
- لەو نەوراییەی لێم بزر بوو.
* نێرینەی بواریِ: هەرەتی بەهاریِ
- ماست و پەنیر لە نێرینەبوار(بەهار)یِ زۆر زۆرە.
* نەخەسەلە: نەخاسمە
- ئەو پیاوە سەری زۆر بە گێچەڵە نەخەسەلە کوڕەکەی.

و

* وێندەر: ئەوێندەر: ئەویِ
- ناچمە وێندەر.
* وانەک: هەرامە: هین: شتێکی نادیار، یان بۆ شتێک نەیەویِ بیلێت.
- وانەکەکی بینە.
- وانەکم دێشی.
- کوڕەکەم وانەک نەکردییە.
* وی: ئەو. وەک وشەیەک بۆ ترسان و ترساندنیش بەکاردێت.
- ئەم سابات (کەپر)ە هی (وی)یە.
- وی زۆر ترسام.
* وردوهەڕا: وردوخاش
- پیاڵەکەی وردوهەڕاکرد.
* وارەوار: لەسەرخۆ
- بە وارەوار هاتە لامان.

ه

* هەوک: هەوگ: قوڕگ
- هەوگی (هەوکی) ئەستوور بووە.
* هیر: بەخت، بەڵام زیاتر لە یاریەکان بەکاردێت، بەتایبەتی لە کەللایانیِ.
- ئەورۆ هیرم نییە و لۆم نایِ.
* هۆڵ هۆڵانیِ: تۆپێن: تۆپانیِ
- ئەمنیش هۆڵ هۆڵانیِ بکەم؟
* هێڕ: گێژ
- ئەو هێڕ و هوڕە کەنگیِ تێدەگا!
* هەلووکانیِ: هەلیکانیِ: پەلیکانیِ: هەلووکێن
- چار رۆژە لە هەلیکانیِ دەبەینەوە.
* هیربار: قاپ و قاچاغ
- هیربارەکانت شووشتینە؟
* هێروە: بۆلای لە نزیک کردنەوە
* هێوە: بۆ دوورکەوتنەوە
- ئەوەندە هێروە میِ هەندەک هێوە هەڕوو.
بەواتا: ئەوەندە لێم نزیک مەبەوە هەندێک برۆ ئەولاتر.
* هڕەوبڕە: هیچ لیِ نەزانین
- ئەو قوتابییە هڕە لە بڕەی دەرناکات.
* هێور: هێواش: لەسەرخۆ
- هێور هێور دەڕۆیشت.
* هەتردش: زراو، هەتردش چوون: زراوچوون: زەندەق چوون
- هەتردشم چوو.
* هەرزەلی: داکەلان و رۆچوون
- پێم لەسەر بەردەکە هەرزەلی.
* هەنگیِ: هەنگینیِ: هەینیِ: ئەوکاتەی
- ئەگەر کلکی حوشتری بگاتە عەردی هەنگیِ (هەینیِ) سەری لێدەدەم.
* هەرامە: هین: وانەک: شت
- ئەو هەرامەم لۆ بینە.
* هەنکە: هەنووکە: ئێستا: نووکە: هەوکە
- هەنکە داکم دێتەوە.
* هەنگین: هەنگوین
- بەیانیان دوو ملاک هەنگینی بخۆ.
- با کلکی ریویم لەدەست بەربیِ هەنگین دەزانی چ تەپ و تۆزە.
* هەنجەت: بیانوو
- هەنجەتم پیِ مەگرە.
* هەڕوو: برۆ: هەڕە
- هەڕوە دەریِ ئەوجا (ئینجا) دەزانی چ باسە!
* هەوگیان: ژنی دوو برا بۆ یەکدی دەبنە هەوگیان
- هەوگیانەکەم جمک (دووانە)ی بووە.
* هەیوەشەو: هەیڤەشەو: بیرمە قەت لە داپیرم - دایکی دایکم - کە دانیشتووی کەندێناوە بوو - گوێ لیِ نەدەبوو بلیِ مانگە شەو
- ئەوشۆ (ئەمشەو).

# شیعرەکانی رۆستەم حەوێزی شاعیر

دکتۆر کەمال مەعروف
کۆلیژی زمان- زانکۆی سەلاحەددین

**پێشەکی:**

توێژینەکەمان کە بەناوی (گەشتێ بەناو شیعرەکانی رۆستەم حەوێزی شاعیردا) شاعیر چ وەکو سیاسی چ وەکو شاعیر رۆڵی بەرچاوی گێراوە، بۆیە بەپێویستم زانی کە گرنگی ئەم شاعیرە بخەمە روو، باسەکەشمان دەکرێ بە سێ بەشەوە، بەشی یەکەم ژیانی رۆشنبیری شاعیر، بەشی دووەم، شیعرەکانی لەرووی ناوەرۆکەوە، بەشی سێیەم، سیمای شیعرەکان، لەرووی زمان و کێش و سەرواوە. دیارە لەم باسەدا زیاتر جەخت لەسەر خستنەرووی دەقە شیعرییەکان دەکەم.

**ژیانی شاعیر:**

رۆستەم ناوی (محەمەد نافع)ە، کوڕی فەتاح ئاغای کوڕی عەولاغای کوڕی تاهیر ئاغای کوڕی حاجی بەکر ئاغای کوڕی محەمەد ئاغای کوڕی حەوێز ئاغای حەوێزییە، ساڵی ١٩١٣ لە گەڕەکی بەفری قەندی شاری کۆیە لەدایک بووە، هێشتا منداڵ بووە، کە دایکی ماڵئاوایی لێ کردوون، نەنکی (رەحمەخان) پەروەردەی کردووە. هەروەکو بۆ خۆشی دەڵێ:

**کوڕە کوردێکم نافعە ناوم**
**لە شاری کۆیە کراوە چاوم**
**ساڵی هەزار و نۆسەتو سێزدە**
**بە هاتنە دونیام براوە مژدە**

**کاک عەبدولفەتاح ئاغا باوکمە**
**زەینەب حەماغا ناوی دایکمە**
**نایەتە یادم کاتێ دایکم مرد**
**نەنکم رەحمەخان منی بەخێوکرد**

رۆستەم لەگەڵ شەڕ و کارەساتەکانی کۆیەدا ژیاوە، تەمەنی یەک ساڵان بووە، کە یەکەم جەنگی جیهانی هەڵگیرساوە لە تەمەنی چوار ساڵیشدا سەفەر بەلگی دیوە، کە رۆژانە بەدەیان کەس گیانیان دەسپارد، تەمەنی دە ساڵان دەبێ کە کۆیە لە لایەن فڕۆکەکانی ئینگلیزەوە بۆمباران کراوە، رۆستەم لە ساڵی ١٩٢٣دا خوێندنی سەرەتایی لە شاری کۆیە تەواو کردووە، ساڵی ١٩٣٢ و ١٩٣٣ پۆلی یەکەم و دووەمی ناوەندی لە هەولێر خوێندووە، بەڵام لەبەر نەبوونی و کەم دەرامەتی بۆی نەکراوە لەسەر خوێندن بەردەوام بێ، ساڵی ١٩٣٤ بۆ کۆیە گەڕاوەتەوە، لە قوتابخانەی شەودا خەڵکی نەخوێندەواری فێری خوێندن و نووسین کردووە، تاکو لە ساڵی ١٩٣٧دا بە ناچاری بووە بە کاتبی دادگای رانیە، لەبەر رەخنە گرتن و دەرخستنی کاری چەوتی کاربەدەستان، رەوانەی تەلەعفەری پارێزگای موسڵی دەکەن.

لەوێش حاکمی سیاسی ئینگلیز کە ناوی (کامبڵ) بووە، لەسەری دەنووسێ و لەکار دەردەکرێ و ماوەی چوارساڵ بێ کار دەمێنێتەوە تا لە ساڵی ١٩٤٦دا

دەیکەنەوە کاتبی دادی قەلادزێ، لەگەڵ پارتی دیموکراتی ئێراندا پەیوەندی پەیدا دەکا و رۆژنامەی کوردستان لە قەلادزە بلاودەکاتەوە، لەسەر جموجوڵی کاری سیاسی بەردەوام دەبێ، پەخشنامەیەکی سیاسی بەناوی (داد و بێداد) لەگەڵ هۆنراوەی (ئەی گەلی کورد) بلاودەکاتەوە کە سەرەتاکەی بەم جۆرە دەست پێدەکا:

**ئەی گەلی جەنگاوەری چوستی لەخۆشی ئاوەرووت**
**غیرەتە غەیرە لەناومان بە کەیف و هەیت و هووت**
**سابڕێ و ئێمەش کەچی موحتاج و پێویست بین بە قووت**
**ملکەچی تا کەی لە دوژمن چاکە ناکرێ چاوەنوار**

کاربەدەستانی میری ئەوسا کە دەزانن ئەو پەخشنامە و ئەو شیعرە سیاسییە هی رۆستەمی شاعیرە، بۆ رانیەی دەگوێزنەوە، لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٧ دەگەڕێتەوە بۆ کۆیە لەگەڵ تۆفیق وردی شاعیر و نووسەر دەچێتە ریزی رێکخراوی تەحەڕوردوە کە کەریم ئەحمەد سەرپەرشتی دەکرد و، بەشداری چەند خۆپیشاندانێکیان کردووە، تا لە ساڵی ١٩٤٨دا دەبێتە دەمڕاستی چەوساوەکان و ئانەڕەقەی بەرز دەکاتەوە و ئەم هۆنراوەیە دەچڕێ:

**ئێمەینە رووت و برسی**
**نایەڵین لەسەر کورسی**
**یەک نۆکەری ئینگلیز**
**لەگەڵ پەیمانە پیسی**
**پەیمانی تۆسەتوسی**

لە هەمان ساڵدا خۆی بۆ نوێنەرایەتی سلێمانی دەپاڵێوێ زۆری نامینێ وەکو نوێنەری (تەحەڕور) دەربچێ، کەچی ئەنجامدانی هەڵبژاردنەکە لە سایەی حوکمی عەسکەریدا رێگای پێنادا دەربچێ، بۆ کۆیە دەگەڕێتەوە، لەگەڵ دڵزار و فایق جەمیل ئاغای حەوێزی و مەلا مەجید موفتی و چەندانی تر دەگیرێن و رەوانەی گرتووخانەی کەرکووک دەکرێن، پاش ئازار و ناخۆشییەکی زۆرەوە رەوانەی نوگرە سەلمانیان دەکەن، تا لە ساڵی ١٩٥١دا بە دەستبەسەری دێتەوە هەولێر، لە ساڵی ١٩٥٢ لە رێگای نێوان هەولێر و کۆیە دەرباز دەبێ، دەچێتە گوندی نەبیاوە، لەوێدا دوکانێک دەکاتەوە، دەست دەکا بە هۆشیارکردنەوە و پەردە لادان لەسەر رووی چەوسێنەران و هەوێنی شیعرەکانیشی لەناو چەوساوەکاندا هەڵدەهێنجێ و دەڵێ:

**ئەکێڵێ بە درێژایی رۆژێ ئەرزی بێ وچان جووتیار**
**بەراتی جووتە پێڵاوێکی لاستیکە و دوو دینار**
**لەگەڵ رانکێکی بۆزی وەک خراری زووری ناهەموار**
**کە هەڵ دەکرێنێ رانی هەڵدەدا توێشکێکی هەر جارە**
**دەڵێی چرنۆکی لێداوە کتک بۆیە برینداره**

پاش ماوەیەک کاربەدەستانی میری دەستبەسەری دەکەنەوە و رەوانەی (بەدرە)ی دەکەن، تا لە ساڵی ١٩٥٧ ئازاد دەکرێ و بۆ کۆیە دەگەڕێتەوە، دوکانێک دەکاتەوە بەلام کەس ناوێرێ شتی لێ بکڕێ، چونکە سیاسی بووە، بەم جۆرە تاوەکو لە شۆڕشی (١٤)ی گەلاوێژی ١٩٥٨دا لێبووردنیان بۆ دەردەچێ و دەگەڕێنەوە سەرکار و دەکرێ بە فەرمانبەری تاپۆی کۆیە، لەپاش یانزەی ئازاریش خۆی خانەنشین دەکات، هەروەکو خۆی دەڵێ:

**ئا بەم جۆرە ژیانم بەسەر برد**
**لە فرکەی زروف خۆم تەقاویت کرد**
**شارەکەی کۆیەم کردە دوا هەوار**
**پێوەی دەنازم بەمەردی دیار**
**بە شاعیرانی بە نووسەرانی**
**بە عالمانی گەنجو پیرانی**

تاکو لەشەوی ١٩٩٩/٢/٢٨ لە تەمەنی ٨٦ ساڵیدا لە کۆیە کۆچی دوایی دەکات و لە گۆڕستانی باسکی عارەبیان بەخاک سپێردرا.

**لەڕووی بابەتەوە:**

شاعیر لەزۆر بابەتی وەکو وەسف، نیشتمانی، دڵداری، کۆمەڵایەتی، فەلسەفی دواوە، بەلام بەزۆری ناوەرۆکی شیعرەکانی سیاسین، شاعیر بەبیرێکی پێشکەوتنخواز بەرگری لە خاک و مرۆڤ و نەتەوەکەی کردووە. شیعرەکانی رۆڵێکی بەرچاویان گێڕاوە لە سەرجەم نەبەردەکانی رزگاری و بەرەنگاری زوڵم و چەوساندنەوە بۆ نەتەوە، لە هەمان

خەباتیان بخەنە ریزی خەباتی گەلانی عێراقەوەو لە مەسەلەی کوردستانێتی پەشیمان بینەوەو ببنە پارتێکی کوردی عێراقی، دواتریش هەر لە ژێر ئەو کاریگەرێتییەدا و لە کۆنگرەی ١٩٥٣ ی پارتیدا رێنمایی بە تیۆرەکانی مارکسیزم بکەن.

هەڵبەت کۆیە یەک لەو ناوچانەی باشووری کوردستان بوو، کە ژمارەیەک لە رۆشنبیرەکانی بوونە هەڵگری بیری مارکسیزم. یەک لەوانە فاتح(*) رەسول بوو، کە شاناز بەو فکرەییەوە دەکردو چالاکانە لەو بوارەدا دەست بەکاربووە.

سەرەتا پەیوەندی نێوان حیزبی شیوعی و پارتی دیموکراتی کورد زۆر باش بووە، کاتێک کە پارتی دامەزرا، حیزبی شیوعی خۆشحاڵی خۆی نیشاندا و بە رێکخراوێکی سیاسی و پێشکەوتووخوازی دادەنا، بەڵام دوای ئەوەی پارتی توانی جەماوەرێکی زۆر لەدەورەی خۆی کۆبکاتەوە، ئیدی حیزبی شیوعی بۆچوونی گۆڕاو نیگەران بوو، نەک هەر ئەوە، بەڵکو دەستی کرد بەهێرش کردنە سەر پارتی و لەرێگای رۆژنامەکانی (القاعدە) و (ئازادی) یەوە، پارتی بەوە تاوانبار دەکرد، کە وەک (شۆرش) و (رزگاری) رێکخراوێکی بورژوای کۆنەخوازە و ئامانجی لەت کردنی خەباتی کوردە[١١].

هەڵبەت ئەو جۆرە پەیوەندییانە کاردانەوەیەکی راستەوخۆی بۆ سەر هەڵگرانی بیری کوردایەتی (پارتی) و بیری مارکسیزم (کۆمۆنیستەکان) لەکۆیە هەبوو. ئەگەر لەسەرەتادا کۆمەڵێک چالاکی هاوبەشانە لەنێوانیاندا هەبووبێ، بەڵام لە ئاهەنگی نەورۆزی ١٩٤٨ دا هەریەک لە پارتی و کۆمۆنیستەکان بەجیا یادیان کردووە[١٢].

لەلایەکی دیکەوە حکومەتی عێراق بەبەردەوامی چاودێری جموجۆڵی ئەندامانی ئەو پارتانەی دەکرد و فشاری دەخستە سەر چالاکییەکانیان تا لە ١٥/٥/١٩٤٨ دا بەبیانووی پارێزگاری کردن لە سوپای عێراقی، کە نێردرابوو بۆ سەر ئیسرائیل لەگەڵ سوپای دەوڵەتە عەرەبییەکانی تردا، دەستیکرد بەگرتنی ژمارەیەک لە کادیرانی هەردوو پارتەکە لە کۆیە، بەتایبەتی ئەوانەی رۆڵی بەرچاویان لەسەرکردایەتی کردنی خۆپیشاندانەکانی رۆژانی راپەرینی ١٩٤٨ دا هەبوو، ئەم شاڵاوە چەندین ئەندامی پارتی (تحرر)ی گرتەوە، لەوانە: ئەحمەد دلزار، سادق جەمیل ئاغا حەویزی، مەجید کاکە حاجی مەحمود، رۆستەم حەویزی، مەلا مەجید(**) موفتی، عەبدولرەحمان مەحمەد حەویزی، فائق جەلیل حەویزی، ئەمانە هەموو درانە دادگەی عورفی سەربازی و زیندانی کران[١٣].

پارتی و کۆمۆنیستەکانی کۆیە لەدژی بریاری کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان بوون، کە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیلی لە ١٥/٥/١٩٤٨ دا راگەیاند، هەربۆیە حکومەتی نوری سەعید بە ئاشکرا کەوتە دژایەتی کردنی کورد[١٤]، بەڵام لە راستیدا پارتی پشتیوانی لە مەسەلەی فەلەستین دەکردو کاتێک کە جەنگی فەلەستین لەدژی ئیسرائیل ساڵی ١٩٤٨ روویدا، ژمارەیەک سەربازی کورد بەشداری ئەم جەنگەیان کرد، لەوێ شەهید بوون، هەندێک لەوانە خەڵکی کۆیە(***) بوون.

هەرچەندە ئەندامە بەرزەکانی پارتی لە کۆیە بەبەردەوامی لەژێر سانسۆری سیخوڕانی حکومەتدا بوون، بەڵام زۆر وریا و چالاکانە کاریان دەکرد. چەندین نموونە لەبەردەستدان، کە وەک بەڵگەنامە ئاماژە بەم بوارە دەکەن، هەر بۆ نموونە: لە نووسراوەکانی وەزارەتی بەرگری ژمارە (د/٥/٣٠٥/٢٩١) لە رێکەوتی ٢٢/٧/١٩٥٢ دا هاتووە " محەمەد زیاد ئاغا(****) خەڵکی کۆیەیە کاتی خۆی هاوکاری فتنەی ساڵی ١٩٤١ی کردووە، پەیوەندی بە (یونس سەبعاوی) یەوە هەبووە بەهۆی حەمەد زیاد ئاغاو تاقمەکەی چالاکی شیوعی زیادی کردووە، زیاتریش لە یانەی فەرمانبەرانە، کە بۆتە بنکەی سەرەکیان، زۆر گوێ لە وێستگەی مۆسکۆ و ئازەربایجان دەگرن"[١٦] دەردەکەوێ کە میری لە هەڵسەنگاندنی بیرو بۆچوونی کاکە زیاد ئاغا بەهەڵەداچووبوو، چونکە ئەو لە رێزەکانی پارتی دیموکراتی کورد کاری دەکرد، کەچی کاربەدەستانی میری بە شیوعییان لەقەڵەم داوە، دیارە ئەمەش بەهۆی ئەوەبووە کە پارتی لەو سەردەمەدا هەڵگری بیری مارکسی بووە.

پارتی دیموکراتی کورد بەنهێنی لە ٢٦ کانونی دووەمی ١٩٥٣دا کۆنگرەی سێیەمی لە کەرکوک

بەست، لەم کۆنگرەدا بڕیاری گۆڕینی ناوی حیزب بۆ (پارتی دیموکراتی کوردستان - عێراق) درا، هەروەها لیژنەی مەرکەزی هەڵبژێردرا، کە بریتی بوون لە: مەلا مستەفا (سەرۆک)، مێرحاج ئەحمەد، د. جەعفەر کەریم، ئیبراهیم ئەحمەد، نوری شاوەیس، نوری ئەحمەد تەها، عەلی حەمدی، رەشید عەبدولقادر، جەلیل هۆشیار، عەلی عەبدوڵڵا (ئەندازیار)، جەلال تاڵەبانی، عومەرمستەفا (دەبابە)، محەمەد(*) ئەمین مەعروف. پارتی لەم کۆنگرەیەدا رێبازێکی نیشتمانی پێشکەوتووخوازانەی چەپی گرتەبەر، هەندێک مادەی لە بەرژەوەندی جووتیارو رەنجدەرانی کوردستان چەسپاند، وەک خەبات کردن لە پێناو چاکسازی و جەخت کردن لەسەر خۆماڵیکردن و لەناو بردنی هەژاری و بنیاتنانی پیشەسازی قورس و زامنکردنی مافی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد لە چوارچێوەی عێراقدا[17].

شایانی باسە ململانێی سیاسی لە نێوان پارتی و شیوعی لە کۆیەدا بەردەوام بوو، ئەوەی پەیوەندی بە پارتییەوە هەبوو لەو سەردەمەدا، ئەوا تێبینی ئەوە دەکرێت کە هەنگاوەکانی لەسەرەخۆبوون، چونکە نەیدەویست قوربانی بە ئەندام و کادیرەکانی خۆی بدات لە پێناوی هەندێک چالاکی لاواز و بێ کەلک و دوور لە کوردایەتی، بەڵام بە پێچەوانەوە حیزبی شیوعی رێگایەکی توندرەوانەی گرتبووەبەر هەر لە سازدانی خۆپیشاندانی(*) چەکداری و بەشداری نەکردن لە هەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەمی ١٩٥٣ ی ئەنجوومەنی نوێنەران (پەرلەمان) ی عێراقدا، ئەویش لەرێگای کۆکردنەوەی خەڵک و هێرش کردنە سەر سندووقی هەڵبژاردنەکان لەشاری کۆیە و شکاندنیان[18]. لەو هەڵبژاردنەدا پارتی دیموکراتی کورد مەسعود محەمەدی وەک نوێنەری خۆی لەشاری کۆیە پاڵاوتبوو. (ئەم کارە بە فەرمی نەبوو، چونکە پارتی مۆڵەتی کارکردنی نەبوو). کاربەدەستانی میری بە هەموو توانایەکیانەوە هەوڵیان دەدا بۆ ئەوەی مەسعود محەمەد لەم هەڵبژاردنەدا دەرنەچێت، هەڵبەت کاریان دەکرد بۆ دەرچوونی پاڵێوراوی خۆیان، کە (مەلا حەویز ئاغا) بوو[19]. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا مەسعود محەمەد توانی سەرکەوتن بەدەستبێنی، ئەمەش هەڵوێستی خەڵکە دڵسۆزەکەی کۆیە بەرجەستە دەکات و لە هەمان کاتدا کاریگەری پارتی لەسەر دیدو تێڕوانینی خەڵکی ناوچەکە بەدیار دەخات[20]. مەسعود محەمەد لەم بارەیەوە دەڵێت: " رابەرانی ئەم خۆپیشاندانە زیاتر رقیان لە لایەنەکە (پارتی) بوو نەک حکومەت، ئەگینا لەبەرچی لە هەولێرو سلێمانی هەمان نمایشیان ئەنجام نەدا، چونکە هیچ پاڵێوراوێکی خۆیان نەبوو[21].

توێژەر وای بۆ دەچێ، کۆیە تەنها شارێک بوو لە هەموو باشووری کوردستان، کە توانیبێتی لە هەموو خەباتی ئاشکرای کوردی عێراق لەرێگای هەڵبژاردن، دژی ویستی میری نوێنەری سەر بە پارتێکی نوێخواز بگەیەنێتە پەرلەمان، لەکاتێکدا نوێنەرانی ناوچەکانی تری کوردستان نەیانتوانی نوێنەری خۆیان بگەیەنێتە پەرلەمان، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە ئازادی لە پرۆسەی هەڵبژاردندا نەبووە، بەڵام دەرچوونی نوێنەری کۆیە لە ئەنجامی هەوڵ و تەقەلایەکی چڕدا بوو، هەرچەندە کۆیە لەوسەردەمەدا هەژاربووە، بەڵام کۆڵی نەداوەو خەباتی کردووە، ئەمەش تایبەتمەندی کۆیە نیشان دەدا، کە لە شوێنێکی تر ئەم دیاردەیە بەدی ناکرێت.

ئەندامانی حیزبی شیوعی لە کۆیە بەزۆری خەریکی بەرزکردنەوەی شالاو کۆکردنەوەی مۆری پەنجە بوون، تا لە ١٩٥٣/١٢/١٥ بۆ ماوەی (٢٤) کاتژمێر بڕیاری مانگرتنیاندا، بەمەبەستی کردنەوەی رێگای(*) نێوان کۆیەورانیە[22].

سەبارەت بە هۆکارەکانی ململانێی بەردەوامی نێوان پارتی و شیوعی لەکۆیە، ئەوا چەندین دیدو تێڕوانینی جیاواز هەن، هەر بۆ نموونە مەولود ژاکاو پێی وایە کە: ناکۆکییەکان لە رواڵەتدا زیاتر لەسەر ئایدیۆلۆجیای چینایەتی بووە، چونکە شیوعی خۆی بەرابەری کرێکاران و جووتیاران دەزانی، بەڵام پارتی خۆی بە پارتێکی جەماوەری دەزانی، کە جووتیار و کرێکارو وردە سەرمایەداری نیشتمانپەروەر لەژێر ئاڵایدا کۆدەکردەوەو لەخۆ دەگرت، هەندێ جار رادەی رکابەری سنووری دەبەزاندو دەبووە مایەی دروستبوونی شەڕو(*) پێکدادان[23]. هەرکاتێک شتێکی لەم بابەتانە رووی بدایە ئەوا

پیاوماقولانی نێو ڕیزەکانی ئەم دوو پارتە بەپەلە هەنگاویان بە ئاراستەی هێورکردنەوەو ئاسایی کردنەوەی ڕەوشەکە دەنا[٢٤].

لە نیسانی ١٩٥٣دا ڕاپەڕینێکی جووتیاران لە ناوچەی دزەیی لە دژی دەرەبەگەکان سەری هەڵدا، کە (٦٠) ناوچە و (٣٠٠) گوندی گرتەوە، لەوانە: قەزای مەخمور و کۆیە. حکومەت وای نیشان دەدا، کە ئەم جووتیارانە ڕاپەڕیون لە دژی دابەشکردنی ئامێر بەسەریاندا، بەڵام لە ڕاستیدا نارەزایی جووتیارەکان لەسەر زەوت کردنی زەوییەکانیان بوو لەلایەن دەرەبەگەکانەوە، حیزبی شیوعی سەرکردایەتی ئەم ڕاپەڕینەی دەکرد[٢٥]. هەڵبەت (پارتی دیموکراتی کوردستان)یش پشتگیری ئەم ڕاپەڕینەی دەکرد، ئەویش لە ڕێگای نوێنەرەکەی لە پەرلەمانی عێراق، کە مەسعود محەممەد بوو[٢٦].

لەساڵی ١٩٥٤ دا کونسلی ئەمریکا سەردانی کۆیەی کرد، داوای لە کەسایەتییەکان و پیاوماقووڵانی ئەم شارە کردبوو، بۆ دانوستان و گفتوگۆکردن لەسەر هەندێ مەسەلەی پەیوەست بە ئایندەی کوردەوە. کونسلی ئەمریکا رووی پرسیاری ئاراستەی ئامادەبووان کردو وتی: "ئایا ئێستە کورد چی دەوێ ؟ مەلا حەوێز ئاغا هاتە وەلام، وتی: کورد هیچی لە عەرەب کەمتر نییە، دەوڵەتی سەربەخۆی دەوێ". لەراستیدا ئەمریکا تەنیا ئەو راپرسییەی لە کۆیە نەکردبوو، بەڵکو لەزۆر ناوچەی تری کوردستان ئەم کارەی ئەنجام دابوو بەمەبەستی بەکارهێنانی دۆزی کورد وەک کارتێکی فشار بەرامبەر حکومەتی عێراق، بۆ ئەوەی بێ دوودڵی بچێتە نێو پەیمانی ١٩٥٥ ی بەغدا، ئەگینا لەو سەردەمەدا ئەمریکا هیچ بایەخێکی ئەوتۆی بەکێشەی کورد نەدەداو لەبەرنامەیدا نەبوو گوێ بۆ داواکانی گەلی کورد شل بکات. دوای ئەوەی لیژنەی ناوچەی حیزبی شیوعی عێراق لە کۆیە گوێبیستی داواکارییەکانی شاری کۆیە بوون، کە مافی سەربەخۆیی بوو بۆ کورد، بۆیە بەیانێکی نارەزایی دەرکردو هێرشی کردە سەر ئامادەبووانی ئەم کۆبوونەوەیەو رایگەیاند کە ئەوان رازی نابن دەوڵەتێکی کوردی لەژێر چاودێری ئەمریکادا دابمەزرێ[٢٧].

کاتێک پەیمانی بەغداد لەساڵی ١٩٥٥ دا مۆرکرا، هەریەک لە پارتی و شیوعی خۆپیشاندانی جەماوەرییان لە کۆیە دژی ئەم پەیمانە ئیستعمارییە ڕێکخست[٢٨]. جەماوەری کۆیە ڕووبەڕووی هێزی پۆلیس وەستاو دواتر پۆلیس کەوتە تەقەکردن لە جەماوەری ڕاپەڕیو، ئەمەش بووە هۆی برینداربوونی ژمارەیەک لە خۆپیشاندەران، پیاوانی میری دەیانویست بە بریندراری دەسگیریان بکەن، بەڵام جەماوەر توانییان ڕزگاریان بکەن[٢٩]. لەمەش بترازێ لە خۆپیشاندانی پارتی و شیوعی لە کۆیە لە ١٩٥٦ دا، کە بۆ پشتیوانی کردن لەمیسر سازیان دابوو ژمارەیەک لە ئەندامە چالاکەکانی هەردولا گیران، کە هەندێکیان خەباتگێری پارتی بوون لەوانە: عومەر دەبابە[٣٠]، هەروەها مەجید ئاسنگەر، کە بە فەرمانێکی کارگێری بۆماوەی ساڵێک بۆ ناوەندی (ابن الربیعین) لە موسڵ گوێزرایەوە[٣١].

لەسەر ئاستی ناوخۆشدا کۆچی دوایی شێخ مەحمودی نەمر لە ٩ ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٦ دا هەستی مرۆڤی کوردی لە هەموو شوێنێکی کوردستان بە توندی بزواند[٣٢]، هەرچەندە بارودۆخی سلێمانی لەو کاتەدا شڵەژابوو، بەڵام ئەمە ڕێگر نەبوو لەبەشداری کردنی چەندین شاندی کورد لە کەرکووک و هەولێرو کۆیە و ناوچەکانی تر لە پرسەی شێخی نەمردا، تەنانەت شاندێکی هاوبەش لە هەولێر و کۆیە بە دەستپێشخەری پارتی دیموکراتی کوردستان لە بەغدا پێکهات، کە توانیان سەردانی شێخ مەحمود بکەن (لەو کاتەی کە لە نەخۆشخانەی بەغدا) بوو، ئەم شاندە لای شێخ مایەوە تا کۆچی دوایی کردنی، دواتر لەگەڵ تەرمەکەی هاتنە سلێمانی و لەو بارودۆخە ناهەموارەدا بەشدارییی ناشتنیان کرد[٣٣].

لاوانی کۆیە بەردەوام بوون لەدرێژەدان بە خەباتی ڕەوای خۆیان دژی هەموو ئەو پیلانانەی کە حکومەتی عێراق و دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، کە بەردەوام لەدژی دۆزی ڕەوای کورددا خەریکی نەخشەدانان بوون، ئەوەی پەیوەندی بە (کۆیە) وەبێ، ئەوا هەندێ زانیاری لەسەر ئەو کۆبوونەوە نهێنییەی، کە لە چنارۆک ئەنجام درابوو دەخەینە ڕوو، لەو نووسراوەی حکومەتدا هاتبوو: " دوابەدوای هەردوو نووسراوی نهێنیمان ژمارە

(١١٤،٩٤) لە ڕێكەوتی ٢٣ و ١٩٥٧/٧/٢٨، هەندێ زانیاریمان بۆ هاتووە، كە ئاماژە بە بەستنی كۆبوونەوەیەك دەكات، كە لە ڕێكەوتی ٢٣ی تەمموزی ١٩٥٧ لەناوچەی چناڕۆك سەر بەقەزای كۆیسنجەق لە لایەن (٢٥) كەسەوە كە سەر بە پارتی دیموكراتی كوردن ئەنجامدراوە، خوێندكارێكی پۆلی پێنجەمی ئامادەیی لە كۆیسنجەق هۆنراوەیەكی بەزمانی كوردی خوێندۆتەوە، دواتر مەجید ئەحمەد ئاسنگەر (مامۆستا لە دواناوەندی موسڵ) وتارێكی پێشكەش كردووە، زیاتر وتارەكانیان دەربارەی نەمانی حكومەتی پێشوو بووە، هێرشیان كردۆتە سەر حكومەتی ئێستەو پەیمانی بەغدا، باسیان لە ئاستی زانست كردووە لەنێو كوردان و پەیداكردنی پەرتووك بەزمانی كوردی.... دواتر محەمەد سادق وێنەی مەلا مستەفای بارزانی بەسەر ئامادەبووان دابەش كردووە، كە بەجلی سەربازییەوە بووە، چوارچێوەكەی بریتی بووە لەنەخشەو ئالای كوردستان، هەریەك لە ئامادەبووان بڕێك پارەیان بەخشیوە، كە لە (٢٥٠) فلس كەمتر نەبووە، بەنیازن كۆبوونەوەیەكی تر سازبكەن، كە تیایدا پارێزەر عومەر مستەفا ناسراوبە (دەبابە) ئامادەبێ...)[٣٤].

بێگومان بەڵگەنامەی تر زۆرن كە حكومەتی عێراق و كاربەدەستانی بەردەوام چاودێری و بەدواداچوونی ئەندامە چالاكەكانی پارتی دیموكراتی كوردستان لە كۆیەیان كردوون، بۆ بەدیارخستنی رووی راستی ئەم چالاكیانە دەقی بەڵگەنامەیەكی تر دەخەینە روو كە لە ٥ی ئاب ١٩٥٧ دا دەرچووە، لەوێدا هاتووە: " لەئەنجامی لێكۆڵینەوەی نهێنیمان و پەیوەندی كەسێتیماندا، تێبینی ئەوە دەكەین كەوا لەو ڕۆژانەی دوایی ناوی مەلا مستەفای بارزانی بۆتە وێردی سەرزمانی بەشێك لەلاوانی پارتی دیموكراتی كورد"[٣٥].

توێژەر پێی وایە كە مێژووی سیاسی لەم قۆناغەدا بریتی بووە لە مێژووی ململانێی بەردەوام لەنێوان ڕۆڵەكانی گەل لەگەڵ دەسەڵاتدارانی حكومەتی كۆنەخواز لەلایەك، ململانێی پارتە نیشتمان و نوێخوازەكانی سەر گۆڕەپانی ناوچەكە، كە پارتیً و شیوعی بوون لەلایەكی تر، هەر دووپارت ڕۆڵی كاریگەریان لەسازدانی خەڵك بەئاراستەی وەدیهێنانی ئامانجە نیشتمانییەكان و نواندنی هەڵوێستی بوێرو دروست لە ئاست ڕووداوە نێوخۆو دەرەكییەكاندا هەبووە. سەنگ و قەبارەی شاری كۆیە لە پەنجاكاندا گەیشتە رادەیەك، كە بنكەی لقی پارتی لە كۆیە بوو كە دەبوایە لە هەولێر بووایە، ئەمەش لەبەر بوونی ژمارەیەكی بەرچاوی خەڵكی كارای كۆیە لەنێو سەركردایەتی پارتیدا، بەڵام كۆمۆنیستەكان هەرچەندە ڕۆڵی چالاكانەیان لەسەر گۆڕەپانی ناوچەكەدا هەبوو، كەچی شوێنی شیاوی خۆیان وەرنەگرت لەبزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلەكەماندا، چونكە لەوكاتەدا وابەستەی كاری پەیوەندكراوی حیزبێكی سەرانسەری عێراقی بوون، كە خۆیان بەبەشێك لە بزووتنەوەی عەرەب و عێراقیشان بە بەشێك لەوڵاتی عەرەب دەزانی، لەهەمان كاتدا شیوعییەكان خۆیان بەدۆست و هاوپەیمانی نەك بەشێك لە بزووتنەوەی گەلی كوردستان دەزانی.

**سەرچاوەو پەراوێزەكان:**

١- فاتح رەسول: چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی خەباتی گەلی كوردمان، بەشی یەكەم، چاپی دووەم، سوید، (ستۆكهۆڵم)، ١٩٩٨، ل٥.
٢- حبیب محمد كریم: تأریخ الحزب الدیمقراطي الكردستاني (١٩٤٦- ١٩٩٣)، دهوك، ١٩٩٦، ص٣٣ -٣٤.
٣- مەوجود سامان: دڵزار لە دیمانەیەكی تایبەتدا، گۆڤاری (هەرێم)، ژمارە (٣٠٧)، هەولێر، ٢٠٠٤، ل٢٤.
٤- چاوپێكەوتن لەگەڵ ئەحمەد مستەفا محەمەد (ئەحمەد دڵزار) لە ٢٠٠٤/٨/١٢.
٥- عبدالستار طاهر شریف: الجمعیات والمنظمات والاحزاب الكردیة في نصف قرن، (١٩٠٨- ١٩٥٨)، توزیع شركة المعرفة للنشر والتوزیع المحدودة، بغداد، ١٩٨٩ ص١٥٣-١٥٤.
٦- حبیب محمد كریم: تاریخ الحزب الدیمقراطي الكوردستاني العراقي (١٩٤٦-١٩٩٣)، مطبعة خبات، دهوك، ١٩٩٨، ل ٣٥.

٧- د.شیرکو فتح الله: الحزب الديمقراطي الكوردستاني وحركة التحرر القومي الكوردية في العراق (١٩٤٦-١٩٧٥)، ط١، مطبعة روم، السليمانية، ٢٠٠٤، ل ١٠٩.

٨- عبدالستار طاهر شریف: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٤-١٥٥.

٩- مەوجود سامان: سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤.

* مام جەلال: ناوی (جەلال حسامەدین نورەڵڵا)یە لە هاوینی ١٩٣٣ لە گوندی (کەلکان) ی بناری چیای کۆسرەت چاوی بەدنیا هەڵێناوە، دوای ئەوەی باوکی دەبێتە مورشدی تەکیەی تاڵەبانی لە کۆیە، ئەویش لەگەڵ خێزانەکەی روو لە کۆیە دەکات و دەچێتە بەر خوێندن و خوێندکارێکی زیرەک و وریا دەبێت، هەر لە منالییەوە نیشانەی سەرکردایەتی تیادا بەدیار کەوتووە. ساڵی ١٩٤٧ چۆتە نێو ریزەکانی پارتی دیموکراتی کورد، لە ساڵی١٩٥١ دا بووە بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و ساڵی ١٩٥٣ بووە بەسکرتێری گشتی لاوانی کوردستان. ساڵی ١٩٥٤ بووە بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی، ساڵی ١٩٦٤ لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسی بوو کە لە پارتی جیابوونەوە، لە رێککەوتی ١/٦/١٩٧٥ لەگەڵ ژمارەیەک لە دڵسۆزانی گەلی کورد (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)یان دامەزراند کە خۆی سکرتێری بوو. لە رێککەوتی ١/٦/١٩٧٦ جاری شەڕی چەکداریان دژ بە رژێمی عێراق دا. مام جەلال پیاوێکی سیاسەتمەدار و نووسەر و یاساناسە. رۆڵێکی باڵای لە هەڵگیرسانی راپەرینە مەزنەکەی خەڵکی کوردستان لە بەهاری ١٩٩١ دا بینی، هەروەها رۆڵی بەرچاوی لە دژایەتی کردنی رژێمی بەعسی فاشی و رووخاندنی، بەهاوکاری هێزی هاوپەیمانان لە ٩/٤/٢٠٠٣ دا هەبوو. لە رۆژی ٦/٤/٢٠٠٥ دا بەسەرۆک کۆماری عێراق هەڵبژێردرا، ئەمەش بە رۆژێکی مێژوویی بۆ گەلی کورد دادەنرێ، چونکە بۆ یەکەم جارە لە مێژووی عێراق و ناوچەکەدا کەسایەتییەکی کورد ئەم پۆستە لە پرۆسەیەکی دیموکراتی وەربگرێ. (د.خالد یونس خالد: الزعيم الوطني الكردستاني جلال الطالباني قائد وفكر وعصر، منشورات مكتب الفكر والتوعية في الاتحاد الوطني الكردستاني، بدون مكان النشر، ٢٠٠٥، ص ٥ - ٨٠. (کوردستانی نوێ: مام جەلال مێژوو خەبات، ژمارە (٣٦٣٩)، ساڵی چواردەهەم، پێنج شەممە ٧/٤/٢٠٠٥، ل ٨ - ١٢).

١٠- کاکەممم بۆتانی: کاکی کاکان، مرۆڤ و رووناکبیر و شۆڕشگێڕ، خەباتی ساڵانی (١٩٢٤-١٩٦١)، بەرگی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٨، ل ٤٣-٤٦.

** فاتح رەسول لەم رووەوە دەڵێ: " شەوێک لە شەوانی سەرەتای زستانی ١٩٤٦دا، عوسمان و بەندە لەماڵی سەعیدی مەلا ئەحمەد کۆبووینەوە لە گەڕەکی قەڵات، عوسمان وتی: ئێمە هەرسێکمان یەکەم شانەی پارتی کۆمۆنیستی عێراقین لە کۆیە، لەم شەوەوە بە ئێمە دەڵێن لیژنەی شار... بۆیە پێویست بەوە دەکات لەمەودوا زیاتر بکەوینە چالاکی جموجۆڵ بۆ دروستبوونی شانەی زیاتر ". فاتح رەسول هەوڵێکی بێ وچان دەدات لە پێناو گەشەکردنی رێکخستن، دیارە لە دۆستە نزیکەکانی خۆیەوە دەستی پێکرد، کە یەکێک لەوان مام جەلال بوو، لە پۆلی شەشەمی سەرەتایی بوو، فاتح رەسول لەم بارەیەوە دەڵێ: " لە هاوینی ١٩٤٦ دوای نیوەڕۆ، مام جەلال بە دوامدا هات کە پێکرا بچین بۆ پیاسە، مام جەلال کەوتە پرسیار کردن، ئایا کورد ئوممەیە یان نا ؟ منیش ئەوکات وەک تووتی چەند رستەیەک لە کتێبەکەی ستالین لەسەر (الامة)م ... لەبەر کردبوو کەوتمە هەڵڕشتنی و گوتم: تا ئێستە نەبووەتە ئوممە، چونکە چینی پرۆلیتاری تێدا پەیدا نەبووە، مام جەلال بەقسەکانم یەکجار پەست بوو ". " فاتح رەسول: لە کاروانێکی دوورو درێژدا، ل ٤٦-٤٩". توێژەر پێی وایە کە بیری مارکسیزم لە دەڤەری کۆیەدا بوونی هەبووە هەرچەندە لە پانتاییەکی تەسکدا بووە، بەڵام لە پەنجاکاندا زۆر گەشەی کردووە، لە هەمان کاتدا ژمارەیەکی بەرچاو لە رووناکبیرانی ئەم شارە کە هەڵگری بیری نەتەوەیی بوون لەو سەردەمەدا لە خەباتێکی بێ

وچاندا بوون بەمەبەستی دەستەبەرکردنی مافە رەواکانی گەلی کورد، لەم بوارە چوست و چالاک بوون و خەڵکێکی زۆر هاوکارو پشتیوانیان بوون، بەمە توانییان رۆڵی کارا لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورددا ببینن.

١١- حبیب محمد کریم: سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٧.

١٢- کەریم شارەزا: لمحە عن تأریخ کویسنجق وانحائها، العدد (٣)، ص ٤٨ - ٤٩. ئەحمەد دڵزار: بیرەوەری رۆژانی ژیانم، ل ٧٥.

*** مەلا مەجید موفتی: پیاوێکی ئایینی بوو، بەڵام بە تۆمەتی هەڵگری بیری مارکسیزم گیرابوو و بەردەوام شیوعییەکانی کۆیە خۆیان لێ نزیک دەکردەوە بەمەبەستی سەرنجراکێشانی خەڵک ئەگینا شیوعی نەبوو. (چاوپێکەوتن لەگەڵ معتصم عبدالمجید موفتی لە ٢٠٠٤/١١/١٩).

١٣- ئەحمەد دڵزار: بیرەوەری رۆژانی ژیانم، بەشی یەکەم، سەنتەری وەزارەتی پەروەردە،هەولێر، ١٩٩٨، ل٧٥ - ٧٦.

١٤- فاتح رەسول: لە کاروانێکی دوورو درێژ دا (کورتەیی خەبات و ئەزموونی پەنجا ساڵ)، چاپی یەکەم، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٧، ل٧٥.

**** ئەحمەد محەمەد کەریم (نائب عەریف) بوو لە فەوجی یەکی لیوای پازدە لە رێککەوتی ١٩٤٨/٦/٥ لەناوچەی قاقون شەهید بوو، هەروەها حاجی محێدین کە سەرباز بوو لە فەوجی ئالی یەکەم لە رێککەوتی ١٩٤٨/١١/٢٧ لە جەنین شەهید بوو. (عارف العارف: سجل الخلود، اسماء والشهداء الذین استشهدوا في معارك فلسطین (١٩٤٧-١٩٥٢)، ج ٦، منشورات المكتبة المصرية، صیدا (بیروت)، ١٩٥٨، ص٢٣٧- ٢٥٠).

١٥- هەمان سەرچاوە، ل ٢٣٧- ٢٥٠.

***** لە بروانامەکەدا بەهەڵە نازناوی بە زێباری هاتووە لە راستیدا غەفورییە.

١٦- ملفات وزارة الداخلیة، وزارة الداخلیة، رقم الملف: بلا، عنوان الملف: حركات الشمال ١٩٥٠-١٩٥٩، ص١٨٣-١٨٥، مدیریة التحقیقات الجنائیة - الشعبة الخاصة، العدد ٥٢٥١ التأریخ ٩ تشرین الاول ١٩٥٢.

**** هەریەکە لە عەلی عەبدوڵلا، جەلال تاڵەبانی، عومەرمستەفا (دەبابە)، حەمەد ئەمین مەعروف خەڵکی (کۆیە)ن.

١٧- عبدالستار طاهر شریف: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٧ - ١٨٩.

****** یەکێک لە خۆپیشاندەران بەرگی کفنی مردووی لەبەر دابوو لە پێشەوەیان دەڕۆیشت و دەمانچەیەکی بەدەستەوە بوو، کە ناوی (ئەسعەد محەمەد حەوێزی) یە ناسراو بە (مام ئەسعەد کفن لەبەر) پڕ بەدەم هاواری دەکرد (هەڵبژاردن نییە، ئازادیخوازان لە بەندیخانەن)، (کەریم شارەزا: لمحة عن تأریخ کویسنجق وانحائها، العدد (٣)، ص٤٩).

١٨- کەریم شارەزا: لمحة عن تأریخ کویسنجق وانحائها، العدد (٣)، ص ٤٩.

١٩- مەسعود محەمەد: گەشتی ژیانم، چاپی یەکەم،ستۆکهۆڵم، ١٩٩٢، ل ٢٩٠-٢٩١.

٢٠- چاوپێکەوتن لەگەڵ جەنگی بورهان نوری (شێخ جەنگی تاڵەبانی) لە ٢٠٠٤/١١/١٨.

٢١- مەسعود محەمەد: گەشتی ژیانم، ل ٢٩٣.

******* دانیشتوانی کۆیە بەدەنگ داواکەی حیزبی شیوعییەوە چوون، بەڵام هاتوچۆی نێوان کۆیەو هەولێر وەستا، ئەوکاتە (خالد نەقشبەندی) قائمقامی کۆیە بوو و بەم رووداوە زۆر شڵەژابوو. جەماوەری مانگرتووی کۆیە چەندین بروسکەیان بۆ هەریەک لە پەرلەمان و سەرۆکی وەزیران و رۆژنامەکانی بەغدا بەرزکردەوە، خۆشبەختانە ئەوکاتە مەسعود محەمەد نوێنەری کۆیە بوو لە پەرلەمانی عێراق، توانی مانگرتنەکە بقۆزێتەوەو یەکسەر داوای لە وەزیران و نوێنەرانی پەرلەمان کرد پشتگیری داوا رەواکەی شاری کۆیە بکەن، بۆ ئێوارە وێستگەی بەغدا بڕیاری وەزارەتی بڵاوکردەوە، کە بودجەی پێویست تەرخان کراوە بۆ کردنەوەی رێگای نێوان کۆیە و

رانیە و قیرتاوکردنی، ژمارەیەک لە کەسایەتییەکانی ئەو کاتەی کۆیە ڕۆڵی دیارو بەرچاویان هەبوو لەم کاردا، کە بریتی بوون لە: سەعید مەلا ئەحمەد، شێخ جەنگی تاڵەبانی، مەولود رەسول، تۆفیق مەلا کەریم، محەمەد حەیدەری، غەفور حاجی یەحیا، مەلا قادر حەمەگرانی. (فاتح رەسول: لە کاروانێکی دوورو درێژ دا، ل٩٦-٩٧).

٢٢- فاتح رەسول: لە کاروانێکی دوورو درێژ دا، ل ٩٦.

********* محسن ئاغا لەو باوەڕەدایە کە ململانێی نێوان ئەم دووپارتە لە کۆیە لەبەر ئەوە بووە، کە بنەماڵەی غەفوری هەموویان پارتی بوون، بنەماڵەی (حەوێزی)یەکانیش لە رقی غەفورییەکان هەموویان بوونە شیوعی، ناکۆکی و رکابەری دێرینی ئەم دوو بنەماڵەیە رەنگی دابۆوە لەسەر پەیوەندییەکانی ئەم دووپارتە، چونکە ئەگەر مەسەلەی ململانێ نەبوایە، ئەوا (حەوێزی و شیوعی کوجا مەرحەبا). (چاوپێکەوتن لەگەڵ موحسین عەزیز عەبدوڵلا لە ١٧/١١/٢٠٠٤). بەڵام جەلال جۆبار وای بۆ دەچێ کە هۆکاری ململانێ لەسەر ئەوەدبوو، شیوعییەکان لەکۆیە منداڵیان فێردەکرد بڵێن: بمرێ کوردستان، یان بە مەعارفی کوردستانیان دەگوت مەعارفی قلیاسان، وەک بێ نرخ کردن و سووکایەتی کردن بەدام و دەزگای کوردی، جگە لەوانە شیوعییەکان هەتا ساڵی ١٩٥٦ گەلی کوردیان بە نەتەوە نەدەزانی، بەڵکو وەک کەمایەتییەک سەیریان دەکرد. (چاوپێکەوتن لەگەڵ جەلال سەعید عەبدوڵلا لە ١٧/١١/٢٠٠٤).

٢٣- چاوپێکەوتن لەگەڵ مەولود حسین مەولود لە ٢٥/٨/٢٠٠٤.

٢٤- چاوپێکەوتن لەگەڵ فەرەیدون محەمەد مستەفا لە ٢٦/٨/٢٠٠٤.

٢٥- أحمد دلزار: لمحات من تأريخ الحزب الشيوعي، منشورات طريق الشعب، أربيل، ٢٠٠٢، ص٢٧.

٢٦- الدولة العراقية، مجلس النواب، الدورة الانتخابية الثالثة عشرة، مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٥٣، ص ٤٧٧.

٢٧- چاوپێکەوتن لەگەڵ کەریم مستەفا محەمەد (کەریم شارەزا) لە ١٢/٨/٢٠٠٤.

٢٨- کەریم شارەزا: لمحة عن تأريخ كويسنجق وانحائها، العدد (٣)، ل ٤٩.

٢٩-أحمد دلزار: لمحات من تأريخ الحزب الشيوعي العراقي، منشورات طريق الشعب، بدون مكان الطبع، ٢٠٠٢، ل ٣١.

٣٠- جلال الطالباني: كردستان والحركة القومية الكردية، الطبعة الثانية، دار الطليعة، بيروت، ١٩٧١، ل ١٧٠-١٧١

کاکەمەم بۆتانی: سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٩ -٢٣٤.

٣١- چاوپێکەوتن لەگەڵ مەجید ئەحمەد حەداد (مەجید ئاسنگەر) لە ١٤/٨/٢٠٠٤.

٣٢- وەلید حەمدی: کوردو کوردستان لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیادا، وەرگێرانی: محەمەد نوری تۆفیق، چاپی دووەم، چاپخانە و ئۆفسێتی هەواڵ، سلێمانی، ١٩٩٩، ل ٢١٩.

٣٣- د.اسماعيل شكر: اربيل دراسة تاريخية في دورها الفكري والسياسي (١٩٣٩-١٩٥٨)، ط١، مركز شهاب للكومبيوتر والطباعة، ٢٠٠٣، ل ٢٨٥.

٣٤- ملفات وزارة الداخلية، وزارة الداخلية، شعبة المخابرات السرية ١٩٥٦، رقم الاضبارة: ٤١//٢٦ القسم الثاني، العنوان: الجمعيات والنوادي، الموضوع: حزب البارتي الديمقراطي الكردي، ص٤٩، مديرية أمن منطقة الموصل في كركوك، العدد ١٥١ س، التأريخ ١١ أب١٩٥٧

٣٥- ملفات وزارة الداخلية، وزارة الداخلية، شعبة المخابرات السرية ١٩٥٦، رقم الاضبارة: ٤١/٢٦/القسم الثاني، العنوان: الجمعيات والنوادي، الموضوع: حزب البارتي الديمقراطي الكردي، ص٣٦، صورة كتاب مديرية شرطة لواء السليمانية، المرقم: ٦٦٦، والمؤرخ في ٥ أب. ١٩٥٧

# (هۆنراوەی)عەرەبی لە هەولێر لە سەردەمی موزەفەرەدین كەوكەبەریدا(٥٢٦-٦٣٠)

دكتۆر عوسمان ئەمین سالح
كۆلێژی زمان- زانكۆی سەلاحەدین

**وسف و شەراب و سۆفیگەری سكالاو برایی**

بەشێكی گەورە لەشیعری وەسف لەو میرنشینەدا ئیبن زەهیر هۆنیویەتیەوەو لەو بارەیەوە ئەندێشەیەكی بەپیت و توانایەكی بەهێزی هەبووە لەوێنەدا لە هەمان كاتدا بەپێشەنگی یەكەمی ئەو هونەرەش دادەنرێت. سروشت لای حاجری خوناوی مانەیەتی و چێژ لەتێروانینە جوانیەكەی وەردەگرێت، هەروەها چێژ لە شەراب وەردەگرێت كەلەباوەشی دەگرێت، كتوپر وەسفی دەكات وەدەنێرێت بەبێ ئەوەی دەست كردی بكات. وەسفی سروشت لای نشابی وەك پێشكەشێكی بێ مەبەست هاتووە، لەبەر مكۆربونی لەسەر لاسابیركردنەوەی كەمەبەستە چێژ بە تێكستی ستایشی خوداو بەهونەرەكانی دیكەی شعر نەخوازە لاوەسف پێبدات. بەهارو دیمەنەرەنگینەكانی شاكەشتن كە كاریان لەبیری ئیبن زهیر كردبێ، ئەوە بەهەردكەیەتی وهەژاندویەتی وسۆزی ورووژاندوە. بەشعری وێژدانی راستەقینە هۆنیویەتییەوە[١] هەروەكو لە(الكامل)دا دەلێت.

**والارض قد تبست ماءة سندس**
**مني علي نوء الضمام الباكر**
**نسجت لها أيدي السجاب مطارفا**
**موشية من كل بون باهر**
**من احمر باك وابيض باسم**
**اواصفر شاك وخضر شاكر**

**قد شق لطم القطر خد شقيقة**
**وحبت عليه يد السحاب الماطر**

سەرنج دەدەین شاعیر بەزۆری باسكردنی بەهارو خواردنەوەی شەرابی لەباوەشیدا كۆكردۆتەوە:

**فاشرب على وجه الديع مدامة**
**قد قلدت في تأسها بجواهير**
**جليت فنقطها المزاج تلؤلؤة**
**متساقط من كأسه متناشر**
**يفيك عن ضوء النهار شماعها**
**كالشمس في خلك السرور الدائر**

هەروەها حاجری هەمان رێگەیی لەوەسف كردنی بەهار گرتۆتە بەرو لە (الكامل) دادەلێت:[٢]

**وترنم الاطياري تحسب انها**
**اصوات شاط مطرب الالحان**
**وترقرق الماء انفراج على حصى**
**كالدر والياقوت والمرجان**

وادیارە نشایی زۆر موتەعلیق بووە بەوەسفكردنی شارو نەهامەتیەكەی كەلەسەر دەستی مەگولەكان بەسەرشاری هەولێر داهات ،زۆركاری لەخودی شاعیر كردووەو هەستی بەزۆر شێوە جولاندنووەو باس لەحەوانەوەی هەولێر دەكات، لە عەسرێكیش داگریاوە بۆدەقی خوازیارەكانی لەكاتی لاوبەتیداو دەلێت[٣]

**دیار لها بالجزع فاعتقلم**
**اخاطب منها دمنة لم تكلم**
**عنيت بها دهرا اجرردونها**
**ذيول شباب الناعم المتنعم**

پاشان باس لەخاوەنی هەولێر دەكات كە هەورێكی چری غەدری بەسەر داهێنابوو ،هات چاودێریكردو بالندەكان لەخۆشیا نەغمەو ئاوازیان دەچری:

**مواطن كانت قبل وقعة أربيل**
**تناخر فيها الغيدو من كل مجثم**
**فأمست خلاء ان اناضت برمجها**
**ركاب فتي مستوبل متوخم**
**سفر أربيل الغراء صوب غمامة**
**لعل ثراها بعدما بف يرعي**

زۆر لەشاعیران لەزۆر كۆپلەی شیعرەكانیان دا وەسفی هەولێریان كردوە[٤]ئەوەتە عومەر بن شەماس خەزرەجی[٥]وەسفی (نیلوخر)[٦]دەكات بەپیرۆزی كە هیچ داستانێك نییە لە داستانەكەی ئەو جوانتر بێ و لە (الطويل)دا دەلیت[٧]:

**ونيلوخر مثل النجوم ببركة**
**كلون السماء وهي من خصر عذب**
**يميل مع الشمس المنيرة مثلما تميل**
**عيون العاشقين مع الحب**

بایەخ دان بەبەشەكانی دیكە، هەولێریەكان وەسفیان كردوە زۆر لەشاعیران لەدێرە شعرەكانیان دا رازاندویانەتەوە، مەزەندەكانوای دەچن كەعوزریان لەدلداری خۆشەویستەكانێن هێنابێتەوە ئەمیش بەهۆی ئەو ردوشە كۆمەلایەتیەی تایبەت بوە بەهەولێر. ناچاربونەلەهزر وێنەیان بكێشن وباس لەوسێبەرەبكەن كەبەشەو سەردانیان نەكردوون چونكە خۆشەوستیەكەیان راستە قینەبووە.

سەرجەم شاعیران بەژداریان لەوەسف كردووە، تەنانەت بكرە وەسف پالی بەیەكی لەشاعران ناوە كتێبێكی لەسەر دابنێ ئەویش ئیبن زهێری هەولێرییە باس لەسێبەری خۆشەویستەكەی دەكات كاتێ هاتۆتە لای و ئەو خەوتود لە (مجروء الكامل المرفل) دا دەلێت[٩]

**اتظن اتك عاشق وتبيت في المحبوب العالم**
**الطيف أعشق منك إذ يسري اليك وانت نائم**

لای بەهائەدین هەولێری سێبەر سەردانی ئەو كەسە دەكات كەخۆشی دەوێت. هەروەكو لە (الخفيف)دا دەلێت:[١٠]

**كنت ترضي بالطيف ان عاوة النوم جنوناكما زعمت قصارى**
**فجرت بالذي تريد المقادير ووفاك من تحب وزارا**

هەولێریەكان حەزیان لەجوانی كردوە، بەشەفافیەتەوە وەسفیان كردووە. خۆشەویستی شاعیران بۆجوانی گەیشتۆتە ئەو ئاستەی لای هەندێكیان سنوور دابنێ لەشووین دانانا، لەشوین چاوهەستی تەواویان خەملاندووە،وێژدانیان بۆوەتە عاشق ئەوەتە موعزی هەولێری لەوێژدانی خۆی دا وێنەی خۆشەویستەكەی دەكێشی و لە(الريح) دادەلێت: [١١]

**وكاعب قالت لأترابها**
**ياقوم ماأعجب هذا الضميري**
**هل تعشق العينان مالاترى**
**فقلت والدمع بعيني عزيز**
**ان كان طرضي لايرى شخصها**
**فانها قد صورت في الضمير**

زۆر كاریگەر بوونە بەخاڵ، شاعیران بایەخیان پێداوەو بەهەندیان هەڵگرتووە بەتایبەت حاجری كەژمارەیەكی زۆری لەسەر هۆنیوەتەوە هەروەكو لە مجزء الخفيف دا دەلێت:[١٢]

**لک خال من فوق عمر شی شقيق قد استوى**
**بعث المصدغ مرسلا يأمرالناس بالهوى**

لێرەدا وەسفی خاڵێک دەكات كەلەسەر نێو چەوانی خۆشەویستەكەیەتی چونكە شاجوانێكەو لەسەر كۆشكی شایەتی دانیشتووە، دلی دیداران بۆخۆی سەرنج راكێش دەكات، پاشان وەسفی ئەو خالەی دەكات كەلەسەر كولمەیەتی، هەروەكو لو (الكامل)دا دەلێت:[١٣]

**ومهفهف من شعره وجبينة**
**يغدو الورى في ظلمة وضياء**
**لاتنكروا الخال الذي في خدة**
**كل الشقيق بنكتة سوداء**

**(شەراب)**

لەو ماوەیە لە حوكمرانیەتی میر نیشیدا باو بووە،هەڵوێستێک بووە لەژیان بەوەی تێكستێک بووەو رۆیشتووە، وێنەیەكەو رەگوریشەی فەلسەفەكەی درێژ دەبێتەوە بۆ سەردەمی ئەبی نەواس، ئەوانەی وەكو ئەو بیر

دەكـەنەوە بروایان وایە كـەژیان مـاوەكـەی كـورتە، بۆیە پێویستـە مـرۆڤ بەفـیرۆی نەداو بەچێژولەزەتەوە تیـایدا گوزەر بكات (١٤) پشت بەستن بەو قسەیە ئەو هونەرە بەر جەستە دەبێت لەلایەنی بێ هوددیی و خۆش ژیانی مرۆڤ دا حاجری لەپێشەنگی ئەو شاعیـرانەدێت كە بەهەلوێستێكی واقیـعانەی سەلمێندراو تێپەر بووە. لەوسـیفەتەیدا پشت بەشراب دەبەستێ لەپرەنسیپی چێژوەرگرتندا. تەمەن كورتە هەرچەند درێژبێت، لەتراویلكەیەک زیاتر نییە هەروەكو لە (الخفیف)دادەڵێت:[١٥]

**فاذا امكنتك فرصة لهو فاقترح من زنادها بشهاب**
**وتضم صفو الزمان فإن العمر ان طاك لمعة من سراب**

نەشـــابیش لەهەمـــان هەلوێست هاورایەتی و لە (البسیط)دەڵێت[١٦]

**ياراقــدا من زمــان اللذة انتبــه**
**خالوقت سمع و هذا القيش أنتـايه**

لەراستیدا لێرە ژمارەیەک فاكتەر هەن بۆ بلاوبوونەوەی شیعری شەراب لەوانە فـاكتەری ئابووری و كۆمەلایەتی و ئەخلاقی. ئێمە تەماشا دەكەین لەدەست دانی ئەم فاكتەرانە لەژیانی ئەو مـیـر نیـشـینـە ئارامـە دا، هەمـوویان لەژێر سێـبەری قـیـرەدا دوەرەكـەیا مـوزەفـەرەدین كـەوكـەبەری لەخۆشیدا ژیاون. شتێک نیە داوابكات خۆشی ژیان لێک بكاتوو سەرگـەردانی بووروژێنێ و بێئـومێـدی بخاتە ناو خـودیانەوە تاهەندیک پەنا بۆخـواردنەوەی شـەراب بەرن و ئاوری لێبدەنەوە.

ئەم هونەرە بەم شێوەیە لە هەولێر ناسرا. ئەو شاعیـرەی هۆنیـویەتەوە تەنهـا لاسـایی كـەرەوەیەک بووە ذوور بووە لەواقیع تەنها هەندی لەكۆیلە شیعرەكانی حاجری نەبێت كە بەپێشـەنگی شعری شەراب دادەنرێت لە كۆمەڵگەی هەولێر دا. بەشێوەیەكی بێ سنور عاشقی شەراب بوە، هەمیـشـە داوایی كـردوە، ئامـانجی هیـواو ئاواتی بووە هەروەكـو لە (الدوبین)دا دەڵێت: [١٧]

**مــاأطيب مــاأبيت سكران طرع**
**لا اخرق مـابين جـمـيـل وقـبـيح**
**والديك الي الصبح يدعو ويصيتع**
**مـا فـاز بما يأملة قط سـشـحـيح**

هەروەها لە (الدوبیت) دادەڵێت: [١٨]

**مـن ثاء لـه الؤال عن أخـبــاري**
**فليـســأل عني حـانة الخـمـار**
**كـأست بيـد السـاقي وتأس بيـدي**
**والعــود مناد في الي الاسـمــار**

شاعیرانی هەولێر هەوڵیان داوە مانای وا بدۆزنەوە كە باس نەكراوە،نەشیان ویستوە لەم مەبەستە سود لەتەواوی مانای ئاینیەوە وەربگرن لەبەر دووهۆكار كەدوولایەنی دژن. لەگەڵ ئەوە وادیارە هەندێكیـان بەهاكـانی ئاینیـان بەهەند هەلنەگرتووە هەروەكو حاجریلە (الخفیف)دا دەڵێت:[١٩]

**يانديمي عــوجـابي جـمــيــمـا**
**نشـرب الراح كـالصلاة جـمـاعـة**
**خـمــرة لورأي العــزيز جـمـصـر**
**لونـهـا في الكوس أرهن صـاعـه**

**(سۆفی گەری و لە خوا ترسان و حیكمەت)**

گومـان لەوەدانیـە كـە ئەیوبییـەكـان بـایەخیـان بەبزاوتی سـۆفـیـگەری داوە.[٢٠] وێرای ئەوە ژیان لەهەردوو چاخی شـەشـەم و حـەوتەمی كـۆچیـدا بەرادەیەک روو لەخـوایی گەورەبوو، تەسلیم بووبون و زوهدیان دەكرد لەدونیادا.

شـایانی باسـە ژمـارەیەک لە حوكـومـرانانی ئەومـاوەیە هەڵسـان بەدامەزراندنی خانەقا بۆسۆفیە هەژارەكان وەپارەی تایبـەتیـان بۆ تەرخـان كـرا بۆخـەرج كـردنیـان. لەسـەرووی هەموویانەوە میری هەولێر موزەفەردین. بەدووریش ناگیرێ كەلەوانەیە ئامـانجی خاوەنی هەولێر كۆكردنەوەی هێزێكی ئیـمـان دار بووبێ بۆئامـادەكـردنیـان بۆشـەر لەگـەڵ خـاچ پەرستـەكـاندا لەهەركاتێک كەویستـیبـای. كـەلەجـەنگی حێتنی بەناو بانگ دا سەركردەی سوپایی رۆژهەلات بوو.

شیعری سۆفـیگـەری یەكێكە لەو بابەتانەی لەو ماوەیەدا سـەری هەڵداو لەناخی لەخـوا ترسـەكـان دەنگی دایەوەو، لەزكرەكـانیـان دەیان گـوتەوە.بەداخەوە ناتوانین هەلوەستە لەسـەر بەرهەمی زۆری ئەوهونەرە شـیـعـریە بكەین وێرایی ئەوەی لەو ماوەیەدا رەواجی زۆربووە. ئەوەی بەدەستیشمان گەیشتوە زۆر كەمەو بەپێی مەزەندەی ئێمە هۆكارەكە بۆئەوە دەگەرێتـەوە شاعـیری سۆفیگەری نەبوونە كەشعرەكـانیـان بەرجـەسـتـەبكەن لەبیـرۆكـەی زاهیـدوو سـۆفی گـەریدا. سەرەرای ئەوە ژینگەی هەولێر بایەخ و گرینگی بەزانست و رۆشن بیری داوە بایەخ دان بەزاناو ئەدیبەكـان بەدیراسـەت

کردنی قورئانی پیرۆز و فەرموودە بەنرخەکانی پێغەمبەرو زمان. هەروەها هەولێر زاناو شاعیرو مێژوو نووسی بەناو بانگی تیادا هەڵکەوت، بەلام شاعیرێکی سۆفی گەری تێدا هەڵنەکەوت کەلەشعرەکانیدا مانای لەخواترسانو حکمەی بەرجەستە کردبێ.

سەرنج دەدەینە شیعرەکانیان زۆر ماناو واتالەخۆ دەگرن. تەمەنی دوونیا کەمە، دەروات، هەمووشتێک ئەجەلی خۆی هەیە. حاجری پاش ئەوەی محنەتی بەقەد میخانەی چێشت لە(البسیط) دادەڵێت:[22]

**من شيمة الدهر اعراض واقبال**
**فما يدوم علي حالاته حال**
**وكل شيء-وارف الحيارله أجل**
**يقضي عليه كما للنار أجال**

کاتێ لەشعرەکانی نشابی دەروانین سەرنج دەدەین خۆی بەستۆتەوە بەئەخلاق و قسەی نەستەق، هەروەها وادیارە هەول دەدات بارگرانی بەندی خانە هەندی لەسەرخۆی سوک بکات هەروەکو لە (مخلع البسيط)دادەڵێت: [23]

**والدهر يومان ذايهمني**
**بما أتاه وذا يعني**
**فلا المفي بدوم فيما**
**عني به ولا المهني**

وێرای ئەوەی ژمارەیەک لەشاعیران خووی تگرتووە بە حیکمەت و ئارامگرتن و بەرخودان لەسەر نەهامەتیەکان کە بەلایەنێکی راستەقینەی ژیانە، تەماشادەکەین دیاردەیەکی دیکەی سەرنجی خوێنەر بۆ خۆی رادەکێشی، ئەویش ئەو بانگەشەیەکە بۆلەخواترسان و سۆفی گەری دەکات بەجیهادکردنی نەفسو پاک کردنەوەی لەنەخۆشیەکانی دونیا بۆرەزامەندی خوای گەورەو تابێتەمایەی لێبوردنی. هەروەکو لەسەرزاری عەرشەدینی هەولێری لە (البسيط) داهاتووە[24]

**المهدالله اني في مجاهدة**
**صما أقاسيمي وحي ذاك يكفاني**
**ولست أبغي سوي عفوو متحقرة**
**من الالة اذاما الموت فاجاني**
**فأن بلغت الذي ارجو وأملة**
**زالت هموي واوجاعي وأحزاني**

لەسەر ئەم بنچینەیە تەماشادەکەین هەندی لەشاعیران سنووری حیکمەیان بەزاندووە و زیاتر زیاتر روویان لەرێنمایی کردووە کە کەدەچێتەوە سەر رێگەی شاعیر ئەباعەتاهیە،ئەوەش نموونە یەکە لەشیعری عیزەدین حەسەن کوری محەمەد هەولێری یەکەلە (مجرء الكامل الندیل) دادەڵێت:[25]

**هذا الوجود مكدر**
**فانهض الي اصفي وجود**
**واطلب مقرك في العلي**
**ان كنت من اهل السعود**
**قرب الرحيل اليهم**
**فخدارهم غيربعيد**

شاعیرانی هەولێر کارێکی وایان لەپاش خۆ بەجێ نەهێشتوە کە دەلالەت لەسەر شیعری حیکمەو فەلسەفەو بینای بۆ ژیان ومردن، مانەوو نەمان، بەرجەستەدەکات .کەپرە لەئامۆژگاری و رێنمووی جیاجیا دەربارەی کاروباری ژیانی مرۆڤ. ئەوەتا لە(الخفيف) دادەڵێت

**كل حيء اليالممات مابه**
**وحدي عمره سريح ذهابه**
**ثم في قبرة سيمشرو فردا**
**واقفا وحده يوفي حسابه**

ئیبن کەسیر دەربارەی ئەوتێکستە دەڵێت: (تێکستەکە دوورو درێژوو خۆی لەپەنجا دێر دەدات)[28]، لەکاتێکدا ئەوتێکستەی گەیشتۆتە دەستمان لەدیوانەکەیەوە (١٢١)دێرە. ئەمەش بەلگەیە لەسەر ئەوەی کەشعری حکمە لای ئیبن زەهیر بیرهاتنێکی هزری نەبووە، بەڵکو ئاراستەیەکی دروست بووە، بەرنامەیەکی قووڵ بوود کەشاعیر لەسەری رۆیشتووەو پراکتیزەی کردووەو پێی ورووژاوە لەماوەی ژیانیدا.

## (شیوەن)

لە دیاردە ئەدەبییەکان کەتوێژەر هەڵوەستەی لەسەردەکات لەشیعری میرنشینی هەولێر کەمی شیوەنە لەچاوبابەتەکانی دیکە ئەمە لەلایەک، لاوازی و بێهێزیش لەلایەکی دیکە. کاتێک چاو بەشعری هەولێر دەخشێنین خوێنەر هەست بەدەگمەنی ئەوجۆرە شعرە دەکات. وادیارە لەراستیدا ئەوجۆرە هونەرە هەربوونی نەبووە تەنها ئەوەنەبێت کە لەدیوانی ئیبن زەهیردا دەبیندرێ.

تێکستێکی پربەهاش هەیە لەشیوەنی شێخی ئیسلام محیەدین ئەبی زەکریا نەوەوی حافز[٢٩]کە لە (البسیط) دادەڵێت[٣٠]

**عـزالغـراء وعـمم الحـادث الجلل**
**وخاب بالموت في تعمـيـرك الامل**
**واستوحشت بعدماكنت الأنيت لها**
**ومسا ها فـقـدك الاسمـاء والاصل**
**وكنت تتلو كـتـاب الله مـقـتـبـرا**
**لايعـــذيك علي تكراره مـلـل**
**قـدكـونت للدين نورا يستـضـاء به**
**مـسـددا فـيـه منك القـول والعـمل**

لە مەیدانی شیوەنی وەزیراندا، گەورەی شام لەنامەیەکدا کە دەنێرێت باس لەشتەباشەکانی وەزیری خوالێخۆش بووئیبن مستەوفی دەکات وئاماژەی پێدەدات وبەیەکێ لەگەورەپیاوانی سەردەمەکەی دادەنێت لە (الوافر) دادەڵێت.[٣١]

**ابا البـــركـــات لودرت المنايا**
**بانك فـرد عـصـرك لم تعـبكا**
**كـفي الاسـلام رزؤآ فـقـد شـخص**
**عليـه باعـينه الثـقلين ينبكي**

هەروەها شاعیر لەیەک کاتدا شیوەن بۆ دوو گەورە خوالێخۆشبوو دەگێرێت کە ئەمە شاعیر بەهائەدین علی هەولێری لە شیوەنەکەیدا گێراویەتی بۆ شاعیزەدین عەبدلعەزیز کوری جەعفەر[٣٢]ونەسرەدین توسی[٣٣]کەلە (الطویل) دادەڵێت:

**ولما قـضي عـبدالعـزيزبن صـمـفـر**
**وأردفـه رزء النصـيـر مـجـد**
**جـزعت لفـقـدان الاخـلاء وأنيـرت**
**شـؤوني لمرفض الجـمـان المبـدد**
**وجـاشت الي النفس حـزناولوعـة**
**فـقلت تعـزي واصـبـري خكان مـد**

لەدیارترین جۆری شیوەن لە تێکستی شاعیران دا شیوەنی خزم وکەسوکارو هاورێیان بوو، لەم بارە سلێمان کوری جوبرائیل کوری متعەی هەولێری[٣٤] شیوەن بۆهاوریەکەی دەگێرێ هەروەکولە (الکامل)دا دەڵێت[٣٥]:

**ولكل بين قـــائـم من فـــقـــده**
**فـكـانـه للعـــالمين نـســيـب**
**يااوحـدا فـجـعـت بـه مـهج الوري**
**فـــيـكنت عليـــه نـواظرو وفلـوب**
**روي تراك وانســـتك تحـيـــة**
**تفـــدو علي طول المدي وتئووب**

مادامەکی باس لەشیوەن دەکەین لەجێی خۆیەتی کە ئاماژە بەگرینگرین سیماتەکانی بدەین جگەلەوەی کەلەو شیعرانەی لەوجۆرە بەدەستمان گەیشتوون. سەرنج دەدەین شیوەنگیر راستگۆ بووە لە شیوەنەکەیدا، لەناخیەوە نیگەران بووەو خەمی خواردوەو زۆر شتیش لەبارەی مردوەکەی باس کردووە هەروەکو ئیبن خەلکان[٣٦]لە (الطویل) دادەڵێت:

**لئن اظلمت دنيـا الغـمـاة لفـقـده**
**فـقدأ شرقت من وجهه خبة الخله**
**عليك سلام الله ياخـيـر مـالك**
**مضي غير مصحوب سوي حلة المهد**

بەلام لەشیوەنی کەسوکارو هاورێیان دا، بەزۆری شاعیر راستگۆبووە لە هەست و سۆزی بەرامبەر ئەوەی دڵ ونەفسی رووبەرووی بۆتەوە. شاعیر جیدی بووە چونکە بەئەزموونێکی راستەقینە تێپەر بووە بۆنموونە ئەحمەد کوری عەبدولرەحمان کوری خەلکان کوری شاکلی هەولێری بەراستگۆی شیوەنی ئامۆزاکەی دەکات هەروەکو لە (الکامل)دا دەڵێت:[٣٧]

**عظم المصـاب فـفـر فـيـه عـزائي**
**وتيـدلت مـحـيـراتنا بدحـاء**
**وتضـرمت لغـرافـه نار الجـوي**
**وتأجـبت في القلب والاحـشـاء**

## (سکاڵا)

سەرنج دەدەین ئەوجۆرە شیعرە لەهەولێر باو نەبودو گەر هەشبووبێ زۆرکەمبووە، ئەوەیەش هەش بووبێ لەکاتی نایاسایی وتراوە. چونکە ویستی داواکاییەکانی ژیان لەژیانی رۆژانەی شاعیردا بەشعری بۆنەکان دەشبهێنێ. بەپێی مەزەندەی ئێمە هۆکارەکە بۆناستی سەقامگیری ژیانی ئابووری ئەو میرنیشینەبچووکە وخێرو بێرەکەی دەگەرێتەوە کە لە هەموو روویەکەوە بەشی دەکرد لەلایەک و، لەلایەکی تر میریش بایەخی بەژیانی هەژارو دەستکورتان دەدا. بەو ئاستەی کە بارێکی نیگەرانی نەبوو

لەتەنگی ژیان تاپەنابۆسکالابردرێت. نموونەشی بۆئەم راستیە شعری سکالا کەلەبەر هەژاری ونەبوونی گوزەران گوترابێ زۆردەگمەنە. جگە لەچەند نموونەیەکی شعری نەبێت.بەمەزندەی ئێمە شاعیر سکالاکەی ئاراستەی ئەوکەسانە کردووە کە ئاوریان لەدەست کورتیەکەی نەدابێتەوە ئەویش ئەبو رەبیع سلیمان بن بلیماق هەولێریە کەلە(الطويل)دا دەڵێت:(٣٨)

**خليلي كم أشكوالي غير راحم**
**واجعل عرضي عرضة للوائم**
**واسحب ذيل الذل بين بيوتكم**
**وأقرع في ناديكم من نادم**
**هبوني ما استوجبنت حقا عليكم**
**أما تقديركم هزة للمكارم**

لەراستی دا گەرگوتمان جۆری شیعری سکالاهەیە،بەلام لەو ماوەیەدا ناچێتە خانەی ئەوجۆرەی کەناسراوە سکالا لەشاومیرەکان کرابێت لەهەڵوێستی تایبەتدا کەشاعیر لەماوەی ژیانیدا رووبەرووی بووبێتەوە. کەئەمەش جارێک لەوەزیر ئیبن مستەوفی روویدا کاتی بەشەو لەمزگەوت دەرچوو لەلایەن کەسێکی نەناسراو بەچەقۆ هێرش کرایە سەری بەمەبەستی ئەوەی چەقۆکەی لەسنگی بدات، بەلام قۆلی گرت و برینداری بوو، برین پێچ گەیشتێ ودووریەوە، جابەم بۆنەیەوە سکالای ئەو ئیش وژانەی لەجەستەیەتی بۆ موزەفەرەدین کەوکەبەری نووسی و لە (الكامل) دادەڵێت:(٣٩)

**ياايها الملك الذي سطواته**
**من فعلها يتعجب المريخ**
**ايان جودك محكم تنزيلها**
**لا ناسخ فيها ولا منوخ**
**اشكو اليك وما بليت بمثلها**
**شنعاء ذكر حديثها تاريخ**
**هي ليلة فيها ولدت وشاهدي**
**فيما ادعيت القمط والتمريخ**

ژمارەیەک لە شاعیرەکانیش سکاڵای خۆیان لە زەمەن و رۆژگار کردووە بەهۆی ئەو مینەتانەی توشی بون،سکالای زیندان لەچوارچێوەی ئەونوشتانەودو رووبەروبونەوە بووە.شاعیر لەتوانایدا نەبووە ئاماژە بەو شاومیرانە بدات کەغەدریان لێکردووەو ستەمیا لێکردوە بۆسکالاکەی بەرۆژگار هەڵدەرێژێ. بەڵێ رۆژگار هێمای کۆژانە سیاسیەکان بووە لە هەولێر، بۆیە سەرنج دەدەین هیچ شوێنەوارێک لەشیعرەکانیان نادۆزرێتەوەو هیچ شوێنەوارێک لەشیعرەکانیان نادۆزرێتەوەو بەدی ناکرێت. دیارە نشایی لەشعرەکەیدا سکالا بەزەمەن بەستۆتەوەو تیایدا ناوی ئەو شاومیرانە هێناوە کەلەناوکۆشک و تەلاری بەرزوقایم دان، دوایی هەموویان لەقەیری تەنگدا دەبینێت، بێگومان ئەمەش ئاماژەدەرە بۆبینایی شاعیر کەچارەنووسی میرەکەی بەوەدەگات کەزیندانی کردووە هەروەکو لە(ضحلع البسيط)دادەڵێت(٤٠)

**وفي الزمان الذي وحدنا**
**كم قدراينا وكم سمعنا**
**وكم رزينا وكم نفينا**
**وكم ألفنا وكم فقدنا**
**اين الملوك الذين شادوا**
**وحصنوا بالحصون مسدنا**

لەراستی دازیندان یان دیلی والەشاعیران دەکات ئیلهامی شعریەکەیان وەخسەبەرێ وئەو ئێشوئازاروئەشکەنجەیەی پێیان گەیشتووە بەهەستێکی راستگۆ هەڵدەقولێ. ئەوەتەکاتێ حاجری بەند ئەکرێ ماوەی بەندیەکەی درێژە ئەکێشێ وئێسکەکانی دەست بەژان دەکەن و،لاوازدەبێ ورەی کەم دەبێ،داوای بەزەیی وبەسەرداهاتنەوە دەکات، هەروەکو لە (المجتث) دادەڵێت:(٤١).

**وارحما لعزيز في السجن اضحي ذليل**
**حليف وجديعاني أسرا وقيدا ثقيلا**

وەسفی خودی خۆی دەکات بەبەندەیەکی مڵکەچ بۆمیری هەولێر کەلە(البسط)دا دەڵێت:(٤٢)

**خان قتلت فعبدا أنت مالكه**
**وان عفوت فتلك العادوالشيم**

هەرلەجۆری سکالا ،سکالای پیریش هەیە کەئەویش بەفاکتەرێکی کاریگەر دەژمێردرێ، چونکە مرۆڤ هەست بەشکان ولاوازی دەکات. لەم بارە وەنشایی سکالا لەخێرای ئەمنی دەکات ولە(الكامل)دا دەڵێت:(٤٣)

**زمن الصبا ماكنت الازائرا**
**كانت زيارته لكمحة بارق**

غمضمت جفني والتصابي ساعة
وفتحة ضرايت شين مضارحي
فكأن شيبي كم يزل وكأغا
كان الشباب خيال طيف بارق

## برایەتی

شیعری ئیخوان لای هەولێریەکان هاتوە دوور لە هەست و سۆزیان و لەهەمان کاتدا دیاردەیەکی بەرچاویشە. لەکاتێکدا سەرنج دەدەین ئەدەبی ئەو ماوەیە زۆرنامەی شعری لە لەنێو شاعیران دا ئالوگۆر کراوە. وەزیر ئیبن مستەوفی بایەخی زۆر بەنامە داوە بە شتێکی باش پتەوکردنی پەیوەندی کۆمەلایەتی داناوە لەنێوان ئەدیبان دا.

لەسەردوو نامەی گلەیی شیعری دەوەستین کەلە نێوان شاعیر فشایی وشاعیرهاشم بن عەبدوسەلام هەولێری ئالوگۆڕکراوە کاتێ دەرزێک بەر پەیوەندیەکانیان کەوتووە لەنامەی نشایی داوا تێدەگەین کە هاورێیەکەی لەخشتەی بردووەو زمانی لەسەردرێژکردووە هەروەکو لە (الطويل) دادەلێت[44]

وكيف احتيالي فيك اذ لم يكن
الي ودارك الا بالخداع طريق
ولست يخداع وما ان جري علي
لساني قول للمكان فيه خلوق

هاورێکەی هاشم عەبدولسلام لەسەر هەمان کێش وەلامی دەداتەوە دەلێت:

لعمري ماساد الكرام أصو النهي
بجو ولاسب الرجال يليق
ولا أنا صمن يجهل الناس حالي
ولا أنا صمن لايقال صديق

لەکاتی دیراسەتکردنی ناواخنی ئەونامە شیعریە وادەردەکەوێت کەنشایی بەخراپی باسی هاورێیەکەی کردووە وجنیوی پێداوە لەکاتێکدا کەخۆی لەدێ نەبووە.

بەلام نامەی پیرۆزبایی بەزۆری لەجەژنە ئاینیەکان بووە کاتی خەلک بەم بۆنەوە پیرۆزبای لەیەکتری دەکەن،هەروەها شاعیرەکانیش بەژداریان لەم جەژنەپیرۆزە کردووە. ئەوەتا ئەبو خەزەل بن ئەبی خەیر هەولێری[45] بەبۆنەی جەژن پیرۆزبای لەئیبن مستەوفی دەکات ولە (الوافر) دادەلێت:[46]

باعيني طالع عيدت يامن
بطلقه يهتأبل عيد
ولا زالت لك الايام عونا
ماعقة عليَ الرغم الجود

هەروەها نامەی سوپاس گوزاریش هەبووە کەدوا زاراوە یە کەخەلک بۆگوزارشت کردن لەو خزمەتگوزاریەی پێشکەش کراوە لەنێوان یەکتردا ئالوگۆڕیکەن.لەوانە نامەیەکی سوپاسگوزاری لەئەمیتەدین عەلی بن عوسمانی هەولێری بۆوەزیر ئیبن مستەوفی ناردووە تیایدا سوپاسگوزاریدەکات هەروەکولە (مجزؤ الكامل المدخل) داهاتووە:[47]

يا ايها المولى الوزير
وذو الرعاية والغيابة
إن العلا أضلني
بالقول عن طريق الهداية
لألي بمارستانكم
واقوم فيه بالكفايه
اني المحتاح إليه
متى احببت الي الولايه

شتێکی دیکەش هەیە کەپێویست دەکالێی هۆشیاربین بوونی نامەیە ماتەمینی (سەرەخۆشیە) کەلە شیعری برایەتی گەیشتۆتە دەستمان کە حمادین بن محەمەد بوازیجی[48]بۆ ئیبن مستەوفی ناردووەو تیایدا سەرەخۆشی لێدەکات بەبۆنەی کۆچی دوای کردنی براکەی ولە (متقارب) دادەلێت:[49]

تعزونني ام اعزيكم
بمن كان عجوين لي في الجد
اتته المنية مقتالة
فنقص حمن أحب العدد
فأبكت عليه وعم اليكا
فكل حزين علي من فقد
فاصحبت لما اتاني النص
اذبب من الدمع ماقد حجد

## الهوامش

١- ديوان٤٤/ ومابعدها
٢- نفه/٣٣٩-٣٤٠
٣- ديوانه ٢٥٧ ومابعدها
٤- تأريخ أربيل٢/٧٨/١/٣٠١/٣٦٣
٥- هو علي بن شحاس بن هبة الله. كتب في ديوان الانشاء باربل رتم استوزر امات محبوساً سنة ٦٠٠هـ (مهجم ابن المضوطي٢/١١٥٩)
٦- انبلوخر: حزب في الرياض ينبت في المياه الراكدة (معجم أسماء البنات ١٥٤)
٧- تأريخ إربل٢/٦٣
٨- هو(رسالة الطيف)في تأليف بهاء الدين بن علي الاربيلي.ت: عبدالله الجبوري دار المجهورية - بغداد ١٩٦٨.
٩- ديوانه/٦٧وينظر: نفسه ٣٥.
١٠- رسالة الطيف٣ ١٠.
١١- فوات الوفيات ١/٣٦٤.
١٢- ديوانه/ ٣٩٠
١٣- نفسه/ ٣٩٠
١٤- أدب الدولي المتنابقة ٥٦٦.
١٥- ديوانه ١٥٣
١٦- ديوانه ١٣٦
١٧- ديوانه ٤٥١
١٨- نفسه ٤٥٥
١٩- ديوانه ٢٥٤
٢٠- دراسات في الشعر في عصر الايوبيين ٦٤
٢١- وفيات الاعيان١/٣١٧
٢٢- ديوانه ٣٦٨
٢٣- ديوانه ٣٣٧
٢٤- ذيل مرآة الزمان ٤/٨٤
٢٥- هو عزالدين الحسن بن محمد بن نجا الاربلي كان بارعاً في العربية والادب وله شعر الهجو(ت ٦٦٧هـ)(فوات الوفيات ٣٦٢/١)
٢٦- عيون التواريخ٢٠/٢٦٩.
٢٧- ديوانه٢٠
٢٨- البداية والنهاية١٣/٢٨٣
٢٩- هو يحيي بن شريف أبو زكريا الحافظ له مؤلفات عديدة فيها (المنهاج) و(رياض الصالحين) والارشاد في علام المحديث (ت٦٧٦هـ) (فوات الوفيات ٤/٢٦٤.
٣٠- ديوانه ٦٠
٣١- وفيات الاعيان٧/٩٣
٣٢- هو الملك عزالدين بن جعفر الغيابوري وكان سمحاً جواداً تولي شخصية واسط والبصرة (ت ٦٥٣هـ)(عيون التواريخ ٢١/٦٥).
٣٣- هو محيي الدين محمد نصيرالدين الطوسي الفليسوف، كان سمحاً في علم الاوائل، وذا حردة واخرة عند هؤلاء، ومون مؤلفاته (مقدمة في المصبنة)(ت٦٧٢هـ)(البداية والنهاية ١٣/٢٦٧)
٣٤- هو أبو القاسم جبريل بن منصة بن مالك الاربيلي شاص لمدل او له طبع سليم في الشعر (ت٥٨٩هـ) باربل (تأريخ إربيل ١/٧٤).
٣٥- قلائد الجبان٣/٦١ ٦٠
٣٦- وفيات الاعيان٧/٩٣
٣٧- قلائد الجبان ١٠/٢٢٤ب
٣٨- فوات الوضيات ٢/ ٥٩
٣٩- وضيات الاعيان٤/١٤٩
٤٠- ديوانه ٣٣٨
٤١- ديوانه ٣٧١
٤٢- نفيه ٣٧٣
٤٣- ديوانه ٣٢٦
٤٤- قلائد الجبان ٩/١٩٥أ
٤٥- نفسه٩/١٩٥أ
٤٦- نفسه١٠/٢٨٢أ.
٤٧- ذيل مرات الزمان ٢/٤٨١
٤٨- هو حمادين محمد بن جساي البوازرنجي في أصحاب عديي بن مسافر تردد كثيراً الى اربيل (ت٥٩٦هـ) (تأريخ إربيل ١/٢٥٣)
٤٩- تأريخ إربيل١/٢٥٣.

## الغزل والهجاء

**پێشەکی:**

سوپاس بۆ خوای گەورە، سڵاو لەگەورەمان محەمەد د.خ لەیارو یاوەرەکانی.

ئەدەب لەناوێنەی کلتوورو زانست و کۆمەڵایەتی و سیاسی نەتەوە ئەژمار دەکرێت، بێگومان هۆکارێکە لەهۆکارەکانی گەشەسەندن و پەرەسەندنیداو، توخمێکە ناکرێ لەتوخمەکانی پێشکەوتنی مرۆیی و شارستانی جیا بکرێتەوە، دۆسێیەکی نمری مێژووییە بەسەرهاتەکان بۆ نەوەکان دەگێڕێتەوە کە باو باپیران پێی وروژاون. لایەنێکی پرشنگدار بەرجەستە دەکات لەو دەرەنجامەی رۆڵەکان وەدەستی دەهێنن لەرێکخستنی قسەکان و پەخشانەکان، لەوەی داوا دەکات لەویژدان و بیردا.

ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵ دەدات تیشک بخاتە سەر بەرهەمە هۆنراوییەکانی عەرەبی لە هەولێرو هەندێ لەلاپەڕەکانی مێژووی ئەدەبی لەماوەیەکی داخراودا لەنێوان سالانی (٥٢٦-٦٣٠ ک) هەلدەداتەوە. شایانی ئاماژە پێکردنە بایەخدان بەلێکۆڵینەوەو کتێبەکان کە لەمێژووی هەولێردا لەبارەکانی سیاسی و بیرۆکەو کۆمەڵایەتی ئەو ماوەیە خراونەتە روو لەوانە (هەولێر لەسەردەمی ئەتابکی) دکتۆر موحسین محەمەد حوسێن و (هەولێر چاوشلی و، ژیانی زانستی لەهەولێر) دکتۆر ئومێد ئیبراهیم.

پاش پشکنین و بەدواداچوونی ئەو لێکۆڵینەوەیە، جگە لەلێکۆڵینەوەی دکتۆر نازم رەشید (هۆنراوە لەهەولێر لەژێر خانەوادەی بەکتیکیەکان) کە لەگۆڤاری (اداب الرافدین) بلاوکراوەتەوە، مانای لێکۆڵینەوەکە هۆنراوەکە لەمیرنشینی هەولێردا ناگەیەنێت، بەڵکو ئەو لێکۆڵینەوەیە برێکی خەوتووەو لەسەر وردی و رودەکاریەکەیەوە ستاوە، جالێرەوە گرینگی و بایەخی لێکۆڵینەوەکە دەست پێدەکات.

### دەستپێک

هەردوو سەدەی شەشەم و حەوتەمی کۆچی بەسەرهەڵدانی ژمارەیەک لەشارەکان جیا دەکرێتەوە کەرۆڵی گرینگیان بینیووە لەپێشخستنی رەوتی رۆشنبیری عەرەبیداو، یەکێ لەو شارانە (هەولێرە)[1]. هەولێر لەسەردەمی خانەوادەی بەکتیکی موزەفەردین کەوکەبەری کەگەیاندیە ئەوپەڕی لووتکە گەشەی سەند[2]. زۆری سازگارکردن لەبەر زۆری رووتێکردنی شارەکانە. لەمبارەوە شەرەفەدین کوڕی ئەبی موفەتەح ناسراو بەئیبن مستەوفی و دوا وەزیری هەولێر کەکتێبێکی گەورەی چوار بەرگی داناو ناوی نا بناهة البلد الخامل بمن وردة في الاماثل) وناسراوە بەمێژووی هەولێر، بەلام بەداخەوە ئێمە تەنیا بەرگی دووەمیمان بەدەست گەیشتووە باس لەو سەردەمە دەکات هەولێر لەسەردەمی موزەفەرەدین دا لەمەیدانی رۆشنبیریدا تێپەڕاندو بەیەکێ لەنوێخوازەکان دادەنرێت کەهەڵسا بەدروستکردنی قوتابخانە، وێڕای ئەوە بەچاودێرێکی گەورەی شارەکەش ناسراوە[3].

موزەفەرەدین گەورەترین قوتابخانەی دروستکرد بەناوی (قوتابخانەی موزەفەریە) کە تائێستاش لەگەڵدا بێت منارەکەی هەرماوە. بەخودی خۆی سەرپەرشتی دەکردو زۆرجاریش تیایدا دەمایەوە. ئیبن خەلەکان لەو شارە لەساڵی ٦٠٨ک لەدایک بووە[4]. هەولێر لەو ماوەیە چوار قوتابخانەی گەورەی لێ دامەزراو لەهەمانکاتدا سەرسوڕمانیش نەبن لەو قوتابخانانە ژمارەیەک لەزانایانی زانستە جیا جیاکان تیایدا دەرچوون[5].

کاتێ لێکۆڵینەوە لەسەر ژیانی رۆشنبیری هەولێر ئەنجام دەدەین. سەرسوڕمان دەبین لەو زۆرە شاندانەی روویان لەشارەکە کردووە، زۆرینەی مەزنەدەکانیش وای بۆ دەچن، کەبزاوتی رۆشنبیری و زانستی تیایدا بەقەد ئاستی بزاوتی رۆشنبیری و زانستی بەغدا بووبێ یان لەوی بەسەرووتر بووە، هەڵبەتە ئەو کاردش هانی زانایان و رۆشنبیرانی داوە کەروو لەهەولێر بکەن بەمانەوە تیایدا بۆ ماوەیەکی درێژ، یاخود نیشتەجێ بوون تیایدا بەدرێژایی ژیانیان.

بەر لەوەی خانەوادەی بەکتیکی دەسەڵات و فەرمانڕەوایی هەولێر بگرنە دەست ئەو شارە چالاکی وا بەرزی لەرووی رۆشنبیری بەخۆوە نەبینیبوو. چونکە هیچ گەورە رۆشنبیرێک لەمەیدانی رۆشنبیری دەرنەکەوت تا ئاماژەیان پێبدەین بەر لەوەی ئەو خانەوادەیە دەسەڵاتی ئەو شارە بگرێتە دەست تەنیا ژمارەیەک لەشاعیرانی سەردەمی هەزبانیە کوردەکان نەبێ کەپێش ئەوان فەرمانڕەواییان کردووە[6].

گەر ئاورێکمان لە شاعیران دایەوە سەرنج دەدەین

لایەنێکی کارا بوونە لەبزاوتی بیرۆکەدا. بەرهەمێکی زۆر لەدیوانی شیعرمان بەدەست گەیشتووە کە لەو سەردەمەدا لەدایکبووە وەک دیوانی حیسامەدین ئەلحاجری (ت ٦٣٢ ک) و مەجدەدین نەشابی (ت ٦٥٦ ک) و ئیبن زەهیری هەولێری (ت ٧٦٦ ک)، وێڕای ئەو دەقە شیعریە زۆرانەی لەکتێبەکاندا هاتووە. بەپێی مەزەندەی ئێمە هاندەر بۆ زۆر بوونی ئەو بەرهەمە شیعریانە، کۆمەکیکردنیان و گوێگرتنی بەرپرسان بووە بۆ شاعیران، بەکارهێنانی شیعر بوو، لەنێو تاکەکاندا کە بەشێوەیەکی گشتی ئارەزوویان لێبووە.

سەرنج دەدەین شاعیران هەستیان بەگەورەیی موزەفەرەدین و کارە باشەکانی کردووەو هەڵوێستیان لەسەر وەرگرتووەو لەتێکستەکانیان ئەو چاودێریەیان بەرێز ڕاگرتووە. هەروەک ئەبی مەکارم بن عابد کرمانی (ت ٦١٦ ک) لەتێکستە درێژەکەیدا (الكامل) باسی لێوە دەکات:

**باب المليك مظفــــرالدين الذي**
**ســبق الملوك بجــوده الحــصطاك**
**المحســن المطعـــام والمقــدام من**
**اضــحي يسـؤدده عـديم مـيـثـاك**
**يجــتــاز شــأو المكرمــات ووهة**
**قــد فــات كل مــجــود فــواك**

هەروەها عەبدولحەمید بن موررەبی ئەلمەقدیسی[٨](ت ٦٠٢ ک) باسی دەکات بەوەی لەگەورە پیاوان و ڕێزداری خەڵک بووە کەس نەبووە لەپیاوەتی بەخشینا شان لەشانی بدات هەروەکو[٩] لە (البسيط) دەڵێت:

**وانت اكـــرم من طاف الموفــودبه**
**ومن الى مشرف العلياء المنسوب**
**ومن له شـــرف مــامــثله شــرف**
**على قلوب عــبــاد الله مكتــوب**

ئەو ستایش و ڕێزگرتنەی لەهاتنی شاندەکان کردووە کەهاتوون بۆ هەولێر، جا دەبێ چۆن بێ لەگەڵ ئەو کەسانەی لەئەستۆیدان. هەروەها بەوە ناسراوە کە لەنێو پاشاکاندا هەولێر لەسەردەمی ئەودا بنکەیەکی ڕۆشنبیری و ئەدەبی گرینگ بووە، مەبەست لەوە قوتابییەکی زۆر لەڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا ڕوویان تێکردووە[١٠].

**(مەبەستەکانی شیعر)**

شتێکی بەڵگە نەویستە بابەتە شیعریە لاساییەکە ڕەوەکان بەشێکی بەرفراوانی لەدیوانەکان گرتۆتە خۆ. جا لەلێکۆڵینەوەی شاعیرانی هەولێر تیشک دەخەینە سەر شاعیرە بەناوبانگەکان کەخاوەنی دیوانن، چونکە (بێگومان- نوێنەری) ژیانی شیعرن لەو میرنشینەدا، وێڕای شاعیرانی دیکە کەهێشتا شیعرەکانیان کۆنەکراوەتەوەو لێکۆڵینەوەیان لەسەر نەکراوە. لەگەڵ ئەوەش هەوڵێکی زۆرمان داوە بۆ کۆکردنەوەیان.

لە لێکۆڵینەوەی مەبەستە شیعریەکان (غەزەل و جۆرەکانی بەگۆڕانی و بەنێر بەمێ خستومانەتە سەرەتاوە بەهۆی پەرەسەندنی شیعر لەسەر زاری شاعیران و نووسەران و زانایانەوە. پاشان بابەتەکانی دیکە بەپێی کەمی و زۆری گەلاڵەمان کردووە. بینیمان لەبۆنەی ئەوەراجدا هونەری مەتەڵ هەیە. بۆیە لەهەندێک شتدا جیاوازیمان پەیدا بوو لەگەڵ ژمارەیەک ئەو لێکۆڵەرەوانەی کە بەهونەرێکی سەربەخۆیان دانا[١١].

لە پەراوێزدا بەکورتی باس لەشاعیرەکان کراوە لەگەڵ هەردوو سەرچاوەیی کۆنی وەرگێڕراو جگە لەژمارەیەک لەشاعیرە نادیارەکان نەبێت کەدانەری هەریەک لەو دوو کتێبەیان (تاريخ اربيل) و (قلائد الجمان) لەوەرگێڕانەکانیان دا تاک کردۆتەوە.

## غەزەل

لە هەولێر شاعیرانی تێکستە غەزەلیەکان و کۆپلەکان تاکن. زۆرینەیان باسی ڕووخساری دەرەوەی ئافرەت دەکەن وەک چاوی گەورە کە لەتیر دەکا[١٢] یان بەقەدو بالایدا کەوەک گەلای ئەلبان دەنوشتێتەوە[١٣] کولمە سوورەکانی کە لەخوێنی ئاشقان دەکەن، ئەو دەمەی لاڤەبولە کەوەک شەرابە[١٤].

بەپێی مەزەندەی ئێمە زۆرینەی بەرهەمی شاعیران لە غەزەل بێبەش نەبووە، بەلام لەگەڵ ئاشکرابوونی ڕێڕەوەکان دەبینین زۆرینەی غەزەلەکانی نشابی لەپێشەکی تێکستەکەیدا لەستایش هاتووە، بەلام حاجری زۆرینەی غەزەلەکانی لەتێکست و کۆپلە سەربەخۆکانیدا هاتووە. غەزەلەکانی ئیبن زەهیریش تێکەڵ بەشیعرە خەمریەکانی بووە. بەلام غەزەلی زۆرینەی شاعیرانی تر لەکۆپلە سەربەخۆکان دا هاتووە.

کاتێ بەئارامگای شیعری غەزەل گوزەر دەکەین

گوێبیستی غەزەلی گۆرانی دەبێن و بەشیرینی و شەو بەمۆسیقا بەچێژەکەی خۆیشمان پێدە بەخشێ، کەبرێتییە لەچەند دێرێک و بۆ گۆرانی رێکدەخرێت کە لەسوننەتی پێشینەی نەهاتووە لەهەڵوەستەکردن لەسەر ژووان و گریان دا.

ئەم جۆرە غەزەلە وەزیر ئیبن مستەوفی و ئەحمەد کوڕی بارام هەولێری[١٥] لەدوا مەنزڵگا لەموسڵ و، شەوێ لەشەوانی خۆشیدا، کەسەدەقەی کوڕی محەمەد هەولێری چەند دێرێک لەشیعرەکانی بەگۆرانی دەڵێت دەگوزاێتەوە هەروەک لە (المجتث)دا دەڵێت:

**اذا تمنع صبري　　وحان بالهجري صبري**
**ناديت والليل داج　　وقد خلوت بفكري**
**يارب هب لي منه　　وحال يوم بعمري**

سەدەقە زێتری هاوێشتە سەری و گوتی:

**لا اجتني ورد خد　　زاه علي كل زهر**
**واجتلي غصن بان　　يميس من تحت بدر**
**ان صح لي ذاك منه　　يوما وخيت بنذي**

پرسیاریان لەئیبن مستەوفی کرد تەواوی بکات وتی:

**عجنت من صبح وجه يلوح من ليل شعر**
**فالشمس تلعب مابيب ننا بدرا وبدر**

ئەحمەدی کوڕی بارام هەولێری گوتی:

**اقول من فرط وجدي　　به وقله صبري**
**يامن تملك رقي　　ارحم -فديتك- ضري**

ئیبن مستەوفی دەڵێت:

**عذار خديك منه　　يقوم للناس غذري**
**وفيك طاب جنوني　　ولذلي هتك ستري**

هەروەها هەواڵی دیکە دەربارەی غەزەلی گۆرانی لەهەولێر لەبەردەستماندا هەیە کەباو بووە. ئیبن خەلەکان بەشێکمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لەشەوانەیەکی گۆرانیدا دوو کەس گیانیان لەدەست دا بەهۆی هۆنینەوەو کارلێکردنی ئەو بەشە[١٧]، کەئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کۆمەڵگەی هەولێر چێژی لەئەدەب وەرگرتووەو حەزو ئارەزووی گۆرانی هەبووەو چێژو خۆشی لە بیستنی وەرگرتووە. سەرەڕای ئەوەی ئەو کۆمەڵگایە لەسەردەمی موزەفەرەدین دا زۆر پارێزراوو پابەند بووە بەپرێنسیپەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

لە هێنانەوەی غەزەلی ناسراو لەو میرنشینە غەزەلی بەرجەستە بووە کەکۆمەڵگەی عەرەبی و ئیسلامی هەر لەزووەوە ناسیوویانە[١٨] لەدەستپێکی ئەو شاعیرە عەرەبانە کەگێرۆدەی ئەو جۆرە غەزەلە بوون ئەبو نەواس و حوسێن بن زەمان کەناسراوە بە (الخليع) و، والیەی کوری حەبابی کوفی، کە لەدوا سەدەکانی تەمەنی دەوڵەتی بەعاسیدا[١٩] ژیاوە.

ئەو جۆرە غەزەلە لەپشت بەئاکاری هەستی جوانی ئافرەت و خودی جوانییەکەی دەبەستێت. حاجری بەپێشەنگی شێوازی ئەو جۆرە غەزەلە لەهەولێر دادەنرێت. ئەو شاعیرە ئاکاری جوانی روخساری حەبیبە و نەرمونیانییەکەی باس دەکات و عیشق و سۆزی بۆ هەڵدەستێ هەروەک لە (المواف)دا دەڵێت:

**هوي لولا لواحظ ام عمرو**
**لصادفنا مصادفة القضاء**
**رقيقة صفحة الخدين اشهي**
**من الماء الزلال علي الظماء**
**وقالو في مراشفها شفاء**
**فوا شوق المريض الي الشفاء**

حاجری لەغەزەلەکەیدا پشت بەیادی شەوانەی بێ هودەو یاری و یادی ژووانەکەی دەبەستێت، هەندێ جاریش لەغەزەلە بەرجەستەکەی نزیک دەبێتەوە لەئەدەبێکی رووت هەروەک لە (السريع)دا دەڵێت:

**وكلما ناولتني قبلة　　اشرق وجه الزمن القبل**
**وانت بالعزب الي جانبي　　احسن من حسناء تحت الحلي**

لەبارەی مانا و ناواخنەوە، غەزەلی بەتورکەکان کردووە سەرەڕای ئەوەی غەزەلی بەکوردەکان کردووە بەتایبەت بەخودی چاوی تورکەکان[٢٢]. یەکێکە لەبابەتە شیعرە تازەکانی ئەو میرنشینە. لەوانە ئیبن زەهیر دڵی لەسەر پۆلە ئاگرێک بووە بەهۆی کەوتنە داوی تورکەکان[٢٣] لەرێی پەنجەردیەکەوە دێتە دووان و لە (الطويل)دا دەڵێت:

**عزير في الاتراك زنجي خاله**
**كقلبي مقيم من هواه علي جمر**
**أزور سخطا وتلفت راضيا**
**امات وأحيا بالمقطوب وبالبشر**

ئەشایی سەربردەیەکی لیلیکی هەیە لەگەڵ خۆشەویستە تورکەکەی و گفتوگۆ لەنێوانیان دا بووە پاش ئەوەی رازی بووە. لە (الطويل)دا دەڵێت:

**یقـول وقـد قـبلتـه ورشـفـتـه**
**اراك ابحث الخمر والخمر وفي فمي**
**فقلت طبخت الخمر جني لثميته**
**بانفاسي وجدي فهو غير محرم**
**ولما راي بالمرئي هتكي ورام ان**
**ويكتم منه بهـجـه لم تكتم**
**تشبـة بالاعـراب عند التـثـامـه**
**بعـار فـيـه ياطيب لثم المكثم**

دیاردەیەکی دیکەش لەو هونەرە هەیە کە شاعیـرانی هەولێر زۆری راناوەکانیان بۆ نێر گەڕاندۆتەوە. لەم بارەوە هەندێ لە لێکۆڵەرەوەکـان وای دەبینن (کـە ئەم بەڵگانە دەلالەت لەسـەر ئەوە دەکـەن زۆرینەیان مـەبەست لەوە نێرینەی راستەقینە بووە[٢٥]. هەندێکی تر دەڵێن (زۆرینەی شـاعـیـران راناوی نێـریان بەکـارهێناوە لەکـاتێکدا شیعرەکانیان ئاراستەی یارەکانیان کردووە نەک نێرەکان[٢٦] ئێمە لای خۆمان وای دەبینین کە بەشێکی ئەو شیعرانە گوزارشت لەهەڵقولاوی کۆمەڵایەتی شاعیر دەکات. چونکە سەلمێنراوە کەهەندێ لەشاعیرەکان ئەزموونی هەڵکەوتی خـۆیان هۆنیـوەتـەوە، یان ئەوەتا لەژێر ورووژاندنی هەڵکەوتێکدا بوون. کەئەمەش لەمیرنشینی هەولێر دوور ناخرێتـەوەو بۆ کـەسـیش نییـە رەتیبکاتەوە. چونکە شـاعیرێکی هەولێری هەیە کەسێک تۆمەتبار دەکـات بەناوی ئیبن ئەبی زەهران و هاوکـات داوا لەخەڵک دەکـات بێنە لای[٢٧] و لە (المتقارب)دا دەڵێت:

| | |
|---|---|
| **وقال السلام علي من زني** | **ولاط وقاد لاخوانه** |
| **فردوا جميعا عليه السلام** | **وكل يترجم عن شأنه** |
| **وقال يجوز التداوي به** | **وكل عليك باشجانه** |

لەداواکارانی ئەو جۆرە شیعرە غەزەلیە لەکۆمـەڵگەی هەولێـر زۆری گـەنج و لاوە ئەفـرەنگیـەکـان بوونە کـە خانەوادەکەیان لەگەڵ سوپای هەولێر بوو بەسەرکردایەتی موزەفـەرەدین لەمـاوەی جـەنگە بەردەوامیـەکـەی کـە شـان بەشـانی سـەلاحـەدینی ئەیوبی دەجـەنگا لەوڵاتی شـامـدا. (ئەوانە بەهۆی پەیوەندیکردنیـان بەسـوپاوە نزیکبـوون لەخـەڵک هەتا لەمـیـرو دەسـەڵاتدارانیش، تەنانەت بگرە لەفـوقەهاو زاناکـانیش بەبێ تێروانین لەمەسـەلەی ئایین و مـەزەبەکـەیان، ئەو گـەنجـانـە بوون بەپیـاوی گـەورە لەدانیشتنەکانیـان، بەخەوش و عەیب وەرنەگیرا کە لەوانە یەکـێک یان دووان تایبەت بەخۆیان بکەن و یاوەریان بێت لەمـانەوە بۆ یارمـەتیـدانی خـواردن و دەست نوێژهەڵگرتن دا)[٢٨]. سەرەڕای ئەوە بەهۆی جەنگی خاچ پەرستەکانەوە کەهێشتا ئاگرەی کەپ بەبوو بوو پیاوانی جەنگ رقیـان لەهاوسـەرگیـری دەبۆوە، چونکە ئەو جـەنگە نەیدەهێـشت سـەقـامگیـربن و بتـوانن خـێـزان پێکەوە بنێن، زۆرینەی نووسـەرەکـان ئەو نەریتـەیان بەرپەرچ دایەوە لەوانە ئیبن قەیمی جۆزی لە کتێبـەکەیدا (اغاثة اللهفان في مصايد الشيطان)[٢٩] جـاڕدانی جـەنگیـدا لەسـەر گـەنج و لاوە ئاشقەکان. هەروەها میری هەولێر بەتووندی سەرزەنشتی ئەو نەریتـەی کـردو لەگـەڵیـان جـەنگا بەزینداندنیکردنی زۆرینەیان[٣٠].

جێی سەرسوڕمان نییە زۆرینەی ئەوانەی باسمانکردن کـەهۆنراوەی غـەزەلیـان هەیە لەسـەر نێـر لەزانایانی و میرنشین و گەورەکانیان دا، لەوانە وەزیر ئیبن مستەوفییە کە هەواداری زوڵف و کـوڵمی غـولامـەکـەی بوو، جـارێ بەخۆشەویسـتی جارێ بەمـاچ، پاشان حەزەکـانی تێکەڵ ناخی دەکـات کـاتێ لەباوەشی دەگـرێت هەروەکـو لە (الکامل)دا گوتوویەتی:

| | |
|---|---|
| **علقت يدي بعذارة ونجده** | **هذا اقبلة وذا اجنيه** |
| **لولم تخالط زخرتي انفاسه** | **كانت تنم بنا واشيه** |

حسد المصباح والليل- لماخضمنا غيضا ففرق بيننا داعية

هەروەها لە غـەزەلی زانایان گـوتەی ئیبن خـەلەکـانە کـەتامـەزرۆی بینینی کـارکـەرە بەژن و باڵا بەرزەکەی بووە کەدوا رۆژی بۆ هێناوە هەروەک[٣٢] لە (مجزء الخفيف)دا گوتوویەتی:

| | |
|---|---|
| **أنا والله هالك** | **ايس من سلامتي** |
| **اواري القامة التي** | **قد اقامت قيامتي** |

سـەرنج دەدەین دیاردەی غـەزەلی نێـر لەداهێنانی زانایانی هەولێر نەبووە بەڵکو لەپێش ئەو ماوەیەی ئەواندا هەبووە کەپێشتر باسکرا.

گەر ئاوڕێک لەشیعری هەولێریەکان بدەینەوە شیعری جنێوو بێ هودە کەمبووە لەزۆرینەی جارەکان دا غەزەل بەنێر

هۆکارەکەش بۆ ئەوە دەگەرێتەوە باری کۆمەلایەتی و ئابووری لەمیرنشینەکەدا سەقامگیر بووە، ئەمەش وای لەشاعیران کردووە لەئاراستە هونەریەکەیان لا نەدەن، لەستووری رەفتارو چێژوو گرتنیشدا لانەدەن.

## "ستایش"

ستایش لەمیرنشینی هەولێر لەشاعیرە بەناوبانگەکانی وەک نشابی و حاجری و ئیبن زەهیرو عیزی هەولێری و بەحرانی و... هی تر کەم تەرحەم نەبوونە، بەلکو لەئەدەبیاتی میرنشین دا ستایش لەشیعردا وەزیرو[33] میرو[34] زانایان هۆنیویانەتەوە.

وادیارە ئیبن خەلەکان توانایەکی باشی هەبووە لەهۆنینەوەی شیعردا کەیەکێکە لەگەورە زانایانی هەولێر، لەو کۆیلەیەدا لەستایشی شا کامل ناسردین[35]دا باس لەبەخشین و ریزی دەکات کە لەسەر شایەکانی پێش خۆیدا هەبوودو لە[36] (الطویل)دا دەلێت:

**الیك ابن ایوب سمت بي همة**
**هداها ضیاء في جبینك ظاهر**
**وما اثبت الاخبار في الجود كلها**
**لدي الناس الا جودك متواتر**
**ولولاك ماكنا نحقق انه**
**یفوق الملوك الاولین الاواخر**

ستایشێکی تری لەشاری هەولێر هۆنیوەتەوە کەباس لەخێرو بێری ئیبن موتعەی بن مالیکی هەولێری دەکات کەهەمیشە بانگەشەی خێرو خۆشی دەکات لە(37) (الكامل)دا دەلێت:

**یاربع اربل انت نعم الدار**
**دم عامرا تخي بك الأعمار**

هەروەها ئیبن حەداد (ت ٦٢٦ک)[38] باس لەبینای جیهانیەکەی و ژیانی رۆلەکانی و رەفتارە باشەکەی دەکات لە[39] (البسیط)دا دەلێت:

**حضیت اربل من دار ومن وطن**
**ولا تعداك صوب المعارض المعتن**
**وطاب منك نسیم الریع في السحر**
**الأعلي لأنك مأواي الالف والسكن**

بەلام سەبارەت بەمانا شاعیرانی میرنشینی هەولێر بەشاعیرانی سەردەمیشەوە، هەمان واتای کۆنیان بەشێوەیەکی بەردەوام گوتووتەوەو دووبارە کردۆتەوە. ئەوەتا ئەبو رەبیع هەولێری[40] ستایشی وەزیر ئیبن مستەوفی دەکات بەئازایەتی و هاتنە پێشەوەیی و دلێری و بەخشینەکەی هەلدەلێت، کەماناکەی لاساییەکەرەوەیەکی دووبارەن و لە (الطویل)دا دەلێت:

**جواد جري في حلیة السیف والندي**
**وفاخت علي كل الأنام مواهبه**
**هو الغیث بروي كل صاد علي الثري**
**هو البحر حدث ما أوتك عجائبه**

هەمدیس سەرنج دەدەین شاعیر ئیبن هیبتوللا کفرعزی هەولێری[42] بەدەستەواژەی تەری لاساییکەرەوە ستایش بەپیاهەلدەرەکەی دەکاو بەخۆری دەشوبهێنێت کەتاریکایی لادەبات و بەمانگی یەکشەوەی زەوی دادەنێ و بەدەریای جودی دووبارە دەشوبهێنێ هەروەک:[43] لە (الطویل)دا دەلێت:

**اضا مت بك الأیام بعد ظلامها**
**وعاد سرور الخلق بعد ذهابه**
**فانت هلال الارض یاخیر مالك**
**وبحر ندي طام بغیض عبابه**

هەلبەتە بەشێکی باش دەزانرێ لەو بوارەدا تیشک بخەینە سەر هەندێ لەکەموکوڕیەکانی ستایش لای شاعیرانی هەولێردا. گرینگەکەیان هەندێ لەشاعیران زۆریان کردووە لەقولانەوەی پێدا هەلگوتراوەکانیان بەو ئاستەی خوێنەر وامەزەندە دەبات کەئەو شاعیرانە لەو پێداهەلگوتنە شەرەفمەندایەتی خۆیان و نەفس بەرزییان لەدەست داوە وەک ئەبو محەمەد هەولێری بەتەوازعەوە بەوەزیر ئیبن مستەوفی دەلێت و خۆی بە بەندەیەکی بچووکی ئەو دادەنێت داوای کۆمەکی لێدەکات و لە[45] (الحفیف)دا هاتووە:

**عبدك الاصفر المحب ینادیك**
**وقد هزه الحیاء ارتیاعا**
**وهو یرجو منك إلاحالة با**
**اطول من حد في البریة بالما**

پاشماوەی کەموکوڕیەکانی دیکە توێژەر لەشیعری هەولێریەکان دا سەرنج دەدات بەوەی کە لەئاکاری پێداهەڵگوتراوەکانیان زێدەڕۆییەکی زۆریان کردووە. نەشابی یەکێکە لەو گەورە شاعیرانەی لەو بوارەدا ئەو زێدەڕۆییەی کردووە، بەتایبەت کاتێ وتارەکانی لەئاراستەی سیاسی نزیک بوونەتەوە، ئەمەو لەستایشی خەلیفە موستەنسیر بیللای عەباسیەکان[٤٦] لە (الرجز)دا دەڵێت:

**وارث ســـر الوجـــر ارث ظاهرا**
**بحـقـــه من ذلك الشـــر اغــفي**

شاعیر لەوتارەکانیدا گوزەر دەکات و تاوای لێدێت مەزندەکانی دوور ئەکەونەوەو خەلیفە بەمیراتگری ئایین و، باوەڕو، مەککەو حەج و حەلال و حەرام دادەنێت هەروەک لە (الکامل)[٤٧] دا دەڵێت:

**والركن ولبـيت العـتـيق وقلة**
**والحج والاحــلال والاحــرامــا**

لەوەش زێدەڕۆیی دەکات تا بەمەقامی پێغەمبەر د.خ دادەنێت هەروەک لە (الکامل)[٤٨]دا دەڵێت:

**وعليكم نزل الكتــاب وفــضلت**
**آياته لجـفـوقكم وحـقـيـقـهـا**

تەنانەت بگرە شاعیر لەو سنوورەش ناوەستێ و بەڵکو لەگەڵ پێشەوای پێغەمبەران دەیهێنێ و کتێبەکانی ئاسمانی بەسەریدا دەخوێنێتەوە هەروەکو لە (الخفیف)[٤٩]دا هاتووەو دەڵێت:

**وعليـه تتلي الا ناجـيل والثـوارة**
**فــيــهـــا صــحــائف والزبور**

بێگومان ئەو پێدا هەڵگوتنەی خەلیفە شتێکی زۆر لەئەندێشە لەخۆ دەگرێت و مەزندەی شاعیر زێدەڕۆییەکی یەکجار زۆری کردووە لەپێناو رازیکردنی پێداهەڵگوتەکەی و لەپێناو پاداشتێکدا.

هەر چۆنێ بێت، هەندێ لەلێکۆڵەرەوەکان وای دەبینن ئەو خەلیفەو میرانەی خۆشحاڵ بوونە بەو پێداهەڵگوتنە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی (دەسەڵاتداریەکەیان لاواز بووەو لەسەر کۆمەڵێ درۆزن تێپەڕی نەکردووە کە لەکاتی تەماحگیرییاندا بەشان و باڵیاندا هەڵگوتوون)[٥٠].

## جنێو

زۆرینەی شیعری جنێو لەچەند دێڕێکی سەربەخۆ کورت کراونەتەوە کە برینەکان ساڕێژ ناکات. چونکە زۆری مەزەندەکان لێرەدا ئاماژە دەرن بەوەی کە لەو میرنشینە کاریگەری هەبووە لەسەر کەمبوونی ئەو هونەرە. لەوانە کاریگەری سیاسی. چونکە میر موزەفەرەدین ماوەی نەئەدا جنێو بدرێ و قسە بهاوێشترێ لەبەر پابەند بوونیان بەبەها پیرۆزەکانی ئایینی ئیسلام. هەروەها لەوانە باری سروشتی ژیانی کۆمەڵایەتی لەهەولێر. هەمدیس لەبیر ناکرێ کەمێژوو نووسانی ئەدەب شیعری سوودمەندو باشیان بۆ گواستینەتەوە.

ئەو کارەی کە هۆشیاری لای هەولێرییەکان ئەورووژێنێ زۆری جنێوەکانیان لەسەر دەستەیەکی دیاریکراو بووە لە کۆمەڵگەی هەولێردا، کەئەویش چینی کاربەدەستانی دەوڵەت بوونە. دەشێ نشابی بەپێشەنگی جنێو دەرەکان لەو میرنشینە دابنێن و جنێوەکەی بەخودیەکی خودی جیا دەکرێتەوە کەزۆری ئاراستەکانی رەخنەی سیاسی و کۆمەڵایەتی بوونە. لەجوانی رەخنە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی پێشبینی رووخانی بەغدای کردووەو رەوشە پەشۆکاوەکانی ولاتی ئاشکرا کردووەو باس لەرەفتاری لادراوی پیاوەکان کردووە. رەخنەی لەوەزیری بەغداو دەرگەوان و چاودێری دیوان و شێخی ئیسلام سەدرەدین گرتووەو گوتوویەتی[٥١]:

**امــا الوزير مــشــغــول بخــبــره**
**والعـــارضـــان تســـاج وســـداد**
**وحـاجب البـاب طورا شـارب ثـمك**
**وثـارة هـو جـنـكـي وعـــــــواد**
**ومـشرق الدست مـغري باللواط له**
**في كل ناحـــيـــة علق وقـــواد**
**وشـيـخ الاســلام صـدر بدين همتـه**
**مـــقــصـــورة لحطام المال يصطاد**

لەو چەند دێڕەدا نشابی وێنە زیندوو ڕاستەقینەکەی گواستۆتەوە کە لەژیانی سیاسی لەدەوڵەتی عەباسیەکان پێی گەیشتووە. جا گەر ئەوە حاڵی گەورە بەرپرسانی دەوڵەت بووبێ، دەبێ حاڵی تەواوی گەل چۆن بووبێ لەو

ماوەیە لەتەمەنی دەوڵەتی عەباسیدا؟

مشابی گاڵتەی بەکاربەدەستانی میرنشینی هەولێر کردووەو بەرپرسیاریتی خراپی هەڵسوڕاندنی ئیدارەی خستۆتە ئەستری ئەوانەوەو لەجنێودانێکدا بەخوویەکی گاڵتەجاری باس لەوەزیری تازە دامەزراو دەکا هەروەکو لە (المتقارب)دا دەڵێت[52]:

**فرحنا وقلنا تولي الوزير    وافلح ديواننا بالوزاره**
**فما زادنا غير جاويشه    وفي كتبنا كتبت بالاشاره**

لەجنێوی نەشابی کەکردوویەتیە سەر کاربەدەستان و وێنەکانیان سەرنج دەدەین کەشیاو نەبوونە بۆ ئەو پۆستەی وەریانگرتووە. هەندێ جار هەمووەکەی لەسەر کەمتەرخەمی ئەوان بووەو عەریب و کەموکورتیەکەیان دەردەخات. هەروەها جنێوی بەداواکاری تایبەت ئەبو حەسەن سەرپەرشتیاری دیوان کردووە پاش ئەوەی دامەزرا لەشوێن یەعقوب بن ئیسماعیل نەسرانی کە بەندکرابوو[53]. هەروەکو لە (الطويل)دا دەڵێت:

**فرضنا بيعقوب اللعين وحبسه**
**وقلنا أتانا مايطيب به القلب**
**ولما ولي المختص فالكل واحد**
**اذا مامعني كلب أتنا بعده كلب**

شاعیر ئەبو عەمر ساحی[54] سەرسامان دەکات بەتێکستێکی درێژی جوان کەهەجوی سەرۆکەکانی هەولێر دەکات لەخاوەن دیوان و پێشینەکانیان. شەرەفیان دەشکێنێ و باسیان دەکات تاوای لێدێ لەسەر هەموو زمانێک ناویان دەهێندرێ، هەروەکو لەدەستپێکی تێکستەکەیدا لە (السريع)دا دەڵێت:

**يارؤساء الناس من اربيل**
**ماالحزب الحر بناديكم**
**حرأم من جاكم سائلا**
**واجنية المسعي لراجيكم**

کۆکردنەوە لەنێوان جنێوو توانج تێگرتن لەشیعری وتاربێژی هەولێر قازی جەعفەر بن هیبەتوڵڵا هەولێری هاتووە، کەرۆژێ لەرۆژان دەچێتە لای کاربەدەستێکی میرنشین و وانەی ئەدەب و نەحوی پێدەڵێت هیچ بایەخی پێنادا، ئەویش بەخەمەوە دادەنیشێ و پاشان بەئاماژەوە پێی دەڵێت[56]:

**هذا مقامي لديك يا من**
**اقام دهرا وراتر بابي**
**اقصي أمانيه قرب اذن**
**في دولة الحسن والشباب**
**ان كنت انسبت ذاك فانظر**
**من فرد باب من الكتاب**

کاتێ میر موزەفەرەدین گوێبیستی ئەو هەواڵە دەبێت فرمان دەدا بەلابردنی ئەو کاربەدەستە[57]. و هەڵسا بەچاکسازیکردنی هەندێ لەپایەکان لەپەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لەنێوان تاکەکاندا.

هەروەها سەرنج دەدەین ژمارەیەک لەشاعیران جنێوەکانیان ئاراستەی خاوەن پیشەکان کردووە لەهەولێر، لەوانە دکتۆرەکان وەسفیان دەکات کەنەفامن لەپیشەکانیان دا. لەمبارەوە حوسام حاجری جنێو بەدکتۆر ئیبن شەمعون دەدا کە لە (السريع)دا دەڵێت:

**- أفتي ابن شمعون جميع الموري**
**فليت لو بعد منا طبه**
**لست اطبل الشرح في وصفه**
**لو عالج الحضر القضي نحبه**

هەمان شاعیر وێنەیەکی گاڵتەجاری ئیبن شێخی هەولێر دەکێشێ و لەوێنەکەدا نوشتەو ئەفسوناوی دیارکردووە وەک پێناوێک بۆ پێکەناندنی خەڵک. لێرە دەبینین شاعیر رۆڵێکی رەخنەگرانەی کۆمەڵایەتی دەگێڕێ لەبەر باری خراپی کۆمەڵگاکەی هەروەکو لە (الطويل)دا دەڵێت:

**فتي الشيخ لا ينفك عن ظهر بغلة**
**لنقل حديث ماسواه له رادي**
**بريك ابتهاجا في اللقاء نتطنه**
**ودادا وفعل المعذر في قلبه ثاوي**
**يلفق في الناس المساوي بخطه**
**رقاعا فلا ينضك صبا بها غاوي**

هەروەها هەندێ جار جنێوەکەیان شیعری سەلەفیشی لەخۆ گرتووە هەروەک حاجری لە (الوافر)دا دەڵێت:

**زبالــة لالـشـــــــــر انـت ممـن**
**يرجـيـــه الصـــديق ولا لخـــيـــر**
**لقـد صـدق الذي قـد قـال قـدمـا**
**(فـــفـض الطرق إنك من غـــيـــر)**

لەمـیـانەی ئەو نموونە شـیـعـریانەی لەپێـشـەوە هاتن وادەردەكەوێت شـاعـیـران بە بەكـارهێـنـانی شێـوازی سـاناو زمـــانـێكی پاراوو، دوور لەوشـــەی نابەجێ، پەنایان بۆ جنێـوەكانیـان بردووە بەچەند دێرێكی كەمی چڕو پڕ دەریان بڕیوە بەمەبەستی سانا بەكارهێنانی. سەبارەت بەكۆشكی جنێو ئیبن ڕەشیق دەڵێت:

(سـەرجـەم شـاعـیـران وای دەبینن كـە كـۆشكی جنێـو بڕبڕەیە)[61].

**پەراوێزەكان:**

١-دائرة المعارف الاسلامية، مادة إربل ١/ ٥٧٠.
٢-ينظر: آل بكتكيني إمارة إربل في عهدهم (مجلة) ١٣٩.
٣-ينظر: الفنون الاسلامية، ٣/١٠٥٩.
٤-أربيل في العهد الأتابكي/ ٢٥٠.
٥-طبقات الشافعية للأمنوي، ١/٤٩٦.
٦-ينظر: وفيات الأعيان، ٥/٢٦٤.
٧-هو أبو المكارم محمد بن عابد بن محمد الكرماني الصوفي الزرندي، ورد إربل غير مرة وله النظم والنشر والترسل (ت ٦١٦ ه) (تأريخ إربل)، ١/١٨٨.
٨-هو أبو محمد عبد الحميد بن مريي بن ماضي المقدسي، مدح مظفر الدين بشهره (ت ٦٢٠ ه) (تأريخ إربل ١/ ٣١٥).
٩-تاريخ إربل، ١/٤٥٩.
١٠-نظرة عابرة في شمال العراق ٥٨٧.
١١-الشعر العراقي في القرن الخامس الهجري ١٥٤، والشعر العراقي في القرن السادس الهجري، ٨٥.
١٢-ديوان الحاجري، ٢٥٩.
١٣-نفسه/ ٢٦٢.
١٤-ديوان النشابي، ٣٣١ و ديوان ابن الظهير/ ٤٧.
١٥- هو احمد بهرام، أبو العباس الاربلي، نيشيء في الشعر تأدبا، بارع في الغزل (ت ٦١٨ ه). (قلائد الجمان ١/ ١٢٤).
١٦- هو صدقة بن محمد بن القاسم، أبو البر الأربلي، جيد المعرفة بالقاء والأصوات و له شعر جيد (قلائد الجمان ٣/١٠٣).
١٧-ينظر: وفيات الأعيان ١/٣١٧.
١٨-ينظر: الأدب في ظل بني بويه ٢٦٦.
١٩-العصر العباسي الأول ٧٣.
٢٠-ديوانه/ ١٣٦.
٢١-نفسه/ ٣١٧.
٢٢-دراسات في الشعر في عصر الأيوبيين ١٣٩.
٢٣-ديوانه/ ٤٧٠.
٢٤-ديوانه/ ٣٣٤.
٢٥-الشعر في إربل (مجلة) ٣٩٧.
٢٦-الشعر العربي بين الجمود والتطور ٢/١٣٢.
٢٧-هو الحسن بن محمد بن احمد، الفيلوف عزالدين الضديد، كان بارعا في العربية والأدب كان قدرا، شعره جنيث الهجو (ت ٦٦٠ ه) (فوات الوفيات ١/٣٦٢).
٢٨-الأدب في العصر الأيوبي/ ٣٨.
٢٩-الشعر في إربل (مجلة) ٣٩٨.
٣٠-نفسه/ ٣٩٨.
٣١-وفيات الأعيان ٤/١٤٩.
٣٢-المصدر نفسه ٤/١٤٩.
٣٣-قلائد الجمان ١/ ١٢٥ ب.
٣٤-نفسه ٧/٩٥ أ.
٣٥-هو أبو المعالي محمد ابن الملك العادل، وكان سلطان عظيم القدر، جميل الذكر محبا للعلماء (ت ٦٣٥ هـ). (وفيات الأعيان ٥/٧٩).
٣٦-وفيات الأعيان ٧/٩٢.
٣٧-تأريخ إربل ١/٧٤.
٣٨-هو أبو عبدالله محمد بن أبي المني المنصور الواعظ الموصلي (تأريخ إربل ١/٤٥٩).
٣٩-تأريخ إربل ١/٤٥٩.
٤٠-هو أبو الربيع شرف الدين الإربلي، كان أديبا لطيفا في مختلف الأغراض الشعرية (ت ٦٨٦ ه) (ذيل مرآة الزمان ٤/ ٣٢١).
٤١-قلائد الجمان ٣/٥١.
٤٢-هو جعفر بن محمد بن هبةالله الكفر عزي الإربلي، عالم في علوم الفقه، وكان يقول الشعر، تولي القضاء بأربل (ت ٦٠٤ هـ). (قلائد الجمان ١/٨٨ أ).
٤٣-قلائد الجمان ١/٨٨ أ.
٤٤-هو صالح بن مكارم، أبو محمد الإربلي، كان فاديا في سوق البز بمدينة إربل له طبع في عمل الشعر حسن (قلائد الجمان ٣/١٠٣).
٤٥- قلائد الجمان ٣/١٠٤.
٤٦-ديوانه/ ٢٣٩.
٤٧-نفسه/ ٢٠٠.
٤٨-نفسه/ ١٣٥.
٤٩-نفسه/ ١٨٩.
٥٠-الشعر العراقي في القرن السادس الهجري/ ١٠٤.
٥١-ديوانه/ ٣٠٨.

٥٢-ديوانه/ ٣٠٤.
٥٣-ديوانه/ ٣٠٢.
٥٤-هو أبن علي بن أحمد بن سالم، نسبه يعود إلى عمل الرصاص. كان ينقش الدنانير في دار الضرب المظفرالدين، أبرز اغراض شعره المدح والهجاء (ت ٦٣٢ ه). قلائد الجمان ٣٨/٤ ب.
٥٥-قلائد الجمان ٣٨/٤ب.
٥٦-الفصون الياتنة/ ٧٩.
٥٧-عيون لتواريخ/ ٤٠٤/٢١.
٥٨-ديوانه/ ٤٢٠.
٥٩-ديوانه/ ٤٢٧.
٦٠-ديوانه/ ٤٢١.
٦١-العمدة ٧٢/٢ أ.

سەرچاوەكان:


١-الأدب في العصر الأيوبي: د. محمد زغلول سلام. دار المعارف. القاهرة ١٩٦٨.
٢-الأدب في ظل بني بويه: محمود غناوي الزهيري- مطبعة الأمانة- مصر ١٩٤٩.
٣-اربيل في العهد الأتابكي: د.محسن محمد حسين. مطر أسعد بغداد ١٩٧٦.
٤-تأريخ إربل: شرف الدين ابي البركات المبارك ابن المستوفي، ترجمة: سامي الصفار مطبعة: المركز العربي للطباعة، بيروت وزارة الثقافة- بغداد، ١٩٨٠.
٥-ديوان ابن الظهير الإربلي: محمد بن أحمد بن عرم، ترجمة: د.ناظم رشيد، مطبعة دار الكتب الموصل ١٩٨٨م.
٦-ديوان الحاجري: حسام الدين بن سنجر الحاجري. ترجمة: صاحب شنون ياسين، كلية الأداب جامعة بغداد ١٩٨٨ (رسالة ماجستير).
٧-ديوان النشابي: اسعد بن ابراهيم الإربلي. ترجمة: عبدالله محمود طه. كلية الأداب جامعة الموصل ١٩٨٥ (رسالة ماجستير).
٨-دراسات في الشعر في عصر الأيوبيين: د.محمد كامل حسين، دار الفكر العربي، القاهرة ١٩٥٧.
٩-دائرة المعارف الاسلامية.. ط١، القاهرة ١٩٣٣.
١٠-الشعر العراقي في القرن السادس الهجري: مزهر عبد السوداني. درا الطبعة بيروت ١٩٨٠.
١١-الشعر العربي بين الجمود والتطور: الدكتور محمد عبدالعزيز الكفراوي، دار نهضة مصر للطبع والنشر، القاهرة ١٩٧٣.
١٢-طبقات الشافعية: جمال الدين بن الحسن بن علي القوشي الآسنوي. ترجمة: عبدالله الجبوري، مطبعة الأرشاد، بغداد ١٩٧٠.
١٣-العصر العباسي الأول: د.شوقي ضيف، دار المعارف القاهرة ١٩٧٦.
١٤-عيون التواريخ: محمد بن شاكر الكتب. ترجمة: نبيلة عبدالمنعم داود. د.فيصل السامر، دار الحرية للطباعة، بغداد ١١٩٤٨.
١٥-الغصون اليانعة في محاسن شعر المئة/ السابعة: ابن سعيد الأندلسي. ترجمة: ابراهيم الأبياري دار المعارف- القاهرة ١٩٦٥.
١٦-فوات الوفيات: محمد شاكر الكتبي، ترجمة: محمد محي الدين عبدالحميد. مطبعة: السعادة مصصر ١٩٥١.
١٧-قلائد الجمان في فرائد شعراء هذا الزمان: كمال الدين أبي ابركات المبارك بن الشعار الموصلي مصورة كلية التربية- جامعة الموصل في مخطوطة اسعد أفندي في استانبول تحت رقم (٢٣٢٦).
١٨-وفيات الأعيان وأنباء ابناء الزمان: شمس الدين أحمد بن محمد أبي بكر بن خلكان، ترجمة: د.احسان عباس، دار الثقافة- بيروت ١٩٦٨.

المجلات:

١-مجلة آداب الرافدين: مجلد ٩ سنة ١٩٧٨. د.ناظم رشيد. بحث بعنوان (الشعر في إربل في ظل الأسرة البكتكينية ٥٢٦-٦٣٠ ه).
٢-مجلة المجمع العلمي العربي- دمشق: مجلد ٢١-٢٢ سنة ١٩٤٦ و ١٩٤٧ عباس العزاوي (أل بكتكين- إمارة إربل عدهم).


لەدوا مەنزڵگا لە موسڵ و، شەوێ لەشەوانی خۆشیدا، كە سەدەقەی كوڕی محەمەد هەولێری چەند دێڕێک لە شیعرەکانی بەگۆرانی دەڵێت دەگوزاێتەوە هەروەک لە (المجتث)دا دەڵێت:

**اذا تمنع صبري**
**وحان بالهجري صبري**
**ناديت والليل داج**
**وقد خلوت بفكري**
**يارب هب لي منه**
**وحال يوم بعمري**

سەدەقە زێتری هاویشتە سەری و گوتی:

**لا اجتني ورد خد**
**زاه على كل زهر**
**واجتلي غصن بان**
**يميس من تحت بدر**
**ان صح لي ذاك منه**
**يوما وخيت بنذي**

وەرگێرانی
فاتح یاسین مودەریس



یادی دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کورد، ١٠/٢/٢٠٠٩، هەولێر



# بیۆگرافیای نووسەرانی هەولێر

ئا: عەبدولڕەحمان مەعروف

**یەکەم: چیرۆکنووسان:**

چیرۆکی هونەری کوردی یەکێکە لە ژانرە ئەدەبییەکان، کەوا لەچاو شیعر زۆر درەنگ و چەند سەدە دواتر بەو شێوە چڕوپڕە و هونەرییەی ئەمڕۆ لەبەردەستدایە لەدایک دەبێت، ئەگەر بێت و پێمان وا بێت و مل بۆ ئەو رایە بدەین، کە چیرۆکی هونەری کوردی لە رێگای گواستنەوە و سوودوەرگرتن و کاریگەریی ئەدەبی ئەورووپاوە گەیشتۆتە نێو ئەدەبی کوردییەوە و لەوێوە سەرچاوەدەگرێت، دکتۆر مارف دەڵێت: "چیرۆک هونەرێکی ئەوروپایە "، حوسێن عارفیش زۆر راشکاوانە دەڵێت: "چیرۆکی هونەری وەک بابەتێکی ئەدەبی تازەی بێگانە هاتە ناو ئەدەبی کوردییەوە "، بەڵام بەر لەو دەستەیەش بۆچوونی جیاوازی گروپێکی دیکە دەبیندرێت، کە بنەما و سەرهەڵدانی چیرۆکی کوردی بۆ سامانی لەبن نەهاتووی نەتەوەیی و چیرۆک و هەقایەتی فۆلکلۆری کوردی دەگێڕنەوە، بەو واتایەی درێژبوونەوە و پێشخستنی چیرۆک و داستانی کوردییە، ئەوەی ئەمڕۆ لەسەر بناغەی دوێنێ بنیات نراوە. دەشکرێ ئەو رایەمان قبووڵ بێت، وەک ئەوەی کتومت چیرۆکی هونەری کوردی وەرگیراوی چیرۆکی هونەری ئەورووپا نەبێت و بە لاسایی گوازرابێتەوە، بەڵام ناشکرێت رەتی کاریگەری و کەلک وەرگرتن بکەینەوە، کە چیرۆکنووسی کوردیش بەدەر بێت لەو بۆچوونەی، کەوا پێی وایە چیرۆکی هونەری کوردی هەڵێنجراوی ئەم دوو رایەیە، کە سەرچاوەی چیرۆکی کوردی لە بەیەکەوە گرێدانی هەردوو هەنگاو و هەر دوو رێچکەوە بێت: بە سوود وەرگرتن لە سامانە نەتەوەییەکە و پاراوکردنی و کاریگەریی چیرۆکی هونەری بێگانەی دەزانێت، وەک دکتۆر عزەدین مستەفا رەسووڵ، دەڵێت: " چیرۆکی کوردی نە بە بەردەوامی حیکایەتی کوردی دەزانین و، نە بە سنعەتێکی گوێزراوەو وەرگیراوی ئەورووپایی دادەنێین. " هەر یەکە لەم بیرورِا جیاوازانەش کۆمەڵێک بەڵگە و بۆچوونی خۆیان دێننەوە و پشتەستووری راکانییان دەسەلمێنن، بگرە رەتکردنەوەی بۆچوونەکانی بەرامبەریش دەبیندرێت. بەڵام لێرەدا ئەوەی لەم دەلیقەیە بەلای منەوە گرنگە ئەوە نییە وەڵامێکی یەکلاییکەرەوە و پرسیارگەلی ئەوەی، چیرۆکی هونەری کوردی چۆن و کەی سەریهەڵداوە؟ بەقەد ئەوەی کوردیش لەو رەگەزە ئەدەبییەی پێی دەگوترێت چیرۆک یاخود (چیرۆکی هونەری) نزیکەی سەدەیەکە دەستی داوەتێ و لەنێو ئەدەبی کوردیشدا بوونی هەیە، ئەمڕۆش هەنگاوی بەرچاو و چاکی هەڵێناوەتەوە، تەنانەت رای ئەوتۆ هەیە پێی وایە چیرۆکی کوردی ئەمڕۆ شان لە شانی یان قەرە بە قەرەی چیرۆکی جیهانی دەڕوات و هیچی لەو کەمتر نییە. وەلێ هەمیشە و زۆربەی کات بەرایی و دەست پێکردن وەک هەنگاوەکانی دوای خۆی و درەنگتر نییە، گۆڕان حەتمییە و شتی تازە و بابەتی نوێ

دێتەپێشەوە، هیچ شتێک لە قالب و بازنەی خۆیدا نامێنێتەوە، ئەلبێر کامۆش لە شانۆگەری کالیگۆلادا دەڵێت: هەموو شتێک لەگەڵ کاتدا بەسەردەچێت. کات هیچ دواکەوتنێک هەڵناگرێت. بێگومان هەر قۆناغە سیما و خەسڵەتی تایبەت بە خۆی هەیە و ئەدەبیش لەدایکبووی سەردەمەکەی خۆیەتی، بۆیە دەبێ بە چاوی ئەو رۆژگارە سەیری بکرێت و لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکرێت، وەک ئەوەی لە دابەشکردنی قۆناغەکانیش بە زەقی بەرچاودەکەوێت و هەستی پێدەکرێت. دەست نیشانکردنی ئەم قۆناغانەش سەرەتا و دەستپێکی بڵاوکردنەوە و دەرکەوتنی چیرۆکنووسەکان دیاری دەکات، بەو واتایەی قۆناغەکان و ریزبەندی ناوەکان لەسەر ساڵی یەکەمی بڵاوکردنەوە و چاپبوونی بەرهەم رۆنراون. دواتریش پەنجە نەخراوەتە سەر چەندێتی و چۆنێتی و هونەر و دەسترەنگینی و خەیاڵ و جیهانبینی چیرۆکنووس، کە ئەمە کاری بیبلۆگرافیا نییە، بەقەد ئەوەی کار لەسەر تۆمارکردن و ناوهێنانی چیرۆکنووسان یان ئەوانەی تەنیا چەند چیرۆکێکی هونەریان لە ماوەیەکی زەمەنی دیاریکراو و زۆر کورتدا بڵاوکردۆتەوە دەکات. سەرەنجامیش مێژووی ئەدەبی کوردی و رەخنەی ئەدەبی ناوەکان لێک هاوێردەکەن و پێشەنگ و سوارچاک و چیرۆکنووسی داهێنەر و بەتوانا دەستنیشان دەکەن، تەنیا دەنگ و ناوی ئەوانە دەمێنێتەوە لەراستیدا چیرۆکنووس بوون، چەقی نووسین و داهێنانەکانیان ئادەمیزاد و رۆشنکردنەوەی ژووره تاریکەکانی رۆحی و دۆزینەوەی مرۆڤەکانە!! گەران و ئۆقرەنەگرتنە. رەنگە زۆری چیرۆک و بەرهەم و بەردەوامبوون لەسەر نووسین، خاڵی سەرکەوتن و باڵایی نووسەربێت، بەڵام گەلێک جاریش نووسەری وا هەیە بەچەند چیرۆک و دەقێکی ئەدەبی بوونی خۆی دەسەلمێنێت و لە بوارەکە دەبێتە دەنگێک و شوێن پەنجە و کاریگەریی خۆی بەجێ دێلێت، ئەمەش بەوەی ناوەند و چەقی قەڵەم خستنە سەر کاغەزی خودی -نووسەر- خۆیەتی...ئازادکردنی نهێنییە سندمکراو و حەشاردراوەکانی بنەبانی ناخێتی، وەک ئەوەی ئەحمەد هەردی لە شیعری کوردیدا تەنیا بە (١٤) چوارده شیعر پێگەی خۆی دیاری کرد. لەو ناوانەش کەسی وا هەیە لەیەک کاتدا شیعر و چیرۆک دەنووسێت، بەڵام لە کام بوار یاخود لە کیهان ژانرە ئەدەبییەکە پتر چالاک و ناسراو بێت، لەو بەشە و لە بن ئەو ساباتە ناوم نووسیوە، تەنانەت ئەگەر لە هەر دوو بوار یان لە چەند لایەنێک دەق و کتێبی سەرکەوتووشی هەبێت، ئەوا ئاماژەم پێکردووە و لە تۆمارکردنی ناوی بەرهەم و دەقە ئەدەبی و کتێبە چاپکراوەکانیشی هەستی پێدەکرێت، بەرهەمەکانی سەنگی مەحەکن و توانا و دەسەڵاتی داهێنانی دەخەنەڕوو.

کەسی واش هەیە لەوانەیە لە یەک چاپکراو یان چەند دەقێکی ناو گۆڤار و رۆژنامەکان زیاتر نووسین و بەرهەمێکی دیکەی بڵاونەکردبێتەوە، ئیدی یان دابڕاوە یان بایداوەتەوە سەر پانتایی و دنیایەکی دیکە لە نووسین، ئەوەشیان لە بەرهەمە چاپکراوەکانیدا دەردەکەوێت، نووسەر خەریکی چییە و ئێستا بەکوێ گەیشتووە؟

ئەوەی لێرەشدا دەمەوێ بیڵێم من لە دابەشکردن و ریزبەندی ناوەکان، تەمەنی بڵاوکردنەوەم بە پێوەر وەرگرتووە و لەسەر ئەو بنەمایەش ژمارەم بۆ هەر یەکێک لە چیرۆکنووس و شاعیر و نووسەرەکان داناوە، بەو واتایەی بە پێی پیتە ئەبجەدییەکان کارم نەکردووە، وەک ئەوەی زۆربەی بیبلۆگرافیا و بیۆگرافیاکان پەیڕەوی لێدەکەن. بەڵام من لەم کارەمدا بە مەبەستەوە پەیڕەویم لە دەستپێکی بڵاوکردنەوە کردووە و هەر یەکێکیشیانم خستۆتە قۆناغی خۆیەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی شوێنی خۆی لە کاروانی ئەدەب و چیرۆکی کوردیدا و لە کۆی چیرۆکنووسانی کورد بۆ دەست نیشان بکرێت، کە لە دوای خوێندنەوەی سەرجەم قۆناغەکاندا نەخشە و کاریگەری چیرۆکنووسانی هەولێر بدەینە خوێنەر. لەم کاتەشدا بۆ کارئاسانی خوێنەر لە پێرستێکدا ناوەکان و ژمارەکانیان دەنووسم، بۆ ئەوەی خوێنەریش بە زووترین کات ئەو ناوەی دەیەوێ دەستی بخات، بیگاتێ.

حاڵەتێکی دیکەش لەم کارەمدا، دوای گفتوگۆ و پرس و لێکدانەوەیەکی زۆر لەگەڵ کەسانی شارەزا بەوە گەیشتووم: کۆمەڵێک چیرۆکنووس و نووسەر و شاعیر هەن، لەراستیدا لەدایکبووی هەولێر نین و بە بنەچە و بەرەباب و هەڵکەوتەی جوگرافی ناکەونە سنووری جوگرافیای شاری هەولێرەوە، بەڵام بۆ چەندین ساڵە و

هەیانە تەمەنێکە لە هەولێر نیشتەجێیە، کە من پێوەرەکەم بە بیست ساڵ یان لەدوای راپەرینی بەهاری (١٩٩١)ەوە لە هەولێر گیرسابێتەوە بە مەرج داناوە، چۆن دوو دەیە زۆرە و بێگومان دوای بیست ساڵ لە رەنگ و سیما و زماندا بەخشیوێتی بە هەولێر، بە پێچەوانەشەوە کەلکی لە بنزاری ئاخاوتن و وشە و کلتوور و فەرهەنگی ئەم شارە وەرگرتووە، بە دڵنیاییەوە ئەم تێکەڵاوییە بە گشتی لە قازانج و دەوڵەمەندکردنی زمانی کوردی دەشکێتەوە. بۆیە ناویانم لەتەک ناوی هەولێرییەکان، بەڵام بە جیا و بەشێکی سەربەخۆ لەدواوەی بیۆگرافیاکە بە هەمان شێوازی دابەشکردنی پلانەکەم بەپێی تەمەن و ساڵی بڵاوکردنەوە لە ژێر ناوی (نووسەرانی دانیشتووی هەولێر) ریزکردوون. ئەمەش لەبەرئەوەی لێرەدا تەوەری بیۆگرافیاکەی من لە ئامێزی یان بڵێین لە دووتوێی ئینسکلۆپیدیای هەولێرە، ناچاربووم بەم شێوەیە پرۆژە و کارەکەم چارەسەر بکەم. چونکە ئەم بارەش زۆر جیاوازە لەوەی هەر نەتەوەیەک نووسەرگەلێکی هەن بە زمانی دایک نانووسن، بەڵکو بە زمانێکی دیکە و بیانی دەنووسن، وەک ئەوەی بپرسین ئەرێ یەشار کەمال و سەلیم بەرەکات و عەلی ئەشرەفی دەروێشیان لەسەر ئەدەبی کوردی و نەتەوەی کورد دەژمێردرێن یان نا؟؟ زمان یان دەق و ناوەڕۆک دەست نیشانی ئەدەبی نەتەوەکە دەکەن؟ هەڵبەتە ئەم تەوەرە دوو بۆچوونی جیا و بینەوبەردەیەکی زۆر هەڵدەگرێت و لە هەموو دنیا گەلێک نووسین و قسەشی لەبارەوە کراوە، هەویرەکەش ئاوێکی زۆری دەوێت و ئێرەش جێگەی ئەو ساغکردنەوەیە نییە، لەکاتێکدا شاعیر و نووسەرانێک، کە بە هەمان زمان و بگرە زۆربەشیان بە هەمان شێوە زاریش دەنووسن، هیچ لە هێلە سەرەکییەکە و تەوەرەی گشتی بابەتەکە ناگۆڕێت، تخوب و بازنەی بیۆگرافیاکەش ئەوەندە دەخوازێت و بڕدەکات و جوغز و چوارچێوەیەک هەیە من تێیدا دەخرلێمەوە و ناتوانم لێی دەرچم، بەو واتایەی بە هەندێک کۆت و بەندەوە گرێدراوم. بەڵام چەند ناوێکی دیکەش هەن بە بنەماڵ و لە ریشەوە هەولێرین، کەچی ماوەی لەدایکبوونی ئەو سنووری هەولێریان جێهێشتووە، یاخود دواتریش هەر نەگەڕاونەتەوە، یان ئەو ناوە لە زوویێکەوە زێدی لەدایکبوونی خۆی جێهێشتووە، لە هەر شوێنێکی دیکەی کوردستان یان دەرەوە و هەندەران گیرساوەتەوە، ئەوە هەر دەچێتە بن ساباتی کارەکەی منەوە.

لە لایەکی دیکەش هەر لە دواوەی بیۆگرافیاکە کۆمەڵێک کتێبم تۆماکردوون، کە نووسەرەکانیان، تەنیا لە بواری زانکۆ و نامەی دکتۆرا و بوار و بابەتێکی دیاریکراودا کتێبێک، دوان یان هەیانە زیاتریشی خستۆتە کتێبخانەی کوردییەوە، کەچی لە بواری نووسین و بڵاوکردنەوە و ناوەندی رۆشنبیری کوردی بوونیان نییە و لەسەر پێ نین و کاریگەرییان نییە، بە دیوێکی دیکە قەڵەمەکان بەردەوامییان نییە و بە مانا داهێنانییەکەی خەمی نووسینیان هەڵنەگرتووە، تەنیا کارێکی فەرمییان ئەنجامداوە یان لەبۆشایی کارێکی هونەری یاخود زانستی هەنگاوێکیان هەڵێناوەتەوە، بەڵام لێک هاوێرکردن و دەست نیشانکردنی سەرجەم بوار و بابەت و وردکارییەکان هەروا کارێکی ئاسان نەبوو و لەم دەرفەتە هەر ئەوەندەم لە دەست هات، بە ئومێدم لە داهاتوودا پەرەی پتر بەم کارە بدەم و کەموکورییەکان ریشەکێش و بنەبڕ بکەم، بەتایبەتی کارێکی وا پڕ زەحمەت و ماندووبوون و شەونخوونی. لە نێو نووسەرە ئەکادیمییەکان و مامۆستاکانی زانکۆشدا هەیانە زیاتر وەک نووسەر و ئەدیب و شاعیر ناسراوە و ناوێکی دیاری ناوەندی ئەدەبی و رۆشنبیری کوردییە یاخود لە پاڵ کارە سەرەکییەکەی زانکۆیدا خەریکی پرۆسەی نووسین و داهێنان و بڵاوکردنەوەیە، بۆیە ناویم لەگەڵ لیستی سەرەکی بیۆگرافیاکە و لە شوێنی خۆی: (چیرۆکنووس، شاعیر،...) تۆمار و ریزکردووە.

دیسانەوە گرووپێکی دیکە، کە رێژەکەیان زۆر کەمە، وەک کەسانێکی دیکە و لە ناوەند و بوارێکی دیکە ناوێکی دیار و خاوەنی دەنگ و رەنگ و قورگ و دەست و پەنجەی خۆیانن، بەڵام وەکوو کتێب چاپکردن لە بوار و پسپۆڕییەکەی خۆیاندا خزمەتێکی چکۆلە یان گەورەیان کردووە، بۆیە ئەگەرچی نووسەر و قەڵەم بەدەستێکی چالاک و داهێنەریش نەبووبن یان نەبن، بەڵام ناکرێت هەول و خزمەتەکەی ئەوانیش فەرامۆش بکرێت، چونکە بە داتا و ژمارە کتێبیان پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی یان جوگرافیای شاری هەولێر کردووە، لە ناوهێنانی ئەوانەش

لە برشت و داهێنان و گەورەیی کەس کە منابێتەوە.

خالێکی دیکە بە پێویست دەزانم و گەرەکە ئاماژە پێ بکەم، کەوا پشتیوانی و زوو بەدەنگەوەهاتنی بازێ شاعیر و نووسەر دەستگرتن و رێنوێنی هەندێکی دیکەیان و دەستگوشین و هاندانیان، لە سەرخستن و چوونەپێشەوەی کارەکەم نزیکتری کردوومەتەوە و بە فیعلی دڵسۆز و خەمخۆری من و ناوەندی ئەدەب و رۆشنبیری کوردی بوون، بەڵام دەستەیەکی دیکەیان تا رادەی ساردکردنەوە و بە هەند هەڵنەگرتنی کار و بوار و بابەتەکە و هاوکاری نەکردنم، تەنانەت تاک و تەرایان پێنەدانی زانیاری خودی خۆشی، بگرە بە لێکدانەوەیەکی دیکە پێش پێگرتنیشم، بۆیە ناچاربووم لە سەرچاوە و رێگا و دەرفەتێکی دیکەوە درێژە بە کارەکەم بدەم و زانیارییەکان سەبارەت بەو کەسە یان هەر کەس و پێویستییەکی دیکە دەست بخەم، رەنگە لەو حاڵەتەشدا مرۆڤ هەموو زانیارییەکانی سەد دەر سەد ورد و دروست و لە ئاستی پێویستدا نەبن، بەڵام وەک دەڵێن لە نەبووە باشترە، هەرچەندە من نەکشاومەتە دواوە خۆم بەوەوە نەبەستۆتەوە، سیزیف ئاسا ئەوپەڕی هەوڵ و تێکۆشانی خۆم داوە تاکوو وردترین زانیاری و کەمترین هەڵەم لەهەر کون و قوژبنێکدا هەبێت، بۆ هەر گومان و دڵنیانەبوونێکیش لە زۆر دەرگام داوە و فرە سەرچاوەم پشکنیوە، هەڵبەتە ئەوەشە خەون و خواستی من لەئامادەکردن و رێکخستنی ئەم بیۆگرافیایە، من لەگەڵ خۆم راست بووم و بڕیاری ئەوەم دابوو، دەبێت ئەم پرۆژەیە بگەیێنمە دواقۆناغ. دەرفەت و ماوەش لەمپەرێکی دیکەی سەر رێگای کارەکانم بووە، بۆیە ئەوانەی لێرەدا ناویان نەهاتووە دەستی ئەنقەست و هیچ شتێکی لە پشتەوە نییە و هەر ئەوەیە من دەستم پێی رانەگەیشتووە.

سەرەتاش لە چیرۆکەوە دەستم پێکرد، شارەزایان و رەخنەگرانی ئەدەبی کوردی و بواری چیرۆک چەند قۆناغێکیان بۆ چیرۆکی کوردی دەست نیشانکردووە، پوختەی ئەمانەش، خۆی لەم چەند قۆناغەدا دەبینێتەوە، کە رەنگە بۆچوون و پۆلینکردنی دیکە لە ئارادا هەبێت و یان لە ئایندەدا کار و جۆرە دابەشکردنی دیکە بێتە پێشەوە، بەڵام ئەوەی من تا ئێستا لەسەری کۆکم و قەناعەتم پێی هەبووە، ئەوەیە:

### ١. قۆناغی پەیدابوون و دەرکەوتن (١٩٢٥-١٩٣٩)

### ١. حوسێن سەید عەبدوللەتیف شێخ ئیسماعیل (حوزنی موکریانی)



**لەدایکبووی:** ١٨٩٣ مهاباد - ١٩٤٧ کۆچی دوایی کردووە.

**دەستپێک:** ١٩١٨.

**خوێندن:** خوێندنی حوجرە و کۆششی خۆی

**چاپکراوەکانی:**

- خونچەی بەهارستان، مێژوو، چاپخانەی العصر الجدید حەلەب ١٩٢٥. ٩٤ لاپەڕە.
- خۆشی و ترشی، چیرۆک، چاپخانەی زاری کرمانجی، رەواندز ١٩٢٦. ١٧ لاپەڕە، چاپی دووەم، چاپخانەی کوردستان، هەولێر. ١٩٧٤، ١٨ لاپەڕە.
- بەخێوکردنی ئاوریشم، زانستی، چاپخانەی زاری کرمانجی، رەواندز ١٩٢٨.
- ئاوڕێکی پاشەوە، بەرگی یەکەم، چاپخانەی زاری کرمانجی، رەواندز ١٩٢٩. ٣٧ لاپەڕە.
- ئاوڕێکی پاشەوە، بەرگی دووەم، چاپخانەی زاری کرمانجی، رەواندز ١٩٣٠. ٦٩ لاپەڕە.
- ئاوڕێکی پاشەوە، بەرگی سێیەم، چاپخانەی زاری کرمانجی، رەواندز ١٩٣١. ٥٠ لاپەڕە.
- ئاوڕێکی پاشەوە، بەرگی چوارەم.
- مێژووی ناودارانی کورد، چاپخانەی زاری کرمانجی. رەواندز ١٩٣١. ٢٢٦ لاپەڕە.
- دیتێکی پیشکەوتن، چاپی یەکەم و دووەم، چاپخانەی زاری کرمانجی، رەواندز. ١٩٢٠، ١٩٢٧، چاپخانەی کوردستان، هەولێر ١٩٦٢. ١٥ لاپەڕە.
- تاریخی حکمدارانی بابان، چاپخانەی زاری کرمانجی، رەواندز ١٩٣٠.

- وێنەگەری و کۆلێن، چاپخانەی زاری کرمانجی، رەواندز ١٩٣٤. ٩٥ لاپەڕە.
- مێژووی کورد و نادر شاه لە خاکی ئێرانا، چاپخانەی زاری کرمانجی، رەواندز ١٩٣٤. ٩٠ لاپەڕە.
- مێژووی شاهەنشاهی کوردی زەند، چاپخانەی زاری کرمانجی، رەواندز ١٩٣٤. ٩١ لاپەڕە.
- مێژووی میرانی سۆران، چاپی یەکەم چاپخانەی زاری کرمانجی، رەواندز ١٩٢٦، ١١٢ لاپەڕە. چاپی دووەم چاپخانەی کوردستان، هەولێر ١٩٦٢. ١٢٦ لاپەڕە.
- کوردستانی موکریان یا ئاترۆپاتین، چاپی یەکەم، چاپخانەی زاری کرمانجی، رەواندز ١٩٣٨، چاپی دووەم مهاباد ١٩٨٤
- لاپەڕەیەک لە دێرێکی کوردستانی موکریانی، وەرگێران لە فارسییەوە، چاپخانەی المعارف، بەغداد ١٩٤٧. ٣٦ لاپەڕە.
- مێژووی دوو ساڵەی کوردستانی جنوبی.
- شاری سلێمانی لە ساڵی ١٩٣٤ دا.
- شاری کۆیە لە پاییزی ١٩٣٥ دا.
- موجز تأريخ امراء سوران، ترجمة محمد الملا كريم، مطبعة سلمان الاعظمي، بغداد ١٩٦٨. ٨٦ لاپەڕە.
- هەڵکەوتی دێریکی لە کوردستاندا، بلاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، چاپی یەکەم، هەولێر ١٩٩٩.
- حوزنی جگە لە بوارە ئەدەبییەکە، کە چیرۆک و شیعری نووسیوە، کاری گەورە و خزمەتی زۆری ئەو لە بواری مێژوونووسی و رۆژنامەنووسیدا بووە، وەک لە کتێب و بەرهەمەکانیشیدا دیاردەکەوێت.

**٢. قۆناغی پەرەسەندنی چیرۆکی کوردی (١٩٣٩-١٩٥٠)**

**٢. ئیحسان مستەفا محامی**



**لەدایکبووی:** ١٩٢٦/ هەولێر.

**دەستپێک:** ١٩٤٤/ چیرۆکی سکاڵای مردوو/ گۆڤاری دەنگی گێتی تازە.

**خوێندن:** بڕوانامەی لیسانسی/ کۆلێژی مافی زانکۆی بەغداد/١٩٤٩

**چاپکراوەکانی:** تەنیا ئەو چیرۆکانەی لە گۆڤارەکانی چلەکان و پەنجاکان بلاوی کردوونەتەوە.

دوای نیو سەدە لە ساڵی (٢٠٠٠) مەحموود زامداری نووسەر و رۆژنامەنووس نامیلکەیەکی بەناوی (دامەزراندن و ئەفراندن و پێشڕەوێک)سەبارەت بە چیرۆکەکانی، لەگەڵیشیدا دەقی چەند چیرۆکێکی بە چاپ گەیاند.

***٣. قۆناغی گەشەسەندن و چەسپاندنی چیرۆکی کوردی (١٩٥٠-١٩٦١)***

**٣. ئیسماعیل رەسوڵ ئەحمەد**



**لەدایکبووی:** ١٩٢٨-١٩٩١/٧/٢٤

**دەستپێک:** ناوەڕاستی پەنجاکان

**خوێندن:** دەرچووی کۆلێژی ئابووری

**چاپکراوەکانی:**

- ضوء على الجذور التأريخية لثورة ١٤ تموز ١٩٥٨، مطبعة النجوم، بغداد ١٩٥٩، ٨٠ صفحة.
- چەند باسێک دەربارەی ئەدەب و رەخنەی ئەدەبی، دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، دار الحرية للطباعة، بەغداد ١٩٨١. ١٥٨ لاپەڕە.
- تەڵەزگە، کۆمەڵە چیرۆک، دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، مطبعة دار الجماهير للصحافة، بەغداد ١٩٨٦. ١٦٨ لاپەڕە.
- پەرستگەی خۆشەویستی، دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، دار الحرية للطباعة، بەغداد ١٩٩٠.

## ٤. کاکەمەم فەخری (کاکە مەم بۆتانی)



**لەدایکبووی:** ۱۰/۱/۱۹۳۷ کۆیە.
**دەستپێک:** ۱۹۵۷.
**خوێندن:** پەیمانگای بەرزی دارستان/کۆلێژی کشتوکاڵ/زانکۆی بەغداد.
**چاپکراوەکانی:**
- بوومە لەرزە لە گۆمی مەنگدا، کۆمەڵە چیرۆک، چاپخانەی شەفیق، بەغداد ۱۹٦۹. ۱۰۰ لاپەڕە.
- سمکۆڵی ئەهریمەن، کۆمەڵە چیرۆک، چاپخانەی راپەرین، سلێمانی ۱۹۷۳. ۸٤ لاپەڕە.
- بازنە، کۆمەڵە چیرۆک، چاپخانەی شارەوانی، هەولێر ۱۹۷۹. ۱۱۷ لاپەڕە.
- خەرەندی مەرگ کۆمەڵە چیرۆک، چاپخانەی، ۲۰۰۳.
- درز، رۆمان، بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ۱۹۹۷.
- کەوشەنی پەیکەرتاشێکی تر، رۆمان ۲۰۰۳.
- میری ئاوایی وەرزێر، رۆمان ۲۰۰۷.

*** هەڵبەست:** - هۆ تاکە برا، ۲۰۰۳.

*** سیاسەت و یاداشت:**
- کاکی کاکان، ۱۹۹۸.
- تورکمانی کوردستانی باشوور، ۲۰۰۲.
- کاکە بلە.. لە یادمن، ۲۰۰۷.
- مێژووی حکومەتی کوردستانی باشوور: لە دووتوێی یاداشتی شاردا، چاپی یەکەمی (شاخ، ۱۹۸٤). دواتر دووجارشارەوانی سلێمانی، (۱۹۹۸، ۲۰۰۰)چاپی کردۆتەوە.

*** بیرەوەری:**
- کاکەمەمێکی تر، ۲۰۰۳.
- ژانە رێیە خۆڵەمێشییەکان، بەرگی دووەمی بیرەوەری و بەسەرهاتی ساڵانی (۱۹٦٤-۱۹۷۵)، بڵاوکراوەکانی پاشکۆی رەخنەی چاودێر، چاپخانەی بینایی، کوردستان ۲۰۰۷.

*** ئاماری و ئابووری:**
- دارەبەن لە پارێزگای سلێمانی، ۱۹۸۰.
- بەرهەمی رۆژانەی کرێکارانی دارستان، ۱۹۸۱.

## ٥. محەمەد مەولوود محەمەد (مەم)



**لەدایکبووی:** ۱۹۲۷/ مهاباد-۱۹۸۷/ هەولێر
**دەستپێک:** ۱۹۵۷. هەرچەندە بەرلەوە لە ساڵی ۱۹٤۸ لە گۆڤاری گەلاوێژ چەند پارچە پەخشانێکی بڵاوکردۆتەوە.
**خوێندن:** ناوەندی.
**چاپکراوەکانی:**
- چیرۆکەکانی مەم، بەرگی یەکەم، چاپخانەی ئەسعەد، بەغداد ۱۹۷۰. ۱٦۰ لاپەڕە.
- خەرمانەی وشە، هاوبەش، هەولێر ۱۹۷۳.
- گوڵەبەرۆژە، چیرۆکی منداڵان. هاوبەش لەگەڵ ئافەرینی خێزانی، چاپخانەی عەلا، بەغداد ۱۹۸۱. ۷۰ لاپەڕە.
- چیرۆکەکانی مەم، بەرگی دووەم، هەولێر ۱۹۸٤.
- پایزەخەون، نۆڤلێت، بەغداد ۱۹۸۷.
- رێگا، رۆمان.
- کاروان و سەگوەر، رۆمان، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی پەروەردەی هەولێر، هەولێر ۲۰۰۳.

### ٤. قۆناغی نەهامەت (١٩٦٢-١٩٦٩)

## ٦. مەعروف عەبدولقادر عەزیز
## (پرۆفیسۆر د.مارف خەزنەدار)



**لەدایکبووی:** ١٩٣٠/ هەولێر.

**دەستپێک:** ١٩٦٢، هەرچەندە لەسەرەتای پەنجاکانەوە دەستی بە نووسین و بلاوکردنەوە کردووە.

**خوێندن:** لە ساڵی ١٩٥٧ بەشی زمانی عەرەبی لە زانکۆی بەغداد تەواو کردووە. لە ساڵی ١٩٦٣ لە ئامۆژگای رۆژهەلاتناسی سەر بە ئەکادیمیای زانستی سۆڤییەت لە شاری لینیگراد بروانامەی دکتۆرای بەناونیشانی: مێژووی ئەدەبی کوردیی نوێ وەرگرتووە، لە ساڵی ١٩٦٧ بە رووسی چاپ بووە.

**چاپکراوەکانی:**

- بکر دلیر، العدل الاجتماعي (وەرگێران لە کوردییەوە بۆ عەرەبی بە ناوی/مفخر بلاوکراوەتەوە)، بەغداد ١٩٥٤.
- اغاني من كردستان، مطبعة الاسعد، بغداد ١٩٥٦، ٦٤صفحة.
- کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا، چاپخانەی وەفاء، بەغداد، ١٩٦٢.
- مێژووی ئەدەبی کوردی نوێ (١٨٩٠-١٩٦٠)، مۆسکۆ ١٩٦٧.

وەرگێرانی بۆ عەرەبی بە ناوی (موجز تاريخ الادب الكردي المعاصر)، دکتۆر عەبدولمەجید شێخۆ، حەلەب ١٩٩٣.

- الاكراد ملاحظات وانطباعات تاليف ڤلاديمير مينورسكي باللغة الروسية، پتروغراد ١٩١٥، ترجمة وتعليق وتقديم، بغداد ١٩٦٨، الطبعة الثانية، بيروت ١٩٧٨.
- دوانزە سواردی مەریوان و پانزە چیرۆکی دیکەی کوردی، مۆسکۆ ١٩٦٨، بە زمانی رووسی.
- بووکە شووشە، چیرۆکێکی کوردییە، چاپخانەی ئەسعەد، بەغداد، ١٩٦٩.
- ئەڵەمان کوردی، کۆمەڵە چیرۆکێکی تری کوردی، چاپخانەی سندباد، بەغداد ١٩٦٩.
- عەبدوڵلا بەگی میسباح - دیوان، شاعیری گەورەی خاکی موکریان، بەغداد ١٩٧٠.
- زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی، هاوبەش، چاپی یەکەم، بەغداد ١٩٧١.
- دەستووری زمانی عەرەبی بە کوردی، دانانی عەلی تەرەماخی، سەدەی هەڤدەمی مەسیحی، لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوە و پێشەکی، بەغداد ١٩٧٧.
- دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوە، بەغداد ١٩٧٧.
- مخطوطات فريدة ومطبوعات نادرة، دراسات كردية، الجزء الاول، مطبعة المعارف، بغداد ١٩٧٨.
- تاريخ الاستشراق والدراسات العربية والكردية في المتحف الاسيوي ومعهد الدراسات الشرقية في لينيغراد (١٨١٨-٩٦٨)، مقدمة وتعليق وترجمة من الروسية الى العربية، بغداد ١٩٨٠، ٣٨٤ صفحة.
- الرحالة الروس في الشرق الاوسط، الفه باللغة الروسية ب.م.دانتسيغ، مقدمة وتعليق وترجمة عن الروسية، بيروت ١٩٨١.
- نالی لە دەفتەری نەمریدا، بەغداد ١٩٨٠.
- لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، بریتییە لەچوارده لێکۆڵینەوە، چاپخانەی المؤسسة، بەغداد ١٩٨٤.
- کوردیادە، داستانێکی شیعر ئامێزە، چاپی یەکەم، لەندەن ١٩٨٥،چاپی دووەم، هەولێر ١٩٩٨.
- گەشتێک بۆ ئەرزەرۆم، ئەلیکساندەر پوشکین، پێشەکی

و لێکۆڵینەوە و وەرگێران لە رووسییەوە، سۆللەنتونا- سوید ١٩٩٥.
- ئەدەبی رووسی و کێشەی پاسترناک، هەولێر ١٩٩٩.
- رذاذ الذاكرة، اجتهادات فكرية وادبية وثقافية في مقابلات صحفية، دمشق ١٩٩٩.
- مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی یەکەم، هەولێر ٢٠٠١.
- مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی دووەم، هەولێر ٢٠٠٢.
- مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی سێیەم، هەولێر ٢٠٠٣.
- کوردی تورکمانستان - مێژوو، ئەتنۆگرافیا، ئەدەب، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر ٢٠٠٣. ٢٥٨ لاپەڕە
- مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی چوارەم، هەولێر ٢٠٠٤.
- مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی پێنجەم، هەولێر ٢٠٠٥.
- مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی شەشەم، هەولێر ٢٠٠٦.
- مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی حەوتەم، هەولێر ٢٠٠٧.
- دیجلەی هزرم، کۆمەڵە وتارێک، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، چاپکراوەکانی دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر ٢٠٠٦.
- بەردو رۆژ، کۆمەڵە چیرۆک، بلاوکراوەکانی کتێبفرۆشی سۆران/هەولێر، چاپخانەی سیما، سلێمانی ٢٠٠٦.
- د. معروف خەزنەدار، السيرة الذاتية والعلمية والادبية والاجتماعية (موجز)، اربيل، ٢٠٠٧/بە زمانی کوردی و عەرەبی.
- دیوانی نالی، چاپی دووەم، هەولێر ٢٠٠٨.
- فەرهەنگی دیوانی نالی، چاپی دووەم، هەولێر ٢٠٠٨.
- رۆژگاری من/ پەیدابوون ١٩٣٠-١٩٤٩، یاداشت، بەرگی یەکەم، چاپخانەی حاجی هاشم، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٩. ٢٤٨ لاپەڕە.
- رۆژگاری من/ دروست بوون ١٩٤٩-١٩٦٠، یاداشت، بەرگی دووەم، چاپخانەی حاجی هاشم، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٩. ٣١٢ لاپەڕە.

### ٥. قۆناغی تەقینەوە و تەکنیکی نوێ (١٩٧٠-١٩٩١)

## ٧. حوسام کەریم زەمان
## (حوسام بەرزنجی)



- **لەدایکبووی:** ١٩٥١/ هەولێر.

**دەستپێک:** ١٩٦٨.

**خوێندن:** دەرچووی کۆلیژی ئاداب/ بەشی زمانی ئینگلیزی زانکۆی موسڵ.

**چاپکراوەکانی:**

- زەلیل، نۆڤلێت، ١٩٨٢.
- کانگای بەلا، رۆمان.
- وێنە یەکتربڕەکان، نۆڤلێت. ژمارە (٤) گۆڤاری کاروان خولی راپەڕین.
- نۆرینگ، رۆمان، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٦.
- سایەبان: کۆمەڵە چامەیەکە، وەرگێران لە ئینگلیزییەوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی دیلان، سلێمانی ٢٠٠٦.
- گۆڕە درەوشاوەکان، رۆمان، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٨.

* هەنووکە لە ئەڵمانیا دەژی.

### ٨. یووسف عەبدولڕەحمان مامە (یووسف دەربەدەر)



**لەدایکبووی:** ١٩٥٤ هەولێر -١٩٧٢ لە (قصر النهایة) شەهیدکراوە.
**دەستپێک:** ١٩٧٠.
**خوێندن:** ئامادەیی.

**چاپکراوەکانی:**
- درک و گوڵ، شیعر، بەغداد ١٩٧٢.
- ئایا گوناهبارە، چیرۆک، بەغداد ١٩٧٢.

### ٩. شێرزاد قادر هەینی



**لە دایکبووی:** ١٩٥٥ هەولێر.
**دەستپێک:** سەرەتای حەفتاکان.
**خوێندن:** ئامۆژگای تەکنەلۆژیای (رووپێوی)، بەغداد.

**چاپکراوەکانی:**
- لەیادی سەد ساڵەی شارەوانیدا، هەولێر ١٩٨٥.
- هەرلە شارەوانیدا، ١٩٩٤ (١٢) ژمارەی رۆژنامەی هەولێر.
- کەلاوە، ١٩٩١، ریپۆرتاژ، بۆ ئۆردوگاکانی دەڤەری هەولێر..
- دیوەخانی فلێن، رۆژانەو ریپۆرتاژ، ١٩٩٩.
- هەولێر.... تا دبلن، ریپۆرتاژ، بلاوکراوەکانی گۆڤاری هاڤیبوون/٢، چاپی یەکەم، زانکۆی ئازادی بەرلین ٢٠٠٠.
- بەغداد.... بۆ هەولێر، ریپۆرتاژ، سوید و سلێمانی ٢٠٠٠.
- مەملەکەتی فارگۆنەکان، ریپۆرتاژ، سلێمانی ٢٠٠١.
- کاکە نەبو ئیسماعیل، سلێمانی ٢٠٠١.
- گابریل گارسیا مارکیز، بەسەرهاتی دەریاوانێکی خنکاو، سلێمانی ٢٠٠١.
- دە رۆژەکەی هەولێرم، وتار و ریپۆرتاژ، هەولێر، ئوستراليا ٢٠٠١.
- سارد یان گەرم، چاپکراوەکانی دەزگای هەواڵ بۆ رۆژنامەوانی و راگەیاندن، چاپی یەکەم، ٢٠٠٥.
- ماندێلا، گەشتە دوورەکەم لە پێناوی ئازادیدا، وەرگێران، چاپکراوەکانی دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر ٢٠٠٥.
- فارگۆنەکان... ریپۆرتاژ و رۆژانە، بلاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی بەدرخان، هەولێر، ٢٠٠٥.
- مەملەکەتی کەلاوە، وتار و پێناسەی بیناسازی کوردییە، کتێبی گیرفان، وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر.
- کۆریا / پێناسە و شارەزابوونی وڵات و میللەتی کۆریایە، وەگێران، بلاوکراوەکانی دەزگای وەرگێران، هەولێر ٢٠٠٧.
- ستیفان بروشفیلد، پول ئا. لیڤین، هۆلۆکۆست /ئاگاداری نەوەکانتانی پێ بکەنەوە، وەرگێران لە عەرەبییەوە، بلاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکری و ئەدەبی نما، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٧.
- دوو برێنسیسی نازداری بێناز، دیانا و ماساکۆ، وەرگێران و ئامادەکردن، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٨.
- مارتن لۆسەر، وەرگێران و ئامادەکردن، سەنتەری

مەسەلە، هەولێر ۲۰۰۸.
- بیار بیون، بەرەو کۆشکی ئالیزی، شیراک و سارکۆزی و روایال، وەرگێران، بلاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری- خانەی وەرگێران، چاپخانەی روون، چاپی یەکەم، سلێمانی ۲۰۰۸.
- ۹۵۵ دەقە لەگەڵ شێرکۆ بێکەس، بلاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکری و ئەدەبی نما، هەولێر ۲۰۰۱، ۳۳۳ لاپەڕە.
- دۆلار لە ئەمریکا، دوو بابەت لە سەر پارە و سەرمایە و بانک لە ئەمریکای نوێدا، ئامادەکردن و وەرگێران، بلاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم، هەولێر ۲۰۰۸.
- کریستۆفا دلوار و کریستۆف دۆبوا، سێکس و پۆلەتیک، وەرگێرانی لە عەرەبییەوە، بلاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی یەکەم، سلێمانی ۲۰۰۸.
- کامیلیانە ئەنتفایفر دو فرانسوا نیکۆلۆ و منی لنی، من جاسووس نیم، وەرگێران، بلاوکراوەکانی خانەی وەرگێران، چاپخانەی شڤان، چ ۱، سێمانی ۲۰۰۹.

* هەنووکە لە وڵاتی سوید دەژی.

## ۱۰. عەبدوڵڵا محەمەد سەعید (عەبدوڵڵا زەنگەنە)



**لەدایکبووی:** ۱۹۵۳ هەولێر
**دەستپێک:** سەردەتای حەفتاکان
**خوێندن:** دەرچووی زانکۆی تەکنەلۆژیا/ بەغداد ۱۹۸۰.

**چاپکراوەکانی:**
- رۆژنامەنووسی کوردی لە کوردستانی دوای راپەڕین، چاپکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ۱۹۹۸.
- ژیانەوە و شوێنی لە رۆژنامەگەری کوردیدا، هەولێر ۲۰۰۰.
- فاروق عەلی عومەر، رۆژنامەنووسی کوردی لە عێراقدا/بەراییەکان، ساغکردنەوەی دەقە کوردییەکان/ وەرگێران، هاوبەش، هەولێر ۲۰۰۱.
- بیبلۆگرافیای چوار ساڵەی گۆڤاری رامان/هاوبەش/هەولێر ۲۰۰۳.
- رۆژی کورد، گۆڤاری جڤاتی هێڤی قوتابیانی کورد، هەولێر ۲۰۰۳.
- د. کەماڵ مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد، بەرگی دووەم، ئامادەکردن، بلاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی، چاپی یەکەم، هەولێر ۲۰۰۷.
- د. کەماڵ مەزهەر ئەحمەد، کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی بەریتانیا، ئامادەکردن، ۲۰۰۸.

## ۱۱. عەبدوڵڵا خدر مەولوود (د. عەبدوڵڵا خدر)



**لەدایکبووی:** ۱۹۵۰/ هەولێر.
**دەستپێک:** ۱۹۷۲.
**خوێندن:** بروانامەی ماستەری بەناونیشانی (لێکۆڵینەوەیەک لە شیعری حەمدی/ ۱۹۹۶).

دکتۆرایشی بەناونیشانی (لێکۆڵینەوەیەک لە شیعرە ئایینی و سۆفیگەری و فەلسەفییەکانی نالی)، ٢٠٠٣.

**چاپکراوەکانی:**
- خەرمانەی وشە (هەناسەی چەند دەنگێکی تووڕەیە)، بەرهەمی هاوبەش، ١٩٧٣.
- چەند وردە یادێکی مەیبیو، کۆمەڵە چیرۆک، بڵاوکراوەکانی بزاڤی رۆشنبیرانی نوێخواز، هەولێر ١٩٩٩.
- الا یا ایها الساقي و دە بابەتی تر (لێکۆڵینەوەی ئەدەبی)، بڵاوکراوەکانی بزاڤی رۆشنبیرانی نوێخواز، هەولێر ٢٠٠١.
- لێکۆڵینەوەیەک لە شیعری حەمدی، (لێکۆڵینەوە)، وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری هەولێر ٢٠٠٤.
- مەسەلەکانی کوردەواری، (کەلەپوور)، هاوبەش، هەولێر ٢٠٠٥.
- مەسەلەکانی کوردەواری، (کەلەپوور)، هەولێر ٢٠٠٧.
- لێکۆڵینەوەیەک لە شیعرە ئایینی و سۆفیگەری و فەلسەفییەکانی نالی، (لێکۆڵینەوە)، هەولێر ٢٠٠٨.
- دیوانی حەمدی، ساغکردنەوە و رێکخستن و چاپکردنی، هەولێر ٢٠٠٨.

## ١٢. شێرزاد حەسەن سلێمان



**لەدایکبووی:** ١٩٥٢/ هەولێر

**دەستپێک:** ١٩٧٤

**خوێندن:** بەکالۆریۆس لە زمانی ئینگلیزی، کۆلێژی ئاداب/ زانکۆی بەغدا ١٩٧٤-١٩٧٥

**چاپکراوەکانی:**
- تەنیایی، کۆمەڵە چیرۆک، چاپی یەکەم ١٩٨٣، چاپی دووەم.
- گوڵی رەش، کۆمەڵە چیرۆک، چاپی یەکەم ١٩٨٨، چاپی دووەم.
- گەرەکی داهۆڵەکان، کۆمەڵە چیرۆک، چاپی یەکەم ١٩٩٦، چاپی دووەم ٢٠٠٠، چاپی سێیەم.
- پیرە پەپوولەکانی ئێواران، کۆمەڵە چیرۆک.
- حەسار و سەگەکانی باوکم، کورتە رۆمان، چاپی یەکەم ١٩٩٧، چاپی دووەم ٢٠٠٠، چاپی سێیەم.
- پێدەشتی کارمامزە کوژراوەکان، رۆمان، دوو چاپ.
- تەمی سەرخەرەند، رۆمان.
- بە تووڕەیی ئاوڕێک لە رابردوو بدەرەوە، شانۆگەری، نووسینی: جۆن ئۆزبۆرن، لە ئینگلیزییەوە، بەغداد ١٩٨٦.
- پیتەر ڤایس، مارا- ساد، شانۆگەری، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، چاپکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ١٩٩٩. ٢١٦ لاپەڕە.
- شکسپیر، مەرگەساتی شاه لیر، شانۆگەری، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، چاپکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٠. ١٧١ لاپەڕە.
- فەرحان بولبول، گوندەکانی بەرەو مانگ هەڵدەکشێن، شانۆگەری، بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری/ بەڕێوەبەرێتیی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوە، سلێمانی ٢٠٠١.
- فرمێسکەکانی کوکوختی، کۆمەڵە چیرۆک، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ١٩٨٧.
- گەنجە ئازاکەی سەر جۆلانەکە، کۆمەڵە چیرۆک، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە.
- لە ستایشی ئەدەبدا، کۆمەڵە وتارێک، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە.
- بێ کتێب هەڵناکەم، چەند تێڕوانینێکی ئەدەبی، بنکەی ئەدەبی و رووناکبیری گەلاوێژ، چاپخانەی داناز، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٠.
- قەلەڕەش و زەنگەکان، کۆمەڵە شیعرێک، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە.
- هەقتە بزانی، رۆژنامە و راگەیاندن، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، بەڕێوەبەرێتیی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوە، سلێمانی.

- میلدرید نیومان و بێرنارد بێرکۆتس، تۆ چۆن دەبیت بە باشترین هاوڕێی خۆت، دەروونناسی، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، کتێبی گیرفان، زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ۲۰۰۲، چوار چاپ.
- باڵەکانی فریشتە، کۆمەڵە شیعرێک، ورگێڕان لە ئینگلیزییەوە، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ۲۰۰۵.
- دوژمنی گەل و مێگەلیزم، "۱۷" وتاری شانۆیی، وەزارەتی رۆشنبیری، سلێمانی ۲۰۰۵.
- وێندی گرانت، تۆ بەسەر خۆتدا زاڵبیت، لە ئینگلیزییەوە، چاپخانەی رەنج، ۲۰۰۵.
- سومبولەکانی بیرەوەری، شێوەکاری، وەزارەتی رۆشنبیری، سلێمانی ۲۰۰۵.
* ئێستا لە سلێمانی دەژی.

## ۱۳. مەولوود ئیبراهیم حەسەن (د.مەولوود)



**لەدایکبووی:** ۱۹۵۱/ هەولێر

**دەستپێک:** ۱۹۷٤ سەرەتا بەشیعر دەستی داوەتە نووسین، یەکەم چیرۆکی ساڵی ۱۹۷۹ بڵاوکردۆتەوە.

**خوێندن:** ۱۹۸٤ بکالۆریۆس - زانکۆی بەغداد - زمان و ئەدەبی فارسی.

۲۰۰۱ ماستەر - زانکۆی سلێمانی - لە ئەدەبی کوردی (گەڕان بەدوای نەمریدا).

۲۰۰۷ دکتۆرا - زانکۆی سەلاحەددین - لە ئەدەبی کوردی (پێکهاتەی ئەفسانەی کوردی).

**چاپکراوەکانی:**

- وریابن خەوتان لێ نەکەوێ، چیرۆک بۆ مێردمنداڵان، ۱۹۸۱. ٦۰ لاپەڕە.
- خۆت لەمن بزرمەکە، شیعر، ۱۹۸۵.
- قەدەغەشکێنی، لێکۆڵینەوەیەکە لە ئەفسانەی کوردی، چاپکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ۲۰۰۰. ٤٥۰ لاپەڕە.
- گەڕان بەدوای نەمریدا، نامەی ماستەر، هەولێر ۲۰۰۲.
- بەردەژن، کورتە رۆمان، بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان، چاپی یەکەم، سلێمانی ۲۰۰۱. ۱۱٦ لاپەڕەیە.
- پیری کێوان، کورتە رۆمان، وەزارەتی رۆشنبیری، چاپی یەکەم، سلێمانی ۲۰۰٤.
- هێلکەی نامێ، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، هەولێر ۲۰۰٦.
- هێلکەی نامێ، بەرگی یەکەم، بەشی دووەم، هەولێر ۲۰۰٦.
- پێکهاتەی ئەفسانەی کوردی، نامەی دکتۆرا، سلێمانی ۲۰۰۷.
- تێرنەخۆرە، بەرگی یەکەم، بەشی سێیەم، بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان، چاپخانەی رۆژهەڵات، هەولێر ۲۰۰۸.
- زیاتر لە عیشقێک، بەرگی یەکەم، بەشی چوارەم، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان. چاپخانەی رۆژهەڵات، هەولێر ۲۰۰۸

## ۱٤. سابیر رەشید ساڵح



**لەدایکبووی:** ۱۹۵٦/ هەولێر

**دەستپێک:** ۱۹۷٤

**خوێندن:** دەرچووی کۆلیژی یاسا و رامیاری زانکۆی بەغداد ۱۹۸۰ - ۱۹۸۱.

**چاپکراوەکانی:**

- شەش کورتە چیرۆکی کوردی، هاوبەش لەگەڵ کەمال سەعدی، چاپخانەی شارەوانی هەولێر، هەولێر ١٩٧٦.
- خەونە سەوزەکان، کۆمەڵە چیرۆک، ئەمینداریتی گشتی رۆشنبیری و لاوان، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئۆفسێتی حسام، بەغداد ١٩٨٨.
- مەرگی بازنەیی، نۆڤلێت، بلاوکراوەکانی بزاڤی رۆشنبیرانی نوێخواز، هەولێر ١٩٩٩.
- د. عبدالرضا الطعان، پێناسەی دەستوور، وەرگێڕان لە عەرەبییەوە، رێکخراوی بلاوکردنەوەی رۆشنبیری یاسایی، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٤.
- برتراند ئوجیلفی، دەروازەیەک بۆ هزرنامەی لویس ئەلتۆسێر، وەرگێڕان لە عەرەبییەوە، زنجیرە کتێبی چاپ و پەخشی سەردەم، کتێبی گیرفان، سلێمانی ٢٠٠٤.
- تاوانباری جەنگ، بلاوکراوەکانی یەکێتی مافپەروەرانی کوردستان، چاپخانەی منارە، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٥.
- چیرۆکی کوردی، رەخنە و لێکۆڵینەوە، وەزارەتی رۆشنبیری، کتێبی گیرفان، هەولێر ٢٠٠٦.
- ئاوێنە، سەد کورتیلە چیرۆکی کوردی، بلاوکراوەکانی کتێبفرۆشی سۆران/هەولێر، چاپخانەی گەنج، سلێمانی ٢٠٠٦.
- رۆمانی کوردی، خوێندنەوە و پرسیار، ٢٠٠٧.
- گیای سەروەری، کۆمەڵە چیرۆک، وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٨.
- پەیژەکانی تاریکی، چیرۆک، بلاوکراوەی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٨. ٢٥٦ لاپەڕە.

## ١٥. کەمال سەعدی مستەفا
## (پ.ی د. کەمال)



**لەدایکبووی:** ١٩٥٦/ هەولێر

**دەستپێک:** ١٩٧٥

**خوێندن:** دەرچووی کۆلێژی یاسا و دواتر ماستەر هەر لە یاسا بەناونیشانی(حقوق الملكية الادبية والفنية في القانون العراقي والمقارن)، ئینجا دکتۆراشی هەر لە زانکۆی سەلاحەددین وەردەگرێ تێزەکەشی بەناونیشانی (چوارچێوەی یاسای ئازادیی رۆژنامەگەری لە کوردستانی عیراقدا).

**چاپکراوەکانی:**

- شەش کورتە چیرۆکی کوردی، هاوبەش لەگەڵ سابیر رەشید، چاپخانەی شارەوانی هەولێر، هەولێر ١٩٧٦. ٣٤ لاپەڕە.
- ون بوون، کۆمەڵە چیرۆک، هەولێر ١٩٨٤.
- دەرگا، کۆمەڵە چیرۆک، بلاوکراوەکانی سەعدوڵلا شێخانی، چاپخانەی "الحوادث"، بەغداد ١٩٩٠.
- سەعید زەبۆکی لای خۆمان، رۆمان، چاپکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ١٩٩٦.
- ترحێو، کۆمەڵە چیرۆک، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر ١٩٩٨.
- ئازادی رۆژنامەگەری و ئەخلاقی پیشە، بلاوکراوەکانی رێکخراوی بلاوکردنەوەی رۆشنبیری یاسایی، هەولێر ٢٠٠٤.
- ئازادی رۆژنامەگەری و دیموکراسیەت، بلاوکراوەکانی بزاڤی رۆشنبیرانی نوێخواز، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٤.
- هونەری منداڵان، چاپخانەی کریستال، هەولێر ١٩٩٨.

- حقوق المؤلف، چاپخانەی کریستال، هەولێر ١٩٩٧.
- چەمکی یاسا، بلاوكراوەكانی چاپخانەی زانكۆی سەلاحەددین ١٩٩٩.
- چەمکی ماف، چاپخانەی کریستال، هەولێر ١٩٩٨.
- لێکدانەوەی یاسای بەکرێدان، چاپخانەی زانكۆی سەلاحەددین ١٩٩١.
- مافی دانەر، وەرگێران (هاوبەش)، چاپخانەی زانكۆی سەلاحەددین ٢٠٠٠.
- دەسەلاتی چوارەم، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری ١٩٩٨.
- چوارچێوەی یاسای ئازادیی رۆژنامەگەری لە کوردستانی عێراقدا، دەزگای ئاراس هەولێر ٢٠٠٦.
- حقوق الانسان، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ٢٠٠٤.
- حقوق الانسان ومعاييرها الدولية، بلاوكراوەكانی کۆمپانیای کوردستان، هەولێر ٢٠٠٤.
- حقوق الانسان في مذاهب الفكرية، بلاوكراوەكانی رێکخراوی بلاوكردنەوەی رۆشنبیری یاسایی، هەولێر ٢٠٠٦.
- فەلسەفە و یاسا لە چەند وتارێکدا، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٥.
- یاسای رۆژنامەگەری، بلاوكراوەكانی رێکخراوی بلاوكردنەوەی رۆشنبیری یاسایی، هەولێر ٢٠٠٣.

## ١٦. رەزا سەید گوڵ شێخ جەلال بەرزنجی



**لەدایکبووی:** ١٩٤٨/ هەولێر
**دەستپێک:** ١٩٧٥
**خوێندن:** دەرچووی پەیمانگای مامۆستایان

**چاپکراوەکانی:**
- شووشە خوێن، کۆمەڵە چیرۆک، دەزگای رۆشنبیری و بلاوكردنەوەی کوردی، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر ١٩٧٨.
- دیدارێکی دوور، چیرۆکی درێژ، ئەمینداریتی رۆشنبیری و لاوان،چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر ١٩٨٤.
- چاوە ماندووەکان، کۆمەڵە چیرۆک، ئەمینداریتی رۆشنبیری و لاوان، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر ١٩٨٥.
- خەم بەپێوەری رێختەر، کۆمەڵە چیرۆک، وەزارەتی رۆشنبیری، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٣.
- بەفر یا ئەشکەوتەمراز، رۆمان، دەزگای چاپ و بلاوكردنەوەی ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر ٢٠٠٣.
- فاتە، رۆمان، وەزارەتی رۆشنبیری، سلێمانی ٢٠٠٤.
- کوڕی چیا، کۆمەڵە چیرۆک، وەزارەتی رۆشنبیری، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٥.
- توورەبوونی ئاسمان، کۆمەڵە چیرۆک، چاپخانەی "خانی"دهۆک، بلاوكراوەكانی دەزگای توێژینەوە و بلاوكردنەوەی موکریانی، هەولێر ٢٠٠٧.
- کانەبییان، رۆمان، بلاوكراوەكانی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٩.

## ١٧. چیمەن ئەحمەد کاوێس ئاغا



**لەدایکبووی:** ١٩٥٣/ شەقڵاوە
**دەستپێک:** ناوەڕاستی حەفتاکان
**خوێندن:** ناوەندی
**چاپکراوەکانی:**
- لە کوێ یاری بکەین، وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ١٩٩٨.
- ئەسپە باڵدارەکە، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٧.

### ١٨. کاروان عەبدوڵڵا قادر



**لەدایکبووی:** ١٩٥٥/ رواندز
**دەستپێک:** ١٩٧٨
**خوێندن:** دەرچووی بەشی زمانی کوردی کۆلیژی ئادابی زانکۆی سەلاحەددین.
**چاپکراوەکانی:**
- نامەیەکی بە پەلە، نۆڤلێت، شاخ، ١٩٨٥.
- کێوی مەزن نۆڤلێت، چاپی یەکەم، شاخ ١٩٨٥، چاپی دووەم، سوید ١٩٩٢.
- هەژان، چەند چیرۆکێک و رۆمانێک، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٣.
- سەفەری مردووەکان، بەرگی یەکەم، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٢.

* جگە لە رۆمان و چیرۆک لە بوارەکانی کۆمەڵایەتی، سیاسی، رەخنەی ئەدەبی، رۆژنامەنووسی دەنووسێت.

* سەرنووسەری گۆڤاری (کاروان)ـە کە لەوەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان دەردەچێ.

### ١٩. ئاسۆ حەسەن محەمەد



**لەدایکبووی:** ١٩٥٨/ هەولێر
**دەستپێک:** ١٩٧٨
**خوێندن:** دەرچووی کۆلیژی ئەدەبیات بەشی کۆمەڵناسی زانکۆی سەلاحەددین.
**چاپکراوەکانی:**
- کە رەهێڵەی ژەهر دایکرد، شیعری بەردنگاری، شاخ ١٩٨٨.
- تابلۆ تراژیدییەکانی، کورتەچیرۆک، چاپی یەکەم، ورمێ ١٩٨٩، چاپی دووەم، هەولێر ٢٠٠٠.
- هەڵدێران، کورتەچیرۆک، بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٣. ٢٠٩لاپەڕەیە.
- لە دوریانی مەرگ و ژیاندا، توێژینەوەی کۆمەڵایەتی/ سۆسیۆلۆژیایی، بڵاوکراوەکانی دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر ٢٠٠٧.

* وێرای نووسین لە بوارەکانی سیاسی، رۆژنامەڤانی، ئەدەبی، کۆمەڵایەتی،...... لە رۆژنامە و گۆڤارەکاندا.

کۆمەڵێک بابەتیشی لە شاخ بە ناوەکانی کاکل حەسەن، ک. حەسەن، کاردۆ، شوان، ئاسۆ بڵاوکردۆتەوە.

## ٢٠. سەلاح عومەر فەرحان



**لەدایکبووی:** ١٩٥٣/ هەولێر
**دەستپێک:** ١٩٧٤ یەکەم شیعری خۆی بلاودەکاتەوە، ١٩٧٩ یەکەم چیرۆک.
**خوێندن:** دەرچووی پەیمانگای پێگەیاندنی مامۆستایانی هەولێر.

**چاپکراوەکانی:**
- لێک ترازان، کۆمەڵە چیرۆک، ئەمینداریتی گشتی رۆشنبیری و لاوان، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر ١٩٨٦.
- ولاتی تارمایی، رۆمان، چاپی یەکەم، ١٩٩٦، چاپی دووەم، ١٩٩٨.
- تاریکستانی لم، رۆمان، چاپکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٠.
- میتامۆرفۆس، رۆمان، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠١.
- گەمە وردە ماسیەکان، کۆمەڵە چیرۆک، هەولێر.
- دوانامەی دێوەرەیەک، رۆمان، بلاوکراوەکانی مانگنامەی بەدرخان، چاپخانە و ئۆفسێتی شڤان، سلێمانی ٢٠٠٣.
- جەنگ، رۆمان، بلاوکراوەکانی دەزگای ئاراس ٢٠٠٤.
- لین ئۆلنبێرند - لیزلی لویس، کورتەیەک لەبارەی لێکۆڵینەوەی چیرۆکەوە، کتێبی گیرفان، بلاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، وەرگێران، سلێمانی ٢٠٠٣.
- رست هیلز، چیرۆک و تایبەتمەندییەکانی، وەرگێران لە عەرەبییەوە، کتێبی گیرفان، وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٠.
- عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی، سەرەتاکانی هەستی نەتەوایەتی کورد لە مێژووی نوێدا، مێژوو، وەرگێران لە عەرەبییەوە، دەزگای وەرگێران، هەولێر ٢٠٠٦.
- خانمی شەوە ئەرخەوانییەکان، رۆمان، بلاوکراوەکانی گۆڤاری ئایندە، چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، کوردستان، سلێمانی ٢٠٠٨.
- جەنگ، کۆبەرهەم، رۆمان، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٨.
- لێک ترازان، کۆبەرهەم، چیرۆک، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٨.

* سکرتێری نووسینی گۆڤاری (کاروان)ە کە لەوەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان دەردەچێ.

## ٢١. زایەر عەبدوڵلا خدر



**لەدایکبووی:** ١٩٥٨/ هەولێر
**دەستپێک:** ١٩٧٨
**خوێندن:** دەرچووی: ئامادەیی پیشەسازی

**چاپکراوەکانی:**
- کۆمەڵە چیرۆکی خەرەند
- جگە لە کاری ئەدەبی و نووسینی گۆشەی تەنزئامێز لە رۆژنامە و گۆڤارەکان، زیاتر خەریکی کاری هونەری و شانۆیە و تا ئێستاش بەردەوامە.

## ٢٢. عەزیز ئەحمەد رەحیم
## (عەزیزی مەلای رەش)



**لەدایکبووی:** ١٩٣٦/ دیبەگە
**دەستپێک:** ١٩٧٩
**خوێندن:** دەرچووی خوێندنی ئایینی

**چاپکراوەکانی:**
- پشیلۆکە، شیعری منداڵان، چاپخانەی کاکەی فەللاح، سلێمانی ١٩٧٩. ٤٠ لاپەرە.
- قولەمەیتەر، چیرۆک، چاپخانەی راپەرین، سلێمانی ١٩٨٠. ٣١ لاپەرە.
- کوێخا سێوێ، رۆمان، چاپی یەکەم، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر ١٩٨٦. چاپی دووەم، چاپخانەی، هەولێر ٢٠٠٧
- غەوارە/ رۆمان، چاپخانەی، ١٩٩١.
- حیزبی کەران/ چیرۆک، ١٩٩٠.
- کرمانج/ وتارە چیرۆک، ١٩٩٨.
- لێقەوماوان/ رۆمان، ٢٠٠٥.
- گورگ و بزن/ رۆمان بۆ مێردمنداڵان، بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری و لاوان، هەولێر ١٩٨٩.
- بۆرە/ رۆمانی منداڵان، ١٩٩١.
- تۆبەی گورگ مەرگە/ چیرۆکی منداڵان، ١٩٩٠.
- کۆڵنەدان/ چیرۆکی منداڵان، وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٣.
- خاک و چەوسانەوە، بەرگی یەکەم، ١٩٩٨.
- خاک و کێشەی مان، بەرگی دوووەم، ١٩٩٩.
- گورز گورزانێ، کۆچیرۆکی منداڵان، وەزارەتی رۆشنبیری/ بەڕێوەبەرایەتی کتێبی منداڵان، چاپخانەی منارە، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٨.

## ٢٣. فەرهاد پیرباڵ عومەر
## (د. فەرهاد پیرباڵ)



**لەدایکبووی:** ١٩٦١ هەولێر.
**دەستپێک:** ١٩٧٩.
**خوێندن:** دکتۆرا لە ئەدەبی کوردی زانکۆی سۆربۆن.

**چاپکراوەکانی:**
- ماڵئاوا ئەی وڵاتەکەم، شانۆنامە، بڵاوکراوەی یەکێتی نووسەرانی کوردستان، شاخ، ١٩٨٤.
- بەیانی باش ئەی غەریبی، شانۆنامە، بنکەی یەکگرتن لە کۆپنهاگن، ١٩٨٨.
- ئیگزیل (Exige) شیعر، بڵاوکراوەی ئەنستیتووی کورد لە پاریس، پاریس، ١٩٩٢.
- ژمارەکانی گۆڤاری کوردستان (ئەستەمبوڵ: ١٩١٩)، دەزگای گوڵان، ١٩٩٨.
- رۆژنامەگەریی کوردی بە زمانی فەرەنسی، چاپی یەکەم، سەنتەری برایەتی، هەولێر، ١٩٩٨. چاپی دووەم، دەزگای خەندان، سلێمانی، ٢٠٠٦.
- سەرچاوەکانی کوردناسی، بنکەی ئەدەبی و رووناکبیری گەلاوێژ، سلێمانی، ١٩٩٨.
- زێڕی ناو زبڵ، تۆژینەوە و تێکستی وەرگێردراوی کوردۆلۆژی، چاپکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپخانەی سەردەم، سلێمانی ١٩٩٩. ١٣٢ لاپەرە.
- ئینجیل لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا، دهۆک، ١٩٩٩

- وێنەی کورد لە ئەرشیفی کوردناسەکاندا، بنکەی وێران، هەولێر، ١٩٩٩.
- جوایەز، شیعر، بە هاوبەشی شاعیرانی دیکەی هەولێر، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، چاپی یەکەم، هەولێر ١٩٩٩.
- سپیاتییەکانی ناو رەش، شیعر، بنکەی وێران، هەولێر، ١٩٩٩.
- دراسات في تاريخ الكورد، ترجمة: ترزه جاف، رابطة كاوا، بيروت، ١٩٩٩.
- مەلا مەحموود بایەزیدی، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٠.
- رۆژنامەی کوردستان، ١٨٩٨، بەهاوبەشی، بنکەی گەلاوێژ، سلێمانی، ٢٠٠٠.
- پەتاتەخۆرەکان، کۆمەڵە چیرۆک، هەولێر، ٢٠٠٠. چاپی دووەم، بنکەی هاڤیبوون، بەرلین ٢٠٠٢، چاپی سێیەم هاموون، سلێمانی ٢٠٠٥.
- مێژووی شانۆ لە ئەدەبیاتی کوردیدا، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، ٢٠٠١.
- مولازم تەحسین و شتی تریش، نۆڤلێت، بنکەی گەلاوێژ، سلێمانی، ٢٠٠١.
- ژەنەراڵ شەریف پاشا، تۆژینەوەی مێژوویی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠١.
- چۆڵستان، وەرگێرانی کۆمەڵە چیرۆکی پەتاتەخۆرەکان بۆ رێنووسی لاتینی، کرمانجی ژووروو، دەزگای ئاڤێستا، ئەستەمبۆڵ، ٢٠٠١.
- جوایەز، شیعر، بە هاوبەشی شاعیرانی دیکەی هەولێر، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، چاپی یەکەم، هەولێر ١٩٩٩.
- عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری، تۆژینەوەی ئەدەبی، دەزگای سپیریز، دهۆک، ٢٠٠٢.
- مێژووی وەرگێران لە ئەدەبیاتی کوردیدا لە کۆنەوە تا ١٩٣٢، بلاوکراوەکانی گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی، هەولێر، ٢٠٠٢.
- حەشیشەکێشەکان، شانۆنامە، بلاوکراوەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٣.
- باوک، شانۆنامە، نووسینی ئۆگۆست ستریندبێرگ، و. لە فەرەنسییەوە، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، ٢٠٠٤.
- باخچەیەک شیعری فەرەنسی، لە فەرەنسییەوە، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- سانتیاگۆ دی کۆمپۆستێللا، رۆمان، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٢. چاپی دووەم، دەزگای رۆژهەلات، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- پیاوێکی شەپقەرەشی پاڵتۆرەشی پێلاو شین، رۆمان، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٣. چاپی دووەم، وەزارەتی رۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- چەند نامەیەکی فەرەنسی، سەنتەری رووناکبیری هەتاو، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٥.
- وێنەی کورد لە ئەرشیفی کوردناسە ئەوروپییەکاندا، وەزارەتی رۆشنبیری، ٢٠٠٥.
- مندالباز، رۆمان، بلاوکردنەوەی مالی شەرەفخانی بەتلیسی، هەولێر، ٢٠٠٣. (چاپی دووەم، چاپکراوەکانی پرۆژەی کتێبی یانەی قەڵەم، سلێمانی، ٢٠٠٦).
- رێبازە ئەدەبییەکان، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤. (چاپی دووەم، دەزگای وەرگێران، ٢٠٠٦).
- مێژووی شیعری نوێی کوردی ١٨٩٨ - ١٩٥٨، دەزگای هانا، هەولێر، ٢٠٠٦.
- رەئیس ردمەزانەکان، چیرۆک، دەزگای هانا، هەولێر، ٢٠٠٦.
- زمانی حەیزەران، لەبارەی کێشەی گەنج و قوتابیانەوە، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، ٢٠٠٦.
- بۆ رۆدانی کورم، شیعر، چاپخانەی پاک، هەولێر، ٢٠٠٦.
- پێنج کتێب و نیو، شیعر، بلاوکراوەکانی ناوەندی چاپەمەنی رۆژهەلات، سلێمانی، ٢٠٠٥. ٢١٢ لاپەرەیە.
- کورد لە دیدی رۆژهەلاتناسەکانەوە، تێکست و تۆژینەوە، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس،

٢٠٠٦.
- مێژووی هونەری شێوەکاری لە کوردستاندا، لە کۆنەوە تا ١٩٥٨، بڵاوکراوەکانی گۆڤاری شێوەکاری، دەزگای مێرگ، هەولێر، ٢٠٠٧.
- سوڵتانە عوسمانییەکان، تۆژینەوە و ئەلبووم، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، ٢٠٠٧.
- کرۆنۆلۆژیای کوردستان، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان، هەولێر، ٢٠٠٧.
- حەکایەتەکانی باوکم، رۆمان، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان، هەولێر، ٢٠٠٧.
- هەڵبژاردەیەک لە شیعرەکانی ژاک پریڤێر، وەرگێڕان لە فەرەنسییەوە، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٧.
- چەند وتارێک لەبارەی مێژووی رۆژنامەگەری کوردی، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، ٢٠٠٧.
- پۆل ئێلوار، زەمین وەک پرتەقاڵێک شینە، وەرگێران لە فەرەنسییەوە، شیعر، چاپکراوەکانی پرۆژەی کتێبی یانەی قەڵەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئەلەند، سلێمانی، ٢٠٠٨.
- وێستگەکانی تازەبوونەوەی شیعری تورکی، تۆژینەوە، سەنتەری بەهرە/ دەزگای نواڵەی نوێ، هەولێر ٢٠٠٨.
- پەناهەندەی ژمارە ێ٣، دیوانی شیعر، چاپخانەی پاک، ٢٠٠٨.
- ژان پۆل سارتەر، سۆزانییە بەرێزەکە، شانۆنامە، وەرگێڕان لە فەرەنسییەوە، ٢٠٠٨.
- گەنجە کوردەکان، تۆژینەوە، مەکتەبی بیر و هوشیاری، سلێمانی، ٢٠٠٨.
- مێژووی هونەری کاریکاتێر لە کوردستاندا، چاپکراوەکانی پرۆژەی کتێبی یانەی قەڵەم، سلێمانی، ٢٠٠٨.
- کرنۆلۆژیای هەولێر لە کۆنەوە تا ١٩٥٨، لەسەر ئەرکی پارێزگاری هەولێر چاپکراوە، چاپخانەی شەهاب، هەولێر ٢٠٠٨.

## ٢٤. سەدرەدین عومەر عەولا
## (سەدرەدین خۆشناو)



**لەدایکبووی:** ١٩٥٦ هەولێر
**دەستپێک:** ١٩٧٩
**خوێندن:** پەیمانگای ئامادەکردنی مامۆستایانی هەولێر
**چاپکراوەکانی:**
- فۆلکلۆر، بەشی یەکەم، ١٩٨٤. فۆلکلۆر، بەشی دووەم، ١٩٨٥. فۆلکلۆر، بەشی سێیەم، هاوبەش ١٩٩١.
- لاوک، ژمارە، ژمارە (١)، هاوبەش، هەولێر ١٩٩٢.
- ماسییەکی خۆراگر، چیرۆکی منداڵان، هەولێر ٢٠٠١.
- شاعیر و پێشمەرگەی شەهید حەوێز مام برایم هیرانی، ٢٠٠٣.

## ٢٥. محەمەد خدر مەولوود



**لەدایکبووی:** ١٩٥٩/ هەولێر
**دەستپێک:** سەرەتای هەشتاکان
**خوێندن:** دەرچووی بەشی زمانی کوردی، ئێستا قوتابی ماستەرە لە سیاسەتی دەولی/ ئۆکرانیا.

**چاپکراوەکانی:**

- خەرمانەی وشە، هاوبەش لەگەڵ دەستەیەک شاعیر و چیرۆکنووس، هەولێر ١٩٧٣.
- ئاسۆس، کۆمەڵە بەرهەمێکی ئەدەبی هاوبەش، بەرگی یەکەم، ١٩٨٣.
- ئاسۆس، کۆمەڵە بەرهەمێکی ئەدەبی هاوبەش، بەرگی دووەم، ١٩٨٤.
- دابڕان، چیرۆک، ١٩٨٦.
- بەرەو خوێندنەوەیەکی تازەی شیعرەکانی هەژار موکریانی، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، دهۆک، ١٩٩٦.
- بەدواداچوون و رەخنە لە کتێبی رۆژنامەگەری کوردی لە دوای راپەڕین، بلاوکراوەکانی بزاڤی رۆشنبیرانی نوێخواز، هەولێر ١٩٩٧.
- یادەکانی ئادار، چاپکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ١٩٩٨.
- چالاکییەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ١٩٩٧.
- چالاکییەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ١٩٩٨.
- بزاڤی رۆژنامەگەری حکومەتەکانی کوردستان، چاپکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ١٩٩٩. ١١٧ لاپەڕە.
- سەعدوڵلا پەرۆش، ئەزموون، بەخشش، بەردەوامبوون، هەولێر ٢٠٠٧.
- نەوزاد رەفعەت شاعیری ئەفراندنی شیعری نوێی کوردی، هەولێر ٢٠٠٨.
- شێڤچێنکە/ شاعیری گەورەی ئۆکرانیا،، لێکۆڵینەوە، بلاوکراوەکانی بزاڤی رۆشنبیرانی نوێخواز، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٨.
- پۆشکین/ شاعیری ئەفرێنەری رووس، بلاوکراوەکانی بزاڤی رۆشنبیرانی نوێخواز، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٨.

## ٢٦. موحسین ئەحمەد عومەر
## (د. موحسین)



**لەدایکبووی:** ١٩٦٢/ هەولێر.
**دەستپێک:** ١٩٨٢.
**خوێندن:** دەرچووی بەشی کوردی، کۆلیژی پەروەردە زانکۆی بەغداد، ١٩٨٦. خوێندنی زمان و خوێندنی بالا، سۆربۆن، ١٩٨٩ - ١٩٩٦.

**چاپکراوەکانی:**

- سەرزەمینی دوور، چیرۆک، پاریس، ١٩٩١.
- ستایش، شیعری ئەدۆنیس، وەرگێڕان لە عەرەبییەوە، ١٩٩١.
- ئەلبێر کامۆ، بێگانە، وەرگێڕان لە فەرەنسییەوە، زنجیرە کتێبی گوڵان، هەولێر ١٩٩٨.
- سێبەری با، چیرۆک و کورتە رۆمان، چاپخانەی ئۆفسێتی مەحوی/هەولێر، بلاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکری و ئەدەبی نما، چاپی یەکەم، ٢٠٠١، چاپی دووەم، بلاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی بەدرخان، سلێمانی، ٢٠٠٣.
- بەردی رەش و سپی، ٢٠٠٣.
- ئاناباز، ٢٠٠٤.
- دەستە پیسەکان، ٢٠٠٢.
- فەرهەنگی زاراوە ئەدەبییەکان، بەرگی یەکەم، ٢٠٠٤.
- فیلەکەی نادر شا، پاریس، ١٩٩٤.
- پرۆفیسۆر د. محەمەد موکری، بایەکانی کوردستان، وەرگێڕان لە فەرەنسییەوە، کتێبی گیرفان، دەزگای

چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٤.
- وشەکان، کتێبی گیرفان، وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی منارە، هەولێر ٢٠٠٦.
- تاریکی نیوەڕۆ،کۆمەڵە چیرۆک، چاپخانەی شڤان، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٦.
- عەرەب شەمۆ، رۆمانی شڤانێ کورد، وەرگێران و پێشەکی د. موحسین ئەحمەد عومەر، چاپکراوەکانی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٧.
- رەگ و ریشەکانی ناسیۆنالیزمی تورکی، ٢٠٠٨.
- پرتەقاڵی شین، کۆمەڵە وتار، بلاوکراوەکانی پاشکۆی رەخنەی چاودێر، سلێمانی ٢٠٠٨.
- ستایشی شتە روون و پەنهانەکان، پێشەکی و وەرگێرانی لە عەرەبییەوە، بلاوکراوەکانی رەخنەی چاودێر، سلێمانی ٢٠٠٩.

## ٢٧. فەیسەڵ حەسەن قادر (فەیسەڵ دێهاتی)



**لەدایکبووی:** ١٩٦٣ هەولێر.

**دەستپێک:** ١٩٨٤ بەلام لە ساڵی ١٩٨٢، بە وتارێک دەستی بە نووسین کردووە.

**خوێندن:** دەرچووی ئامادەیی.

**چاپکراوەکانی:**

- خوێندنەوەی کۆتاییەکان، کۆمەڵە چیرۆک، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر ١٩٩٩.
- کورد لە سیستمی نوێی جیهانیدا، کۆمەڵە وتار.
- میم، کۆمەڵە شیعر.
- آراء وملاحظات حول السياسة والصحافة.

## ٢٨. هیمداد حوسێن بەکر (د. هیمدادی حوسێن)



**لەدایکبووی:** ١٩٦٤ هەولێر.

**دەستپێک:** ١٩٨٣.

**خوێندن:** بڕوانامەی ماستەر بەناونیشانی: رۆڵی گۆڤاری هیوا لە پێشخستنی هونەرەکانی ئەدەبی کوردی، ١٩٩٥. دکتۆراکەشی لە ساڵی (٢٠٠١) بەناونیشانی رۆژنامەی کوردی سەردەمی کۆماری دیموکراتی کوردستان.

**چاپکراوەکانی:**

- کلک براوەکان، عەزیز نەسین، وەرگێران، بەغداد، ١٩٨٥.
- چەپکێ هۆنراوەی فۆلکلۆری دەشتی هەولێر، ١٩٨٦.
- رۆمانی حیزبی کەرامەت و حیزبی سەلامەت، عەزیز نەسین، وەرگێران، بەغداد، ١٩٨٨.
- دەرمانی بێخەوی، عەزیز نەسین، وەرگێران، بەغداد، ١٩٨٨.
- رۆمانی ماڵئاوا گوڵی خەم، بەغداد، ١٩٨٨.
- گوناهـ، کۆمەڵە چیرۆک، بەغداد، ١٩٨٨.
- ململانێی شارستانییەتەکان، سامۆئیل هانتنگتۆن، وەرگێران، هەولێر،١٩٩٨.
- رۆڵی گۆڤاری هیوا لە پێشخستنی هونەرەکانی ئەدەبی کوردیدا، چاپکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ١٩٩٨.

- چیرۆک و ئەفسانەی کوردی، ئوستراليا، ١٩٩٨.
- پەیامی کافکا، کۆمەڵە وتارێکی ئەدەبییە، وەرگێڕان، بنکەی ئەدەبی و رووناکبیری گەلاوێژ، سلێمانی، ٢٠٠٠.
- چیخۆف، پلاتۆنەڤە شێت، شانۆگەری، وەرگێڕان، بلاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، بەڕێوەبەرێتیی گشتی چاپ و بلاوکردنەوە، سلێمانی ٢٠٠١.
- رۆژنامەنووسیی کوردی سەردەمی کۆماری دیمۆکراتی کوردستان ١٩٤٢ -١٩٤٧، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٢.
- گۆڤاری گڕوگاڵی منداڵانی کورد و سەرەتای رۆژنامەنووسیی پەروەردەیی، زنجیرەی بلاوکراوەکانی گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی-٧-، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢.
- جیهانی سێیەم و گەڕان بە دوای رۆژنامەوانیی ئازاد دا، وەرگێڕان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم سلێمانی، ٢٠٠٣.
- بە شەرتی چەقۆ، عەزیز نەسین، وەرگێڕان، کتێبخانەی سۆران، هەولێر، ٢٠٠٦.
- رێبازە ئەدەبییەکان، دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٧.
- ئەدەبیاتی فۆلکلۆری کوردی دەق و لێکۆڵینەوە، سەنتەری هەتاو، هەولێر،٢٠٠٧.
- دەروازەیەک بۆ رەخنەی ئەدەبی کوردی، دەزگای موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٨.
- رۆژنامەوانی و ئەدەبیاتی نوێی کوردی، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٨.
- نهێنییەکانی دەوڵەتم قووتدا، عەزیز نەسین، وەرگێڕان، هەولێر، ٢٠٠٨.
- رۆژنامەوانیی کوردی سەردەمی کۆماری دیموکراتی کوردستان، دەزگای چاپ و بلاوکراوەکانی بەدرخان، چاپی یەکەم، چاپخانەی گرین گالۆری، لوبنان، بەیروت ٢٠٠٨.

## ٢٩. سەعدی عەلی محەمەدئەمین



**لەدایکبووی:** ١٩٥١ گوندی قورشاغلوو/ قوشتەپە.

**دەستپێک:** ١٩٦٧ بە شیعر دەستی پێکردووە، دوای هەشتاکان چیرۆک و شانۆگەری نووسیوە.

**.چاپکراوەکانی:**

- زامەکانم مەکولێنەوە، کۆمەڵە چیرۆک، بلاوکراوەکانی بزاڤی رۆشنبیرانی نوێخواز، هەولێر ٢٠٠١.
- شەوە ساردەکان، کۆمەڵە چیرۆک، چاپکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی روون، سلێمانی ٢٠٠٥.
- هەگبەی دڕاو، رۆمان، چاپکراوەکانی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی بەدرخان، هەولێر ٢٠٠٨.
- نووسینەکانی پتر بەلای نیشتمان و نەتەوەدا بایداوەتەوە و ئەمەش لەو روانگەی، تەرخانکردنی بەشێکی زۆری ژیانی گەنجایەتی بووە لە رێگای کوردایەتی، کە زیندانی ئەبوغرێبیش بەشێکی لەو ژیانەی لێ داگیرکردووە و ئەمەش لە بەرهەمە ئەدەبییەکانی رەنگدانەوەی هەیە، چیرۆکنووس بڕوای وایە (ئەدەب و خاک و نەتەوە لەیەک جیاناکرێنەوە، دەبا ئەدەب بە گشت ژانرەکانییەوە هەڵگری سیمای نەتەوە و ئەو کۆمەڵگا و سەردەمە بێت، کە تێیدا سەری هەڵداوە).

## ٣٠. میقداد ئیبراهیم محەمەد (میقداد شاسواری)



**لەدایکبووی:** ١٩٦١/بەردەڕەش.

**دەستپێک:** لە ساڵی ١٩٧٩ یەکەم چیرۆکی بە زمانی فارسی بڵاوکردۆتەوە، دواتر لە هەشتاکان کۆمەڵە چیرۆکی لە بڵاوکراوەکانی شاخ بەناوی خوازراو بڵاوکردۆتەوە، ئینجا لە ساڵی ١٩٩٧ یەکەم چیرۆکی بڵاودەبێتەوە.

**خوێندن:** دەرچووی شەشەمی ئامادەیی.

**چاپکراوەکانی:**

- کڵاوی بابردوو، کۆمەڵە چیرۆک، بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠١.
- تەنزستان، هەولێر.
- جەی. ئیس ساڵت، ژنە دڵخوازەکە، وەرگێڕان، بڵاوکراوەکانی دەزگای وەرگێڕان، هەولێر ٢٠٠٦.
- جەی. ئیس ساڵت، مێردە خۆشەویستەکان، وەرگێڕان، بڵاوکراوەکانی دەزگای وەرگێڕان، هەولێر ٢٠٠٦.
- زمان، هێز، ئازادی، کۆمەڵە نووسەر، وەرگێڕان، بڵاوکراوەکانی دەزگای وەرگێڕان، هەولێر ٢٠٠٧.

* جگە لە چیرۆک و وەرگێڕان، گۆشەی تەنزئامێز و بابەتی کۆمەڵایەتی دەنووسێت.

## ٣١. عوبێد مەجید ساڵح



**لەدایکبووی:** ١٩٥٦/ هەولێر

**دەستپێک:** ١٩٨٣

**خوێندن:** بکالۆریۆس لە یاسا

**چاپکراوەکانی:**

- جەنگیز ئیتماتۆف، شاخی سەگە بەڵەک، رۆمان، وەرگێڕان، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٧.
- پەڕینەوە لە تەم تومان، رۆمان، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٨.

لەگەڵ چەندین چیرۆک، کە لە هەشتاکان لە شاخ بە ناوی خوازراو بڵاوی کردۆتەوە.

## ٣٢. عەلی ساڵح کەریم/ میران



**لەدایکبووی:** ١٩٥٥/شەقڵاوە-هەولێر

**دەستپێک:** ١٩٨٤/ گۆڤاری کاروان

**خوێندن:** دەرچووی ئامادەیی پیشەسازیی هەولێر

**چاپکراوەکانی:**

- ئافرەت لە کۆمەڵگای ئیسلامدا، لێکۆڵینەوە، چاپخانەی شەفیق، بەغداد ١٩٨٤.
- ئافرەتە ناودارەکانی ئیسلام، مێژوویی، پرۆژەی تەفسیری قورئان، چاپخانەی رۆشنبیر، هەولێر ١٩٩٧.
- زەوی تینوو/ لە سەردەمی رژێمی بەعسدا لە بەغداد سانسۆرکراوە.
- سوێسکەکان بێ سەر دەفرن، کۆمەڵە چیرۆک، بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی نووسەرانی ئیسلامی کوردستان، چاپخانەی ژین، هەولێر ١٩٩٨.
- پەیامێک بۆ دەرەوەی دۆزەخ، کۆمەڵە چیرۆک، چاپخانەی شڤان، سلێمانی ٢٠٠٤.
- لەسەرخۆنووسین، هاوبەش، چاپخانەی ژین، هەولێر ٢٠٠٥.
- پەیوەندی نێوان ئایین و ئەدەب، پرۆژەی تیشک، سلێمانی ٢٠٠٩.
- کتێبەکانی زانستە تەکنیکییەکان، وێنەی ئەندازەیی بۆ هەر سێ قۆناغی ئامادەیی پیشەسازی، وەرگێران.

### ٣٣. کاروان عومەر کاکەسوور



**لەدایکبووی:** ١٥/٥/١٩٦٤ هەولێر.
**دەستپێک:** ١٩٨٥.
**خوێندن:** بەشی مێژوو لە کۆلیژی پەروەردەی زانکۆی موسڵ.

**چاپکراوەکانی:**

- ئەستێرە، ١٩٩٤، کۆمەڵە چیرۆک.
- ئەسپیدیلیۆن، کۆمەڵە چیرۆک، چاپی یەکەم، گۆڤاری رابوون، سوێد ١٩٩٨. چاپی دووەم، چاپخانەی شڤان"سلێمانی"، بڵاوکراوەکانی کتێبفرۆشی سۆران، هەولێر ٢٠٠٥.
- ئای لە ڤیلیا لە ڤیلیا، رۆمان، چاپکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٠. ٥٣٣ لاپەرە.
- منالیم ئاسکێک بوو بەسەر پەلکە زێرینەدا بازبازێنی دەکرد، بەشی یەکەم و دووەم، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر ٢٠٠١.
- منداڵیم ئاسکێک بوو بەسەر پەلکە زێرینەدا بازبازێنی دەکرد، بەشی یەکەم هەتا بەشی سێیەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، ٢٠٠٣.
- سەدەی یەکەمی خەیاڵ، کۆمەڵە چیرۆک، چاپەمەنی گەنج"سلێمانی"، بڵاوکراوەکانی کتێبفرۆشی سۆران، هەولێر ٢٠٠٤.
- هانس ئەندرسن، بولبول و پادشا، چیرۆکی منداڵان، وەرگێران لە دانیمارکییەوە.
- مامزێر، رۆمان، چاپکراوەکانی پرۆژەی کتێبی یانەی قەڵەم، چاپخانەی یاد، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٨.

* ئێستا لە ئەورووپا دەژی.

### ٣٤. سەعید حەسەن ئاکام



**لەدایکبووی:** /١٩١٧ بوکان.
**دەستپێک:** چلەکان

**خوێندن:**
**چاپکراوەکانی:**
- ئاگری بن کا،چیرۆک
- سیاحەتنامەی ئەولیای چەلەبی، وەرگێران

### ٣٥. فەرهاد محەمەد قادر



**لە دایکبووی:** ١٩٦٤ هەولێر
**دەستپێک:** ناوەڕستی هەشتاکان
**خوێندن:** کۆلێژی ئەندازیاری بەشی شارستانی
**چاپکراوەکانی:** نییە

### ٣٦. عەباس محەمەد حوسێن (حاجی مەمۆ/ کاکەباس)



**لەدایکبووی:** ١٩٤٩/ هەولێر
**دەستپێک:** ١٩٨٥

**خوێندن:** دەرچووی بەشی کوردی کۆلیژی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغداد/ ١٩٧٥

**چاپکراوەکانی:**
- ئەستێرە، کۆمەڵە چیرۆک بۆ منداڵان، چاپخانەی "الحوادث" هەولێر ١٩٧٩.
- گەمەی منداڵان، شانۆگەری منداڵان، لەسەر ئەرکی دەزگای "silS"بە چاپ گەیشتووە، ١٩٩٠.
- نەبەزی بچکۆڵە،چیرۆکی منداڵان، سوید ١٩٩١.
- قوتابخانەکەمان چی بەسەرهات، چیرۆکی منداڵان، سوێد ١٩٩٢.
- ڕەنگارە، چیرۆکی منداڵان، سوێد ١٩٩٢.
- بەرخۆڵە، چیرۆکی منداڵان، سوێد ١٩٩٣.
- جیهانی ئەسترید لیندگرین/شاژنی ئەدەبیاتی منداڵان لە جیهاندا، ئامادەکردن و نووسین، سوید ١٩٩٧، چاپخانەی ڕۆشنبیری، بەهاری ١٩٩٩.
- نێرییەکی قۆچ درێژ، هەولێر ٢٠٠١.
- وڵاتی کەروێشکان، کۆمەڵە چیرۆک، وەرگێران، هەولێر ٢٠٠٣.
- مرۆڤی گێل خواردەی گورگی لەڕە، چیرۆک بۆ منداڵان، بلاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی بەدرخان، چاپی یەکەم، چاپخانەی کاروان، هەولێر ٢٠٠٩.
- ئەسترید لیندگرین، پیپی گۆریە درێژ، وەرگێڕان، چیرۆک بۆ منداڵان، بلاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی بەدرخان، چاپی یەکەم، چاپخانەی کاروان، هەولێر ٢٠٠٩، ٢٣ لاپەڕە.

* ئێستا لە سوید دەژی.

## ٣٧. عەبدولڕەحمان کاکل عەبدوڵڵا



**لەدایکبووی:** ١٩٦٣ هەولێر.
**دەستپێک:** ١٩٨٧.
**خوێندن:** دەرچووی بەشی زمانی کوردی، کۆلیژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین.
**چاپکراوەکانی:**
هەرچەندە چاپکراوی نییە، بەڵام زیاتر لە (١٠٠) سەد کورتە چیرۆکی لە رۆژنامە و گۆڤارەکان بڵاوکردۆتەوە.
هەروەها لە بواری رۆژنامەگەری و راگەیاندن کاردەکات.

## ٣٨. عەبدولڕەحمان مەعروف رەسووڵ



**لەدایکبووی:** ١٩٦٧ هەولێر.
**دەستپێک:** یەکەم چیرۆک ١٩٨٨، یەکەم وتار و نووسینیش ١٩٨٤.
**خوێندن:** دەرچووی بەشی زمانی کوردی، کۆلیژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین.
**چاپکراوەکانی:**
- لە ساڵی ١٩٩٤ لە بەشی کۆلیژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین، گۆڤارێکیان بەناوی (ئاژێر) دەرکردووە، کە تەنیا دوو ژمارەی لێ دەرچووە.
- کۆمەڵە نووسەرێک، دوایین گرێکوێرە، کۆمەڵە چیرۆک، وەرگێڕان، بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان، چاپخانەی هەولێر ٢٠٠٥.
- ورال، تیری شکاو، وەرگێڕان لە فارسییەوە، بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، بەڕێوەبەرایەتی زنجیرە کتێبی منداڵان، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٨.
- لە کەناری هزر و زمان ز ئەدەبدا، وتار و لێکۆڵینەوە، ٢٠٠٩.

جگە لە چیرۆک لێرە و لەوێ کۆمەڵێک چیرۆکی منداڵان و بابەتی ئەدەبی و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و کاری وەرگێڕانی کردووە.
- ئێستا بەڕێوەبەری نووسینی هەفتەنامەی بەدرخانە.

## ٣٩. محیەدین تەها محەمەد
## (زنار تەها)



**لەدایکبووی:** ١٩٧٢/ هەولێر.
**دەستپێک:** ١٩٨٩
**خوێندن:** دەرچووی بەشی زمانی کوردی/ کۆلیژی ئاداب/ زانکۆی سەلاحەددین، هەروەها بکالۆریۆس لە کۆلیژی ماف/ زانکۆی سەلاحەددین.
**چاپکراوەکانی:**
- شوێن پۆستاڵەکان، رۆمان، هەولێر ١٩٩٦.
- ئینسکلۆپیدیای ئەلقاعیدە، دەزگای چاپ و توێژینەوەی موکریانی، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٧.

### ٦. قۆناغی دوای راپەڕین (١٩٩١-....)

### ٤٠. عەبدولخالق کەریم رەشید (عەبدولخالق بەرزنجی)



**لەدایکبووی:** ١٩٥٣ هەولێر

**دەستپێک:** دوای راپەڕین، بەڵام لە ساڵی ١٩٧٢ دەستی داوەتە نووسینی وتار و بابەتی ئەدەبی.

**خوێندن:** بکالۆریۆس، بەشی کوردی، زانکۆی بەغداد/١٩٧٦

**چاپکراوەکانی:** نییە.

### ٤١. ئازاد سەعید عەبدولوەهاب (ئازاد ئەرگوشی)



**لەدایکبووی:** ١٩٦٤/ ئەرگوش

**دەستپێک:** ١٩٩٢

**خوێندن:** دبلۆم لە ئابووری

**چاپکراوەکانی:**

- تەمبوور، چیرۆک، بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٧.
- جوانترین مردن، چیرۆک، بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٨.

### ٤٢. ئەسکەندەر جەلال سلێمان



**لەدایکبووی:** ١٩٧٦ هەولێر

**دەستپێک:** ١٩٩٤.

**خوێندن:** دەرچووی بەشی زمانی کوردی، کۆلیژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین/١٩٩٨.

**چاپکراوەکانی:**

- لەساڵی (١٩٩٤) لە بەشی کوردی کۆلیژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین لەگەڵ کۆمەڵێک خوێندکار، گۆڤارێکیان بەناوی (ئاژێر) دەرکردووە، تەنیا دوو ژمارەی لێ چاپ بووە.
- جگە لە چیرۆک و شیعر، لێکۆڵینەوەی ئەدەبیشی لە رۆژنامە و گۆڤارەکان بڵاوکردۆتەوە.

* ئێستا لە سوید دەژی.

### ٤٣. باهۆز عەبدوڵلا مستەفا



**لەدایکبووی:** ١٩٧٥ هەولێر.

**دەستپێک:** ١٩٩٤.

**خوێندن:** خوێندکاری کۆلیژی زمان، بەشی زمانی کوردی، زانکۆی سەلاحەددین.

**چاپکراوەکانی:**
- لەساڵی (١٩٩٤) لە بەشی کوردی کۆلیژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین لەگەڵ کۆمەڵێک خوێندکار، گۆڤارێکیان بەناوی (ئاژێر) دەرکردووە، تەنیا دوو ژمارەی لێ چاپ بووە.
- داستانی سەفەر، نۆڤلێت، بلاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکری و ئەدەبی نما، چاپی یەکەم، چاپخانەی رەنج، هەولێر ٢٠٠٥.
- ئێرە رۆمانە/ کتێبی گیرفان، بلاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٩.

## ٤٤. ماریە ئەحمەد ئیسماعیل



**لەدایکبووی:** ١٩٦٤/ هەولێر
**دەستپێک:** ٢٤/٤/١٩٩٦
**خوێندن:** پەیمانگای تەکنیکی هەولێر/ بەشی ژمێریاری

**چاپکراوەکانی:**
- سەفەری تەمەن و ئاوێنەی ناخ، چاپکراوەکانی دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر ٢٠٠١.

## ٤٥. سەباح مەجید محەمەد عەلی



**لەدایکبووی:** ٦/٩/١٩٧٣/کەندیناوە
**دەستپێک:** ١٩٩٥.
**خوێندن:** دەرچووی بەشی زمانی کوردی، کۆلیژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین.
**چاپکراوەکانی:**
- خەوتن لە ماڵی سەراب، نۆڤلێت، هەولێر، ٢٠٠٣.
- ئەوین و لیمۆکانی هەریاد، هەولێر، ٢٠٠٣.
- خەونە سەوزەکانی ترا، کۆمەڵە چیرۆک، هەولێر ٢٠٠٤.
- شانشینی تاڤگەکانی سۆز، رۆمان، وەزارەتی رۆشنبیری/دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، چاپخانەی دەزگای کارو رۆشنبیری، بەغداد ٢٠٠٥.
- نامەچیرۆک، کۆمەڵەچیرۆک، هاوبەش، هەولێر ٢٠٠٧

## ٤٦. سالار عەبدولڕەحمان محەمەد



**لەدایکبووی:** ١٩٧١ هەولێر.
**دەستپێک:** ١٩٩٦.
**خوێندن:** ئامادەیی.
**چاپکراوەکانی:** چەپکێک پەیڤ، لەودیو تخوبی هزر.

## ٤٧. کاروان عەلی قادر



**لەدایکبووی:** ٩/٩/١٩٧٥/ هەولێر.
**دەستپێک:** ١٩٩٧.
**خوێندن:** ماستەر لە بواری رۆژنامەنووسیدا

**چاپکراوەکانی:**
- ریپۆرتاژی رۆژنامەنووسی، چاپی یەکەم، چاپخانەی بەدرخان، سلێمانی ٢٠٠١
- ئازادیی لەرۆژنامەگەریی حزبیدا، چاپی یەکەم، بەڕێوەبەرایەتیی چاپ و بلاوکردنەوەی سلێمانی، ٢٠٠٢
- هونەری رۆژنامەنووسی، دامەزراوەی خەندان بۆ پەخش و وەشاندن، چاپخانەی بەدرخان، سلێمانی ٢٠٠٤
- بەر لەخۆرهەلاتن، نۆڤلێت، چاپخانەی یاد، سلێمانی ٢٠٠٦
- کلاشەکانی باوکم، کۆمەڵە چیرۆک، چاپخانەی یاد، سلێمانی ٢٠٠٦
- رۆژنامەگەریی تایبەتمەند، مەکتەبی ناوەندیی راگەیاندنی ی.ن.ک، چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی، کەرکوک ٢٠٠٧

## ٤٨. رەسووڵ عەزیز محەمەد
## (رەسووڵ بەختیار)



**لەدایکبووی:** ١٩٧٠/ هەولێر
**دەستپێک:** ١٩٩٨، بەڵام یەکەم نووسینی (وتار) لە ساڵی ١٩٨٩ بلاوکردۆتەوە
**خوێندن:** ناوەندی

**چاپکراوەکانی:**
- رۆژنامەنووسی و بواری رۆژنامەگەری، چاپکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ١٩٩٨.
- شتەکان، کۆمەڵە چیرۆک، بلاوکراوەکانی بزاڤی رۆشنبیرانی نوێخواز، هەولێر ١٩٩٨
- گوڵەکان مەقرتێن، چیرۆکی منداڵان، وەزارەتی رۆشنبیری/ بەڕێوەبەرایەتی زنجیرە کتێبی منداڵان، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٤.
- پێکەنینی شازادە، چیرۆکی منداڵان، وەرگێڕان، هەولێر
- راگەیاندنی نوێ، بلاوکراوەکانی بزاڤی رۆشنبیرانی نوێخواز، هەولێر چاپی یەکەم، ٢٠٠٥.
- ئێمە زۆر قسە دەکەین، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی بەدرخان، هەولێر ٢٠٠٦.
- دوو وانە، چاپخانەی نازە، چاپی یەکەم، بلاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، بەڕێوەبەرایەتی زنجیرە کتێبی منداڵان، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپی یەکەم،٢٠٠٨.

## ٤٩. حەیدەر جەوهەر ئەحمەد



**لەدایکبووی:** ١٩٧٤ هەولێر
**دەستپێک:** ١٩٩٨.
**خوێندن:** ماستەر لە ئەدەبی کوردی/ کۆلێژی زمان/ زمان، زانکۆی سەلاحەددین.
**چاپکراوەکانی:**
- کچێک لە نەورەس، ٢٠٠٤.
- نامەچیرۆک کۆمەڵەچیرۆک، هاوبەش، هەولێر ٢٠٠٧.

* جگە لە چیرۆک شیعریش دەنووسێت، هەروەها لێکۆڵینەوەی ئەدەبیشی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکان بڵاوکردۆتەوە.

## ٥٠. عەبدولسەتار پیرداود حەسەن
## (ستاری پیرداودی)



**لەدایکبووی:** ١٩٧٤ هەولێر.
**دەستپێک:** ١٩٩٨.
**خوێندن:** دەرچووی بەشی زمانی کوردی، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین.
**چاپکراوەکانی:**
- نامەچیرۆک، کۆمەڵەچیرۆک، هاوبەش، هەولێر ٢٠٠٧.
- کتێبێکی دەق و ڕەخنەشی لە بواری چیرۆک و ڕۆمان چاپکردووە.
- جگە لە چیرۆک لێکۆڵینەوە و ڕەخنەی ئەدەبی دەنووسێت.

## ٥١. سیروان تەها ئەحمەد



**لەدایکبووی:** ١٩٧٥ هەولێر
**دەستپێک:** ١٩٩٨
**خوێندن:** بەشی کوردی/ئاداب/سەلاحەددین
**چاپکراوەکانی:** نییە

## ٥٢. بورهان حەمەد قادر
## (بورهان جۆڵا)



**لەدایکبووی:** ١٩٦٠/ هەولێر
**دەستپێک:** ٢٠٠٠
**خوێندن:** دەرچووی ئامادەیی بەشی وێژەیی

**چاپکراوەکانی:**
- خێمە، دەزگای راگەیاندنی"ی. ن. ک"، چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی"کەرکوک"، ۲۰۰۷.
- ژوانە گورگ، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی وەزارەتی رۆشنبیری، سلێمانی ۲۰۰۹.

* سەرەتای هاتنە ناو بواری رۆشنبیری بە نواندن و کاری هونەری دەست پێکردووە.

### ٥٣. دلشاد رەزاق رەسول (دلشاد کاوانی)



**لەدایکبووی:** ۱۹۷۸/۷/۱/ قەزوینی ولاتی ئێران.
**دەستپێک:** ۲۰۰۰.
**خوێندن:**
**چاپکراوەکانی:** سێبەری مەرگ.

### ٥٤. فەرهاد عەزیز حەسەن



**لەدایکبووی:** ۱۹۸۳/ قەزوینی ولاتی ئێران.
**دەستپێک:** ۲۰۰۰.

**چاپکراوەکانی:**
- نهێنییەکانی ئایینی میتراقی.
- جگە لە چیرۆک کاری وەرگێران دەکات، لە زمانی فارسییەوە چەند کتێبێکی وەرگێڕاوە و ئامادەیە بۆ چاپ.

### ٥٥. قارەمان شوکری نادر



**لەدایکبووی:** ۱۹۷٤/ کۆیە
**دەستپێک:** ۲۰۰۰
**خوێندن:** دەرچووی ئامادەیی بەشی زانستی
**چاپکراوەکانی:** ئامیلکەی چەند پرۆژە و یەک ئامانج، ۲۰۰٦

### ٥٦. محیەدین رەزا جەمەلان



**لەدایکبووی:** ۱۹٦۹/ کۆیە
**دەستپێک:** ۲۰۰۰
**خوێندن:** دەرچووی ئامادەیی بازرگانی
**چاپکراوەکانی:** نییە.

### ٥٧. بەناز عەلی ئیسماعیل



**لەدایکبووی:** ١٩٧٨/٩/١/ هەولێر
**دەستپێک:** ٢٠٠٠
**خوێندن:** خوێندکاری کۆلێژی ئەکادیمیای هونەرە جوانەکان/ بەشی مۆسیقا.

**چاپکراوەکانی:**
- ئاستیاک، رۆمان، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٢.
- کەندالی نەزر، رۆمان، بلاوکراوەکانی دەزگای بەدرخان، چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر ٢٠٠٨.

***

**دووەم: شاعیران:**

شاعیران پشک و رووبەری هەرە فراوان لەم بیۆگرافیایە دەتەنن، ئەمەش تا رادەیەک لە زۆربەی شوێن و گاڤ و سەردەمێک، بەتایبەتی لەنێو میللەتی کورد بەدی دەکرێت ئەمە لەلایەک، لەلایەکی دیکەشەوە دەستەیەکی هەرە زۆریش لەوانە سەرەتای نووسین و دەست دانە قەلەمیان بە شیعر هاتوونەتە گۆرەپانەکە و بەهرە و توانا و رۆشنبیری خۆیان بردۆتە پێش، وەک ئەوەی شیعر هەروا بوار و بابەتێکی ئاسان بێت، کە لەراستیشدا وا نییە، ئەو ئەسپە خۆشبەز و رەوهان و هەندێ جاریش هێمن و لەسەرخۆیە، بۆ هەموو کەسێک نایەتە رایێ و دەستەمۆ نابێت. بۆیە سەرەنجام ئەگەر ئەویش دەستبەرداری نەبێت و واز لە شیعر نەهێنێت، ئەوا شیعر پشت لەو هەلدەکات. دەبێ لەگەل نالی چەند کەس ملی رێی شیعرییان گرتبێت و بە بالای درەختی شیعر هەلزنابن، سەردەمی بابا تاهیر و مەلای جزیری خانی و... هەروا بووە، بەلام کوا ناوە درەوشاوە و شیعرە نەمر و قەلەمە داهێنەرەکان؟؟ بۆیە هەر ئەو ناو و توانا شیعرییانە ماونەتەوە، کە بۆ شیعر خولقاون ئەوین و عەشقی شیعر لەسەری داون. بێگومان لێرەش هەر وایە، ئەو هەموو ناوە گشتی شاعیر نین، هەندێکیان ئەمرۆ پشتیان لە شیعر کردووە، کە زانیویانە دەرۆستی سەختی و ناسکی شیعر نایەن یان توانا و داهێنانی خۆیان لە بوار و ژانرێکی دیکە پێ سەرکەوتوو بووە، یان هەر هۆکار و مەسەلەیەکی دیکە.

وەکوو هەنگاوی یەکەم و دەستپێکی ناوەکانیش بەر لە هەر شتێک کۆمەلێک شاعیرمان هەن، تەواوی ئەو زانیارییانەمان وەگیرنەکەوت، کە ویستوومانە سەبارەت بە هەر شاعیرێک بینووسین، بۆیە ئەگەر هەر ناوێکی رووت یان نازناوی شاعیرێکمان نووسیبێت یاخود تەنیا سالی لەدایکبوون یان کۆچی دوایی کردنیمان بە دروستی دەست نەکەوتبێت، ئەوا هەر ئەوەندە زانیارییەمان لە سەرچاوەکانەوە دەست خستووە و تا ئەمرۆ هەر ئەوەندەی لەبارەوە دەزانرێت، پێم وایە ئەمەش شوێنی خۆی دەگرێت و رەنگە لە داوارۆژیش مێژووی ئەدەبی کوردی شتێکی زیاتر یان وردتر بخاتە سەر قۆناغ و سەردەم و ژیانە تایبەتییەکەی، کەوابوو دەکرێت لە رێگای ئەم کەرەستە خاوە و پێکهاتە و پارچەکانی خزمەتێکی چکۆلە پێشکەش بکەین، لەوێشەوە بتوانین پەنجە بخەینە سەر چەندین بوار و بابەتی دیکە.

بۆ لە بیرنەکردن و ناونەهێنانی هەر شاعیرێکیش ئەوپەری کۆشش و هەولم داوە کەس جێ نەهێلم، بەلام دەزانم بۆ ئەم بیۆگرافیایە کەسانێک دەستم پێیان رانەگەیشتووە و دەرفەت و ماوەش کۆسپێک بووە، کەوا ئەو خەونەم وەدی نەیەت، پرۆژەکەم بێ کەم و کوری بێت، وەلێ لەوە دلنیام ویژدانم ئاسوودەیە بەبێ دەستی ئەنقەست کارەکەم بەرێوەچووە، ئومێد دەکەم لە داهاتوو و لە هەر چاپێکی تازە بەسەر ئەو کەلێن و بۆشاییانەشدا زالبین، کە هاتۆتە پێشمان، ئەوە وێرای ئەو هەلانەی کە رەنگە لەو هەموو زانیارییە یەخەی پێگرتبین، نەمتوانیبێت لێی

دەربازبم.

دوا شتیش ئاماژەی پێ بکەین، ئەوەیە لە تەواوی بەشەکانی بیۆگرافیاکە بە شیعریشەوە، دوا وێستگە لە ساڵی "٢٠٠٠" وەستاوم، ئەمەش هیچ مەبەستێکی تێدا نییە، بەڵام کاتێک مرۆڤ کارێک دەکات لە هەمبەر پرۆژەیەک دەوەستێتەوە دەبێ سەرحەدێک بۆ خۆی دابنێت و سنووری خۆی بزانێت و بەرنامە و پلانێکی هەبێت، بەمەش کارەکانت ئاسانتر و بونیاتێکی مکومتر و هەنگاوی خێرا و بەگورتر و ئایندەش مسۆگەر دەکەن، لەوەشدا مەبەستم ئەوەیە دەبێ کەسەکە تا ئەو ساڵە شیعر و نووسینی لە رۆژنامە و گۆڤار و دەزگاکانی چاپ و پەخش بلاوبووبێتەوە. هەڵبەتە لە هەر هەنگاوێکی دیکە و رەخسانی دەرفەت و بەدەستەوەبوونی کاتی تەواویش، بیر لە بەرفراوانکردن و هاتنە پێشەوەی زیاتری پرۆژەکە دەکەمەوە، بۆیە لێرە دەکرێت بلێین هۆکارێکی دیکە کە رێگر بووە نەبوونی کاتی تەواوە.

**١. مستەفای قوتبی شام**/ سەدەی هەژدە و نۆزدە

**٢. حەسەن و ئامینە**/ نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەم

**٣. حاجی بەکراغای محەممەداغای حەوێزی (قاصد)**/ ١٢٠٠- ١٢٧٠ک

**٤. حاجی قادری کۆیی**



حاجی قادری مەلا ئەحمەدی مەلا ساڵحی مەلا ئەحمەدی گەورە (حاجی قادری کۆیی)/ ١٨١٧- ١٨٩٧ز.

- کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی، چاپخانەی دار السلام، بەغداد ١٩٢٥. ٥٩ لاپەرە.
- دیوانی حاجی قادری کۆیی، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، چاپی یەکەم ١٩٥٣. ١٢٨ لاپەرە.
- دیوانی حاجی قادری کۆیی، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، چاپی دووەم ١٩٦٩. ٨٠ لاپەرە.
- دیوانی حاجی قادری کۆیی، کەریم شارەزا بە هاوبەشی، چاپی یەکەم، هەولێر ١٩٨٦، چاپی دووەم، سنە ٢٠٠٧ کوردی.

**٥. حاجی عەبدوڵلای مەلا ئەسعەد جەلیزادە**/ ١٨٣٤- ١٩٠٨ز

- مەولودنامەی کوردی، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، چاپی یەکەم ١٩٦٥، چاپی دووەم ١٩٦٦. ٤٦ لاپەرە.

**٦. ئەمین ئاغای حاجی بەکرئاغای محەممەداغای حەوێزی (ئەختەر)**١٨٣٩/ -١٨٨٨ز

**٧. عەبدوڵلا کاک عەلی کاک عەبدوڵلا کاک مستەفا (سانی)**/ .....-١٩٠٦ز

**٨. مەلا رەسووڵ مەلا مەحموود بیتووشی (مەنفی)**/ .......-١٩٢١ز

**٩. رەشید ئاغای حاجی بەکر ئاغای حەوێزی (مجرم)**/ ١٨٤٢-١٩٠٨ز

**١٠. زێنەب شێخ عەبدولکەریم شێخ ئەحمەدی بەرزنجی (حەزینە)**/ ١٨٦٣-١٩١٨

**١١. مەلا محەممەدەمینی حاجی مەلا ئەحمەدی مەنتک (هەوایی)**/ ١٨٦٤-١٩٢٢ز

**١٢. مەلا مستەفای فەقێ ئەحمەد**/ ........-١٩٢٢ز

**١٣. شێخ محیەدین شێخ عەبدولکەریم شێخ ئەحمەد (نیهانی)**/ ١٨٦٥ز-١٩٣٤ز

**١٤. کاک مستەفای کاک عەبدوڵلای کاک عەلی کاک عەبدوڵلا (صافی هیرانی)/١٨٧٣ز -١٩٤٢ز**



- دیوانی صافی هیرانی، چاپی یەکەم بەغداد ١٩٥٣، ١١٢ لاپەڕە. چاپی دووەم هەولێر ١٩٦٥، ١٠٢ لاپەڕە. چاپی سێیەم هەولێر ١٩٧٣. ١٠٢ لاپەڕە.

**١٥. مەلا کەریمی مونتەزیری/ ١٨٧٥ز-.........**

**١٦. مەلا محەمەد حاجی عەبدوڵلای مەلا ئەسعەد جەلیزادە (مەلای گەورە) ١٨٧٦/٩/٦ز -١٩٤٣ز**



- دیوانی مەلا محەمەدی کۆیی،، چاپی یەکەم، چاپخانەی زاری کرمانجی، رەواندز ١٩٢٧. چاپی دووەم، مهاباد ١٩٤٣. چاپی سێیەم، چاپخانەی کوردستان، هەولێر ١٩٥٨. ٧٢ لاپەڕە. چاپی چوارەم، چاپخانەی کوردستان، هەولێر ١٩٦٩.
- تەفسیری کوردی لەسەر کەلامی خوداوەندی، ج/١، چاپخانەی "سلیمان الاعظمي"، بەغداد ١٩٦٨. ١٦٨ لاپەڕە.
- تەفسیری کوردی لەسەر کەلامی خوداوەندی، ج/٢، ج٣، چاپخانەی "سلیمان الاعظمي"، بەغداد ١٩٧٠. ٤٢١ لاپەڕە.
- فری فری قەل فری، چاپی یەکەم، چاپخانەی کوردستان، هەولێر ١٩٥٧. ١٣ لاپەڕە. چاپی دووەم، چاپخانەی کوردستان، هەولێر ١٩٦٧. ١٢ لاپەڕە.
- تەفسیری کوردی لەسەر کەلامی خوداوەندی گەورە، ٢٠٠٩. ئەم تەفسیرە بە شەونخوونی "١٠"ساڵ لە ١٩٣٣ بۆ ١٩٤٣/١/٥ لە "١٠"بەرگدا تەواوی قورئانی پیرۆز تەفسیر و راڤەکراوە.

**١٧. مەلا مستەفا کوڕی مەلا رەسووڵی کوڕی مەلا ئەبوبەکر (عاصی) ١٨٨٥/-١٩٧٥**



**بەرهەمەکانی:**

- دیوانی عاصی، ئامادەکردن و پێشەکی و فەرهەنگۆکی

عەزیز گەردی، بڵاوکراوەکانی نووسینگەی تەفسیر، هەولێر ۲۰۰۸.

- چرای دڵان، ۲۲ بابەتی جۆراوجۆرە.
- گوڵستانی سەعدی، وەرگێڕان لە فارسییەوە.
- سێ مەکتووبی کاک ئەحمەدی شێخ، وەرگێڕان لە فارسییەوە.
- تەرجەمەی مەولانا خالید (قدس الله سره)، ژیاننامەیەکی کورتی مەولانا بە فارسی و هەڵبژاردەیەکی شیعرە فارسییەکانی.
- چەند پارچە پەخشانێکی هونەری.

**۱۸. سەید ئەحمەد شێخ عەبدولکەریم شێخ ئەحمەد شێخ عەبدولکەریم شێخ حەسەنی گڵەزەردە (حوسێنی)/ ۱۸۸۷ز -۱۹۳۳ز**

**۱۹. حاجی میرزا عەبدوڵڵای کۆیی (خادم)/ ۱۸۹۵- ۱۹۷۱/۱/۵ز**

- دیوانی چاپکراوی شاعیر: میرزا عەبدوڵڵا کۆیی/دیوانی خادم، بەرگی یەکەم، چاپخانەی "دار الحریە"بەغداد ۱۹۸۰، بەرگی دووەم، چاپخانەی "دار الحریە"بەغداد ۱۹۸۱.

**۲۰. مەلا حەویزئەفەندی کوڕی قۆچاغای (مەحزون)/ .......-۱۸۳٤ز**

**۲۱. مەلا تاهیر مەلا مەعروف مەلا محەممەد قورشاغلویی (پاکی)۱۸۹٦/ -۱۹۸۱**

**۲۲. عەبدولقادر ئەحمەد محەممەد عەبدولقادر قرگەیی ۱۸۹۸ کەرکووک- ۱۹۷۵/۳/۹**

**۲۳. عەبدولجەبار مەلا عەبدولڕەحمان تەها عەبدوڵڵا دۆغرەمەچی (کانی)۱۸۹۷/ز -۱۹۵۷ز**



- دیوانی کانی، کۆکردنەوەی ئەکرەم کانی، چاپخانەی "الحوادث"بەغداد ۱۹۸۰. ۹۳ لاپەڕە.
- لەیل و مەجنون، چاپخانەی کوردستان، هەولێر ۱۹٦۹. ٦٥ لاپەڕە.

**۲٤. ناسیح عەبدوڵڵا سەبغەتوڵڵا (ناسیح حەیدەری)/ ۱۸۹۸ز -۱۹۸٦ز**

**۲٥. محەممەد شەریف مەلا ئیبراهیم مەلا عەبدولفەتاح (میهری)۱۹۰۳/ز -۱۹٤۲/۱۱/۱۷ز**



**۲٦. لوتفی شێخ ڕەزا شێتەی مارفی قولەیی/ ۱۹۰٥ز - ۱۹۸۹ز**

**۲۷. خدر ئەحمەد عەلی (مەلا خدری دەشتی)۱۹۰۹/ز - ۱۹٥۷ز**

**۲۸. سەلیم سەیدۆک عەبدوڵڵا/ ۱۹۱۰ز- ۱۹۷۰ز**



**٢٩. خەلیل رەسووڵ مستەفا (موخلیس) ١٩١٠/ز -١٩٨٥**
- مەولودنامەی کوردی، چاپخانەی کوردستان، هەولێر ١٩٦٨.



**٣٠. مەلا عەبدولرەحمان مەلا ئیبراهیم مەلا مەحموود (راجی)/ ١٩١٢-١٩٦٩**

**٣١. رەشیدی حاجی عەلی لبادکەر (١٩١٧ز -١٩٤٣ز)**

**٣٢. محەممەدی کوڕی حەمدە (مسکین)/ ١٩٢٠ز -١٩٤١ز**

**٣٣. کاملی کوڕی بەهجەت ئاغای حەوێزی/ ١٩٢٠ز- ١٩٤٥ز**

**٣٤. شێخ تاهیری سەرانەیی (زوهدی)/ ١٩٢٢ز - ١٩٨٨ز**

**٣٥. عوسمان حەسەن رەسوڵ/ ١٩٤٣-١٩٩٧**

## ٣٦. عبدولقادر ئەحمەد محەممەد (عەبدولقادر قرگەیی)



**لەدایکبووی:** ١٨٩٨- ١٩٧٥/٣/٩
**دەستپێک:** سیەکان
**خوێندن:** سەرەتایی لە قوتابخانە ئەهلیەکان و خوێندنی ئایینی

**چاپکراوەکانی:** نییە
- چەپکێک لە شیعرەکانی دیوانی نوری، چاپخانەی دار افاق عربیة، بەغداد ١٩٨٣. ٧٢ لاپەڕە.

## ٣٧. زەکی ئەحمەد هەناری



**لەدایکبووی:** ١٩٠٩/ کۆیە-١٩٦٧/٧/٩
**دەستپێک:** ١٩٣٠
**خوێندن:** خانەی مامۆستایانی سەرەتایی
**چاپکراوەکانی:**
- دواڕۆژەکانی دەناکی زۆردار، چاپخانەی مەعارف، بەغداد ١٩٦٠.
- گولستانی سەعدی، وەرگێڕان، چاپخانەی سلمان الاعظمي، بەغداد ١٩٦٨.
- لە پێناوی ئەویندا، شانۆگەری، بە یارمەتی بەڕێوەبەرێتی گشتی، چاپخانەی ڕاپەڕین، سلێمانی ١٩٧٤.
- جگە لە شیعر کۆمەڵێک چیرۆکیشی نووسیوە.

## ٣٨. محەممەد نافیع عەبدولفەتاح (رۆستەم حەوێزی)



**لەدایکبووی:** ١٩١٣/ کۆیە-١٩٩٩/٢/٢٧
**دەستپێک:** ناوەڕاستی ١٩٣٢
**خوێندن:** قۆناغی ناوەندی
**چاپکراوەکانی:** دیوانی رۆستەم حەویزی/٢٠٠١

### ٣٩. مەلا محەمەدی مەلا برایمی عەودالانی/ مەلا محەمەدی دلاوەر



**لەدایکبووی:** ١٩٠٩/کۆیە-١٩٧٠/١٢/١٣
**دەستپێک:** ١٩٣٢
**خوێندن:** خوێندنی ئایینی
**چاپکراوەکانی:** نییە.

### ٤٠. حوسێن بابەرەسووڵ (سامی عەودال)



**لەدایکبووی:** ١٩١٠/ کۆیە- ١٩٨٥
**دەستپێک:** سییەکان
**خوێندن:** خوێندنی حوجرە
**چاپکراوەکانی:** چەپکێک لە هۆنراوەکانی سامی عەودال، چاپی یەکەم، بەغداد ١٩٧٣، چاپی دووەم ١٩٨٦.

### ٤١. عوسمان حەبیب عەبدوڵڵا (عەونی)



**لەدایکبووی:** ١٩١٤/ کۆیە- ١٩٩٢/٧/٢٠
**دەستپێک:** ١٩٣٢
**خوێندن:** سەردتایی، خوێندنی حوجرە
**چاپکراوەکانی:** دیوانی عەونی، سەرجەم شیعرەکانی، چاپی یەکەم چاپخانەی پەروەردە، هەولێر ١٩٩٧، ٢٧٨ لاپەڕە.

### ٤٢. ئیبراهیم یوسف عەبدوڵڵا (ئیبراهیم هوشیار)



**لەدایکبووی:** ١٩١٦/ کۆیە- ١٩٩٤
**دەستپێک:** ١٩٣٤
**خوێندن:**
**چاپکراوەکانی:** نییە.

## ٤٣. یونس مەلا رەئووفی مەلا مەحموود ئەفەندی خادیمی سەجادە (دڵدار)



**لەدایکبووی:** ١٩١٨ز-١٩٤٨ز
**دەستپێک:** ١٩٣٥
**خوێندن:** کۆلیژی ماف/بەغداد/١٩٤٥

**چاپکراوەکانی:**
- دیوانی دڵدار، چاپخانەی کوردستان، چاپی یەکەم، هەولێر ١٩٦٠، چاپی دووەم، چاپخانەی کوردستان، هەولێر ١٩٧١.
- لەیلێ و مەجنون، وەرگێران، هەولێر ١٩٦٩.

## ٤٤. بورهان محەمەد عەبدولڕەحمان (بورهان جاهید)



**لەدایکبووی:** ١٩١٨ز -١٩٩١ز
**دەستپێک:** چلەکان
**خوێندن:**

**چاپکراوەکانی:**
- دیوانی جاهید، کەرکوک ١٩٥٧.
- چوارینەکانی جاهید، بەغداد ١٩٧٩.
- فەلسەفە و چوارینەکانی جاهید، بەشی سێیەم، هەولێر ١٩٨٥.

## ٤٥. حەبیب عەلی میرانی



**لەدایکبووی:** ١٩٠٠-١٩٨٤
**دەستپێک:** چلەکان
**خوێندن:** خوێندنی حوجرە

**چاپکراوەکانی:**
- بانگی جمهوری، بەغداد ١٩٥٨.
- شیرین و فەرهاد، وەرگێران، هەولێر ١٩٦٤.
- گوڵی ژاکاوی کوردستان، کەرکوک ١٩٦٩.
- نەورۆز و بەهار، بەغداد. ١٩٧٠
- قارەمانی کورد، بەغداد ١٩٧١.
- پرشنگی دڵداری، بەغداد ١٩٧٢.
- یادی شەهیدان و ئەدیبان، نەجەف ١٩٧٣.
- گۆمی خوێن، نەجەف ١٩٧٤.
- داخی دەروون، شیعر، هەولێر ١٩٧٨.

## ٤٦. عوسمان مستەفا
## (عوسمان خۆشناو)



**لەدایکبووی:** ١٩٢٦/ کۆیە
**دەستپێک:** ناوەڕاستی چلەکان
خویندن:

**چاپکراوەکانی:**
- بەستەی باوەڕ، شیعر، چاپخانەی لواء، بەغداد ١٩٥٨، ٢٦ لاپەڕە.
- ئاوازی ژیان، شیعر، چاپخانەی شیمال، کەرکووک ١٩٥٩، ٥٦ لاپەڕە.
- دیوانی مەرگ و لەدایکبوونەودیەکی نوێ، شیعر، چاپی یەکەم، ١٩٥٩، چاپی دووەم، چاپی یەکەمپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر ١٩٩٩.
- لەگەڵ رۆژگاردا/ بیرەوەرییەکانیعوسمان مستەفا خۆشناو"١٩٢٦-٢٠٠٦"، چاپی یەکەم، چاپەمەنی شەهاب، هەولێر ٢٠٠٧.
- کۆیە لە دەقی شارستانیەتدا، نووسین و لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون، هاوبەش، بلاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٩.

## ٤٧. فریشتە مستەفا محەمەد



**لەدایکبووی:** ١٩٢٦/ کۆیە.
**دەستپێک:** ١٩٤٣.
**خوێندن:** لەناوبردنی نەخوێندەواری ئێواران.

**چاپکراوەکانی:**
- چەپکێک لە هۆنراوەکانی فریشتە کۆیی، بلاوکراوەکانی هەفتەنامەی رێگای کوردستان، چاپخانەی کشتوکاڵ، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٥.

## ٤٨. عەبدوڵلا ئیسماعیل جەوهەری
## (غەمگین)



**لەدایکبووی:** ١٩٢٤/ هەولێر
**دەستپێک:**...........
خویندن: ئایینی و کەمەک قوتابخانە
**چاپکراوەکانی:** نییە

### ٤٩. سەید ئەنوەر سەید ئەحمەد شێخ عەبدولکەریم بەرزنجی



**لەدایکبووی:** ١٩١٩/ هەولێر -٢٠٠٦/١٢/٥
**دەستپێک:** ......
**خوێندن:** ناوەندی

**چاپکراوەکانی:**
- دیوانی شـێخ ئەنوەری بەرزنجی، ئامـادەکـردن و پێداچوونەوە: شێخ سەربەست بەرزنجی، بڵاوکراوەکانی دەزگـای چاپ و بڵاوکـردنەوەی بەدرخـان، چاپخـانەی رۆژهەڵات، هەولێر ٢٠٠٩.

### ٥٠. عەلی فەتاح حەوێزی سلێمان (عەلی فەتاح دزەیی)



**لەدایکبـووی:** ١٩٢٨/دووسـەرە/قـوشـتـەپە-١٩٩٢/١/٢٦
**دەستپێک:** ١٩٤٦
**خوێندن:** کۆلیژی ماف

**چاپکراوەکانی:**
- نەوبەهاری ئەحمەدی خانی و ئەحمەدی شێخ مارفی نۆدێ، هەولێر ١٩٨٥.
- ملوانکەی ئەلماس،موپاسان، وەرگێران، بەغداد ١٩٨٦.
- خرۆشان و رامان، شیعر، ١٩٨٧.
- وێڕای بڵاوکـردنەوەی کـۆمـەڵێک وتار و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی و وەرگێڕانیش لە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی

### ٥١. مەسعوود عەبدوڵڵا رەسووڵ (مەلا مەسعوود بێبەش)



**لەدایکبووی:** ١٩٣٢/هەولێر - ١٩٩٨
**دەستپێک:** ١٩٤٩
**خوێندن:** خوێندن و ئایینی و شەشەمی سەرەتایی

**چاپکراوەکانی:**
- تەجـویدی قـورئان، چاپخـانەی کـوردسـتـان، هەولێـر ١٩٥٦. ١٦ لاپەڕە.
- بەشـێک لە دیوانی بێ بەش، چاپخانەی اللواء، بەغداد ١٩٧١. ٦٤ لاپەڕە.
- هەندێ لە پێنج خـشـتـەکی یەکـانی بێ بەش، هەولێـر ١٩٨٤
- دیوانی بێ بەش، هەولێر ١٩٨٥
- دیوانی بی بەش، ١٩٨٨

## ٥٢. جەلال سەعید عەبدوڵلا
## (جەلال جۆبار)



**لەدایکبووی:** ١٩٢٩/ کۆیە
**دەسپێک:** ١٩٤٩
خوێندن : خوێندەواری گشتی
**چاپکراوەکانی:** نییە.

## ٥٣. ئەحمەد مستەفا محەمەد
## (دڵزار)



**لەدایکبووی:** ١٩٢٠/کۆیە.
**دەستپێک:** ١٩٥٠.
**چاپکراوەکانی:**
- ئاوازی ئاشتی و ئازادی، شیعر، چاپی یەکەم: چاپخانەی دار السلام، بەغداد ١٩٥٨، چاپی دووەم: مهاباد ١٩٨١.
- خەبات و ژیان، شیعر، چاپی یەکەم: چاپخانەی وەفاء ١٩٦٠ بەغداد، چاپی دووەم: مهاباد ١٩٨١. ٧٢ لاپەڕەیە.
- گەنجینە، بەشێک لە دوو بەیتییەکانی بابا تاهیری هەمەدانی، لە لوورییەوە بۆ سۆرانی، چاپی یەکەم: چاپخانەی وەفاء بەغداد ١٩٦٠، چاپی دووەم: هەولێر ١٩٩٢، چاپی سێیەم: هەولێر ٢٠٠٧.
- (فلادمیر ئیلیچ لینین) چامە بەناوبانگەکەی (مایکۆڤسکی) و. لە عەرەبییەوە، چاپخانەی الرواد، بەغداد ١٩٧٨.
- بیرەوەری ڕۆژانی ژیانم، بەشی یەکەم و دووەم لە بەرگێکدا، ستۆکهۆلم ١٩٩١.
- بیرەوەری ڕۆژانی ژیانم، بەشی سێیەم، ستۆکهۆلم ١٩٩٤.
- دیوانی دڵزار، چاپی یەکەم: ١٩٩٤ ستۆکهۆڵم، چاپی دووەم: هەولێر ٢٠٠٦.
- پاشکۆی بیرەوەرییەکانم، بەشی یەکەم، هەولێر ١٩٩٨.
- پاشکۆی بیرەوەرییەکانم، بەشی دووەم، سلێمانی ٢٠٠١.
- لمحات من تاريخ الحزب الشيوعي العراقي، ٢٠٠٢.
- نێرگزە جاڕی گەردوون، کۆمەڵە شیعرێکی بیانییە، وەرگێڕان، هەولێر ٢٠٠٩.

## ٥٤. مەجید ئەحمەد حەمەدەمین
## (مەجید ئاسنگەر)



**لەدایکبووی:** ١٩٣٢/ کۆیە
**دەستپێک:** سەرەتای پەنجاکان، وەک شیعر، لە چیرۆکیش سەرەتای شەستەکان
وێڕای بڵاوکردنەوەی چەند شانۆگەرییێک و چیرۆکێکی تەمسیلی
**خوێندن:** بکالۆریۆس لە زمانی ئینگلیزی

**چاپکراوەکانی:**
- کچی ماچە، پوشکین، لە ئینگلیزییەوە، ١٩٦٢.
- پەرلەمـــانی کـــوردســـتـــان لە مـــاوەی دوو ســـالّدا (ئامادەکردن-هـ.) هەولێر، ٢٠٠٤.
- خودموختاری هەرێمایەتی بۆ کەمینە نەتەوەییەکان لە چین، وەرگێران لە ئینگلیزییەوە، ٢٠٠٦.
- مێژووی کۆیە لە رەوتی شارستانییەتیدا، (هـ.) هەولێر، ٢٠٠٧.
- یاسـای زمـانە فـەرمـییـەکـان لە ولاّتانی فـرە زمـاندا، وەرگێران لە ئینگلیزییەوە، ٢٠٠٧.
- سیستمی فیدرالی لە چەند ولاّتێکی جیهاندا، وەرگێران لە ئینگلیزییەوە، ٢٠٠٨.
- کۆیە لە دەقی شارسـتـانیـەتدا، نووسین و لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون، هاوبەش، بلاوکـــراوەکـــانی وەزارەتی رۆشنبـیـری، چاپخـانەی وەزارەتی رۆشنبـیـری، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٩.
- جگە لە وەرگێڕانی کۆمەڵێک چیرۆک و تەمـسـیلی و شانۆگەری: لە ئینگلیزییەوە: (کلکە سەگ، وازهێنان، ئەستێرەکە، سێوەکە، ئەفسانەی مەیموون و باڵندەکان، پیاوە درۆ سازەکە،شانۆگەری رزگار و جیهان، ئۆنۆکابا ئۆجـۆ، ١٩٨٨، شـانـۆگـەری دیمۆن و پـیـشـــیـــەس، شانۆگەری شا ویلیامی یەکەم و کورەکانی.)

* لە عـەرەبیـیـەوە: (خەندەکە، رای براد بوری، بەرگە تازەکـەی پاشـا، هانز کـریسـتـان ئەندرسن، شـەوی چەقـۆ درێژەکان، هاینز میللەر، هاورێیەکم هەبوو، هاینـز میللەر، شـانۆگـەری بەیانیـیـەکی رووتـاک، جـووتە برا سـیـراتین و یوواکین کـنیـرۆی ئیـسـپـانی، گـەڕانەوە ناکـاوەکـە، مـرتن ئۆیۆسیو، ١٩٨٣، گەشتێ بە هەر سێ کاتەکاندا، گریگۆل ئاباشیدز، ١٩٧٩، پۆلیس، میر میرجیک، ١٩٨٢.)

* ویرای نووسـینی چەندین کـورتە چیرۆک و نۆڤلێت و شـانۆگـەری: (شـێت، ١٩٥٦، دز بوو، ١٩٥٨، رزگـاری، ١٩٥٨، زستـان هەر سارده، ١٩٦٠، بۆ پێشەوە، ١٩٦١، زارا، ١٩٦٢، جـــەوانمەردی، ١٩٧١، ئەوانەی نامـــرن، مردووە زیندوودکە، ١٩٨٠، چاوەڕوانی، ١٩٨٠، دڵداریی لە دێ، نۆڤلێت، لە پەنجـاکـان، وانیـیـە بەڵام، نۆڤلێت، ١٩٦١، شانۆگـەری ئەگەر بایە و ئەگەر باران، شـانۆگـەری لە جیهانی ئەمریدا، ٢٠٠١)

## ٥٥. عەبدوڵڵا محەمەد عەبدوڵڵا/ (بێ دڵ)

**لەدایکبـووی:** ١٩٢٦ز/کـەندێناوە-١٩٨٦/١/٢١ کۆچی دوایی کردووە.

**دستپێک:** پەنجاکان

**خوێندن:** ئیجازەی مەلایەتی/١٩٥٧

**چاپکراوەکـــانی:** دیوانی بێ دڵ، کـــۆکـــردنەوە و چاپکردنی: کـەمـال رێناس بێ دڵ، پێـشـەکی د. مـارف خەزنەدار، چاپخـانەی کریسـتـال، چاپی یەکـەم، هەولێـر ١٩٩٩.

## ٥٦. کەریم مستەفا محەمەد (کەریم شارەزا)



**لەدایکبووی:** /١٩٢٨ کۆیە.

**دەستپێک:** ١٩٥٢.

**خوێندن:** پەیمانگای مامۆستایان.

**چاپکراوەکانی:**
- ئـازادی و ژیـان، شـیـعـر، چـاپخـانەی وەفـاء، بەغـداد ١٩٦٠. ٥٢ لاپەڕە.
- کـۆیە و شـاعـیـرانی، لێکۆڵینەوە، چاپخـانەی نجـوم، بەغداد ١٩٦١. ٩٨ لاپەڕە.
- رێگەی دوور، شـیـعر، بە یارمەتی بەڕێوەبەرێتی گشتی، چاپخانەی نەعمان، نەجەف ١٩٧١. ٦٨ لاپەڕە.

- گفتوگۆیەکی ئەدەبی، هاوبەش، بەغداد ١٩٧٣. ٤٨ لاپەڕە.
- ئەسیری شاعیری شۆڕشگێری کورد، لێکۆڵینەوە و دەق، هاوبەش، چاپخانەی شارەوانی، هەولێر ١٩٧٤. ٩٦ لاپەڕە.
- پەندی پێشینان لە شیعری کوردیدا، لێکۆڵینەوە، کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد ١٩٧٦. ١٧٦ لاپەڕە.
- لە یادی گیوی موکریانیدا، ئامادەکردن، چاپخانەی کوردستان، هەولێر ١٩٧٨. ٧٢ لاپەڕە.
- مەقامەکانی سێوەی هونەرمەندی کورد لە تەرازووی رەسەنایەتیدا، لێکۆڵینەوە، چاپخانەی حسام، بەغداد ١٩٨٢. ٩٦لاپەڕە.
- پەندی بەراوردکاری لە نێوان ئینگلیزی و عەرەبی و کوردیدا، لێکۆڵینەوە و فەرهەنگ، چاپخانەی سەمیر ئەمیس، بەغداد ١٩٨٣. ١٤٨ لاپەڕە.
- نالی و زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی، لێکۆڵینەوە، چاپخانەی ئەدیب، بەغداد ١٩٨٤. ٧٦ لاپەڕە.
- دیوانی حاجی قادری کۆیی، بەهاوبەشی، چاپی یەکەم، هەولێر ١٩٨٦، چاپی دووەم، سنە ٢٠٠٧کوردی.
- ئەفسانە لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا، لێکۆڵینەوە، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٥.
- ناودارانی جیهان (١٩١٨-١٩٣٩)، سەنتەری کوردستان، هەولێر ٢٠٠٦.
- کۆیە لە دەقی شارستانیەتدا، نووسین و لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون، هاوبەش، بلاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٩.
- منداڵانی ئاگر، ئەفسانەیەکی ئەفریکاییە، وەرگێران، بلاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٨.
- بەشداری لە وەرگێڕانی چەند کتێبێکی قوتابخانەکان کردووە.

## ٥٧. مەدحەت خدر عەبدوڵڵا (مەدحەت بێخەو)



**لەدایکبووی:** ١٩٣٤/مەخموور.
**دەستپێک:** ١٩٥٣.
**خوێندن:** ناوەندی.
**چاپکراوەکانی:**

- زەنگی کاروان، چاپخانەی "لواء"بەغداد ١٩٥٩. ٤٨ لاپەڕە.
- رابەری ژیان، چاپخانەی شەفیق، بەغداد ١٩٦٨. ٨٠ لاپەڕە.
- ورشەی ئاوات "دار الجاحظ"، بەغداد ١٩٧٣. ٨٨ لاپەڕە.
- داربەڕوو، چاپخانەی "دار الحرية"بەغداد ١٩٨٣. ٩٤ لاپەڕە.
- رەگەکان ١٩٨٣.
- دیاری بۆ منداڵانی کوردستان (سروود)، زنجیرەی بلاوکراوەکانی گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر ٢٠٠٣.

## ٥٨. عەبدولرەزاق حەمەد ساڵح (عەبدولرەزاق بیمار)



